




# چەمكی مردن لەزمانی كوردیدا



هەرێم عوسمان

هەولێر - ٢٠١٣



* ناوی کتێب: چەمکی مردن لەزمانی کوردییدا.
* نووسەر: هەرێم عوسمان.
* بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود .
* نەخشەسازی: عیسام موحسین.
* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(٢٣١).
* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.
* تیراژ: ٥٠٠ دانە.
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٨٦٩)ی ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە.

## پێشەکی

مردن بابەتێکی ئاسان نییە بۆ لێکۆڵینەوە، لەبەرئەوەی لەسەر تەواوی ژیان ڕەنگدانەوەی هەیە. تۆ بڵێی کەسێك، کە دەمرێت گومانی لێنەکرێت، کە سزا دراوە یان گوناهێکی کردووە؟ یان مردن نەجاتدانەو بۆ خۆی خۆشنودبووە بەو مردنە؟ مردن قوتاربوونە لە ژیان یان بەرەو ژیان چوونە؟ ئایا مردنی ئەوانیدی ئاگادارکردنەوەیەك نییە؟ یان مردنی ئەوانیدی ئاسوودەییەکە، کە من نیم ئەمرم و مردن لەدەرەوەی منە؟ پێمانوایە مردن تەنیا نەمانە لە چاوی ئەوانیدییەوە واتە مردن دیارنەمان بێت لە چاوی ئەوان یان کۆتاییهاتنە بە هەموو شتێکی من؟ بەوەی چیتر من، من نیم، من نەماوم نەك لە چاوی ئەوان بەڵکو ئیدی نە لێرەم نەلەوێم(نە لەم دنیام نە لەو دنیا)؟ یان مردن بریتییە لە ئازادبوونی ڕۆح لەم دنیایەی، کە بەردەوام هەوڵی داگیرکردنی ڕۆحمان دەدات؟ ئایا مردن تاکە ڕووداوێکە، کە یەکجار ڕودەدات جیاواز لە ڕووداوو دیاردەکانی دی، کە دەشێ ڕۆژانە دووبارە ڕووبدەنەوە یان مردنیش ڕۆژانە ڕوودەدات؟ ئەی ئەوە نییە زوو زوو دەڵێین مردین؟

جیاوازی مردنی یەکجارەکی چییە لەگەڵ مردنی ڕۆژانەیی؟ جیاوازی ئەم مردنە ڕۆژانەییە چییە، کە ڕۆژانە هاواردەکەین "مردین" لەگەڵ ئەو مردنەی چیتر زەمانمان نییە بۆ گێڕانەوەو باسکردنی، بەڵکو دەشێ تەنیا ببینە هەواڵێك یان چیرۆکێك... ئایا ئەم مردنە، کە یەکجارە حەقیقەتی مردنیشی لەخۆیدا هەڵنەگتووە؟ هاوکات، کە دەڵێین مردن ئازاراوییە، ئایا بە ڕاستی مردن ئازاراوییە یان مردنە دەبێتە هۆی ئازارەکە؟ واتە ئایا ئێمە نەکەوتووینەتە هەڵەوە، کە مردن بە ئازاراوی دادەنێین، هەڵەکەش لەوەدایە، کە پەیوەندی نێوان بکەرو کردارمان تێکەڵکردووە، واتە ئەوە کەسەکەیە، کە ئازاری هەیەو ئازارەکەی بەرەو مردن پەلکێشی دەکات نەك ئەوەی، کە

کردارەکە(مردنەکە) خۆی لە خۆیدا ئازاراوی بێت؟ یان ئەوە پەیوەندییەکە لەنێوان بکەرو کرداردا دەبێتە هۆی دروستکردنی ئەو ئازارە، بە واتا مردنێك نییە پەیوەست بێ بە مرۆڤەوەو بێ ئازار بێت؟ یان مرۆڤی بێ ئیرادەو لاواز ئەم ئازارەی لە ترسدا دروستکردووە، واتە ئازارێکی پێش ئەزموونییە، چونکە مردن ئەزموون نەکراوە تا ئازارەکەی بزانرێت؟ گەر لە کاتێکدا ئازاراویش بێت، ئەی بۆچی هەندێ مرۆڤی بەهێز لە چەشنی عارفانو فەیلەسووفان... بێ ئازار وێنای مردن دەکەن؟

دەبێ جیاوازی بکەین لەنێوان مردن خۆی چییە، لەگەڵ مردن بۆ مرۆڤ چییە؟ مردن ئەو کردارەیە، کە بەپێی تیۆرەکەی چۆمسکی ئەرگومێنت داواکەرە، مردن حوکم دەکات، حوکمکراو نییە، تەنانەت لە خۆکوشتنیشدا، کە مرۆڤ دەیەوێ حوکم بکات، بەڵام لە جەوهەردا حوکم کراوە، ئەم مرۆڤە لە لایەن مردنەوە حوکم دەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا مردن بۆ ئەوەی بوونی خۆی بسەلمێنێت پێویستی بە مرۆڤە، واتە وەك چۆن بوونی مرۆڤ حوکم دەکرێت لەلایەن مردنەوە، ئەواش مردن بۆ سەلماندنی خۆی پێویستی بە مرۆڤە، وەك بڵێی مرۆڤ قوربانییەکی ناسێنەری مەرگ بێت، بۆ ئەوەی مەرگ بوونی خۆی بسەلمێنێت ئێمەی مرۆڤ دەبێ بمرین تا بوونی ئەو بسەلمێنین، مردن بە بێ بوونی ئێمە نا توانێ خۆی بسەلمێنێ، ئێمەش ئازاد نین لەوەی نەبینە هۆکاری ناساندنی ئەو، سەرەڕایی ئەمەش هێشتا مرۆڤ لە هەندێ باردا باوەڕ بە مردن ناکات، گومانی لێدەکات، نایناسێت، دیارە بۆ مرۆڤ ئاساییە، کە مردن نە ناسێت، واتە لەبەر ناساندنی یان سەلماندنی مردن نا چارە خۆی مەحرووم بێت لەو ناسینە، چونکە ئەو دەناسێنێت، بەڵام ناسینێکە هەمیشە کورت دەهێنێت، لەبەرئەوەی ماهییەتی مردن بەو چەشنەیە، کە مرۆڤ توانای ناسینی نەبێت! ئەمە نا لۆژیکی دەردەکەوێت، بەڵام چار نییە مردن پێویستی ئەم نالۆژیکییە دەسەپێنێت، کە ئێمە ببینە هۆکاری ناساندنی

مردن بە بێ ئەوەی خۆمان ئەو مردنە بناسین(ئێمە ناتوانین بە ڕەهایی مردن بناسین). لەبەرئەوە هاوکێشەکە بە بێ هیچ یەکێکیان دروست نییە، بە یەکەوە ڕستەکە تەواو دەکەن.

مردن خۆی هەمیشە پێیەکی لە نێو واقع و پێیەکی لەنێو نادیاردا بووە، بە واتایەکی دی پێیەکی لێرەو پێیەکەی دی لەنێو میتافیزیکدا بووە. مردن هەمیشە دیارێکی نادیار بووە، بەڵام مرۆڤ زۆرکات تەنیا بە دیوە دیارەکەی ئاشنایە. هەر لەبەر ئەمەیە، کە ئاین بەردەوام بە گرنگییەوە باسی مردن دەکات و هەوڵدەدات دیوە نادیارەکەی دیارخات! وەك چۆن لۆدڤیگ فیۆرباخ لە پێناسەیەکی بۆ ئاین دەڵێت " ئەگەر مردن نەبووایە، ئایینیش نەدەبوو". لەبەرئەوەی ئاین بە جۆرێ ئاسانەکەری مردنە، ڕەوێنەرەوەی ترسی مرۆڤە لە مەرگ، بەڵام وەك ڕاستییەکی تاڵ ئەم ترسە هەرگیز بە ڕوخساری مرۆڤەوە لا ناچێت، گەر تەماشایی ڕوخساری دەق و کارە هونەرییەکان بکەین ئەم ڕاستییەمان بە باشی بۆ ڕووندەبێتەوە. تەنانەت ئەو مرۆڤانەی، کە ئیمانیان بە ئایینەکان هەیە، ئەو ترسەیان هەر هەیە، چونکە وەك دەگوترێت "خۆشترین و ناخۆشترین زانین لە دنیادا ئەوەیە، کە کەس نەمر نییە، کەس لە سەر تەختی ژیاندا نامێنێ، دەزانم بابەتێکی نوێت پێ نالێم و تۆش ئەمە دەزانی، وەلێ ئەو غەمە قووڵەی بە ڕوخسارتەوە دەیبینم ئەم قسەیەی وەبیر هێنامەوە".

مرۆڤە ئیماندارەکان نەك ترس بەڵکو بە گومانن لەوەی مرۆڤ ڕێبوارێکە لەم دنیایە وەك پێغەمبەری ئیسلام دەڵێت "نموونەی دنیا وەك ئەو دارە وایە، کە بۆ ساتێ پشوی لێدەدەین"، بەڵام لە ڕاستیدا ئیمانداران بە دەگمەن بەم جۆرە بیردەکەنەوە، ئەوان ڕاستە هەوڵدەدەن بڕوا بکەن و بەردەوام کۆشش دەکەن بۆ ئەوەی بڕوا بکەن، بەڵام لە ناخەوە گومانێك هەیە، ئەم گومانە مرۆڤە ئیماندارەکان بەردەوام دەیانەوێ بیشارنەوە، بەڵام ناتوانن چونکە لە

شـوێنێکدا دەردەکـەوێت، ئـەوان گەرچـی بـەردەوام دەڵـێن ئێمـە لـە مـردن ناترسین، چونکە ئەم ژیانە ڕاگوزەرەو ڕۆح نەمرەو مرۆڤ ژیانێکی نەمری لـەو دنیا هەیە، بەڵام ڕۆژانە ڕستەو گوزارشتی بەمجۆرە دەردەبڕن "ڕۆح شـیرینە – ڕۆحم بە قوربانت بێـت...". ئـەم دەربڕاوانـەو دەیـان دەربـڕاویتر لەلایـەن مرۆڤە ئیماندارەکانەوە ڕۆژانە دەگوترێن، کە بەڵگەی بێ بڕواییـە بـۆ نـەمریی ڕۆح.

مرۆڤ بە خـووگرتنی لـەنێو ئـەم ژیانـەدا مردنـی بیرچـۆتەوە، وەك چـۆن هایدیگەر دەڵێت بوون لە بیرچۆتەوە، ئەواش مردن بیرچـۆتەوە، ئێمـە باسـی مردن ناکەین، بەوەی، کە لە مردن دەترسین بۆیە بـەردەوام باسـی دەکـەین، ئێمـە باسـی مـردن دەکـەین لەبەرئـەوەی حەقیقـەتی بـوونی خۆمـانی تیـا بەرجەستە دەبێ، من دەمرم، مردن ئەگەرێکی هەر ئەبێی منە، دەبێ من ئەم ئەگەرەم بناسم، لەبەرئـەوەی بـوونی مـن ڕووەو مەرگـە، ئـەم ئەگـەرەی مـن هایدیگەر وتەنی دەروازەی ڕەسەنێتی منە. باسی مەرگ ناکەین بۆ ئەوەی لە ژیان بێ دەربەست بین، باسی مردن دەکەین، بۆ ئـەوەی بـێ ئاگـا نـەبین لـە ژیـان، ڕاسـتە تەمـەنێك هاوڕێیـەتی ژیانمـان کـردووە ئاسـان نییـە گریمانـەی دەسـت بـەرداربوونی ناچـاری لـەم هاوڕێیەتییـە، بـەڵام گـەر ناچـاری ئـەم دەستبەرداربوونە بـین، دەبـێ دۆسـتانە ماڵئـاوایی لـە ژیـانو بـوونی خۆمـان بکەین، دەبێ ڕەسەنانە بەرەو شا ئەگەرەکەمان بچین. بەڵام پێموایە مەرجـە بۆ ئەوەی لە حەقیقەتی هاوڕێیەتی ژیان بگـەین دەبـێ مـردن بناسـین، ئێمـە گەر ڕاستگۆ نەبووین لەگەڵ خـۆ ئیـدی ڕاسـتگۆ نـابین بەرانبـەر بـە ژیـانیش، ڕاستگۆیی بەرانبەر بە خۆ ئەوەیە، کە مـردن بـە حەقیقـەتی خۆمـان بـزانین، ناکرێ مردن بە شتێك لە دەرەوەی خۆمان بزانین، وەك ئەوەی "مـردن کـەی دێ با بێ". چونکە تێگەیشتنمان لە مـردن تێگەیشـتنمانە لـە بـوون، مردنـی کـەس ئـاڵوگۆڕ نـاکرێ، وەك هایدیگـەر دەڵێـت: (ئـەو ساتەی دازایـن پەیـدا

دەبێت، بەتەمەن مردن بۆی گەورەیە... ئەو دەمەی لە مردن وەك بوونی خۆمان لێی تێدەگەین، ئیدی مردن ئاساندەبێت، ئیدی ڕستەی هێشتا لاو بوو، یان کاتی مردنی نەهاتبوو دەرنابڕین، چونکە ئێمە لە مردنی ئەو تێناگەین، ئەوە دیدی ئێمەیە بۆ مردنی ئەو لەبەرئەوە خودی مردن دۆڕان نییە بەڵکو لەئەزموونی ئەوانەی دەمێننەوە دەبێت بەدۆڕان. من کە دەمرم ئەزمۆونی ئازارەکەم دەرناکەوێت. ئەوان ناتوانن ئەزموونی مەرگی من بکەن)[1]

بۆ تێگەیشتنی باشتر خراپ نییە گەر لە چیرۆکێکی کۆنی گەلی ئیرانەوە دەستپێبکەین، لەو چیرۆکەدا هاتووە، کە (چوار پەپوولە ویستیان بزانن پێناسەی ڕاستەقینەی ئاگر چییە؟ پەپوولەی یەکەم کاتێك لەدوورەوە بەدەوری ئاگر دەسووڕێتەوە دێتەوە و دەڵێت، "ئاگر ڕووناکیە" دیارە ئەمە تەنیا دەرکەوتەیەکی دەرەکیو خەسڵەتێکی بچووکی ئاگرە، لەبەرئەوە بە حەقیقەتی ئاگر دانانرێت. پەپوولەی دووەم، زیاتر لە ئاگرەکە نزیك دەبێتەوەو هەست بە تینو گەرمای ئاگر دەکات بۆیە دەڵێت "ئاگر تینو گەرماییە"، دیارە ئەمەش ناساندنی خەسڵەتێکی ئاگرە نەك حەقیقەتی ئاگر. پەپوولەی سێیەم ،لە دوو پەپوولەکەی دی زیاتر نزیکی ئاگر دەبێتەوە بۆیە باڵەکانی هەڵدەکرووزێنو دەسووتێن، لەبەرئەوە حەقیقەتی ئاگر بۆ پەپوولەی سێیەم ئەوەیە کە "ئاگر سووتێنەرە" ئەمە ڕاستییە، کە خەسڵەتێکی بنەڕەتی ئاگر توانای سووتاندنو سووتێنەرییە، بەڵام ئەمە جەوهەری ئاگر نییە، واتە حەقیقەتی ئاگر هێشتا ئاشکرا نەبووە، بۆیە پەپوولەی چوارەم ئەم زانیاریەی پەپوولەی سێیەمیش بەکەم تەماشا دەکات، لەبەرئەوە بڕیار دەدات خۆی بڕوات بزانێت ئاگر چییە؟ چونکە پرسیاری چییە پرسیارە لە جەوهەرو ماهیەت، بۆیە ناکرێت ئەو زانیاریانەی دی لەسەر ئاگر بەحەقیقەتی ئاگر بزانین، پەپوولەی چوارەم هێند لەئاگر نزیك دەبێتەوە تا باڵەکانی

دەسووتێن، پاشان خۆی فڕێدەداتە نێو ئاگرەکەوە پاش ڕووناکییەکی گەورە، ئیدی ناگەڕێتەوە و ونـدەبێت)(٢) بەڵام تەنیا دەتوانین بڵێین پەپوولەی چوارەم لەحەقیقەتو جەوهەری مردن گەیشتووە، پەپوولەی چوارەم، کە چیدی ناگەڕێتەوە نایەتەوە بەراستی لەحەقیقەتی ئاگر تێگەیشت، هەروەك چۆن حەقیقەتی مردنیش پێمانوایە هەمان شتە، کاتێك بمانەوێت باسی حەقیقەتی مەرگ بکەین یان کەسێ نیازی بێت لەم پەرتووکە حەقیقەتی مەرگی چنگ دەکەوێت کەوتۆتە هەڵەوە، چونکە حەقیقەتی مەرگ تەنیا ئەوکات دەزانرێت، کە چیدی وەك پەبوولەی چوارەم توانای باسکردنیمان نییە، ئێمە بۆ ئەوەی لەحەقیقەتی مەرگ بگەین دەبێ بمرین.

کێشەی مردن وەك تاقیکردنەوە لەوەدایە، کە لە ڕۆمانی "بوراق"دا، هاتووە "تاقیکردنەوەیەکە، کە گەڕانەوەی تێدا نییە، ناتوانین تێدا ئیکمال ببین، نە کەسیشمان دەگەڕێتەوە تاکو ئەنجامەکەی ئاشکرا بکەین، لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەیەکی تاك لایی شەخسیە بێ گەڕانەوە، تۆ خۆت و خۆتی کەست لەگەڵدا نییە تاکو شاهیدی ئەم چوونەت بێت بۆ ئەودیو، کە نازانین چییە"[٢].

ئێمە ڕۆژانە، کە ماندوو شەکەت دەبین یان دەکەوینە دۆخێکی ئازاراویو بێزارکەرەوە هاوارو ناڵەی مردن دەکەین، یان جاڕی مردنی خۆمان لێدەدەینو دەڵێین "مردم" بەڵام هەموو ئەم مردنانە وەك تێگەیشتنەکانی پەپوولەکانی(١-٢-٣) وان بۆ تێگەیشتن لەئاگر، واتە چەند باسی مردن دەکەین هێشتا هاوارێك لەناوەوە پێماندەڵێت، کە ئەمە مردن نییە بەڵام خەسڵەتێکی مردنەو بەم هۆیەوە لەجیاتی کەمێك ترسمان لەمردن بڕەوێتەوە بەبڕوای من بەپێچەوانەوە ترسمان لەمردن زیاتر دەکات، واتە ئەو باسکردنی مردنە ڕۆژانەییە شتێك لەو ئازارو ترسەی، کە لە مردن هەمانە بەبێ ئەوەی خۆمان تامی مەرگمان کردبێت یان مردنمان ئەزموون کردبێ، کەمناکاتەوە،

کە بێگومان زیادیشی دەکات، وەك ئەفلاتوون دەڵێ ئێمە مەرگ ناناسین ئیدی بۆ لێی بترسین. بەڵام بەبڕوای من هۆکاری ترسمان لە مەرگ لەم نەناسینەدایە، ئەم نە ناسینە تەنیا لە مەرگ نییە، بەڵکو لە خودی خۆمانە، گەر خۆ بناسین، بێگومان مردن بە شا پێشهاتی خۆمانی دەزانین، واتە مردن لە پێشمانە، ئێمە ڕوومان لێیەتی‌و بەرەو ڕووی دەچین، ناتوانین ڕووی تێنەکەین، چەند خۆمان دوورە پەرێز بگرین، دواجار هەر ڕوومان لێیەتی، بێ ویستی خۆمان ڕوومان لێیەتی.

ئایا ئێمە باسی مردووەکان دەکەین بۆ ئەوەی بیر لەمردنی خۆمان نەکەینەوە یان بەپێچەوانەوە، ئێمەی مرۆڤ "مەرگی خودا، مەرگی نووسەر، مەرگی شار، مەرگی فەلسەفە..." ڕادەگەیەنین تا بڵێین دەسەڵاتمان هەیە بمرێنین، یان دەمانەوێت لەمردنی شتەکانیتریشدا ئاسوودەبین بەوەی، کە تەنیا ئێمە نین دەمرین، یان دەمانەوێت لەڕێگەی مردنی ئەوانەوە ئەزموونی مردنی خۆمان بکەین؟ هەروەك دەشمانەوێت مردن بکەینە ئەو چەمکەی دنیای پێ ڕاڤە بکەین، یاخود مردن لە میتافیزیکەوە بێنینەوە بۆ دنیای واقیع‌و لەم ڕێگەیەوە تەمومژی مردن بڕەوێنینەوەو بڵێین ئێمە لەمردن تێدەگەین؟ یان وەك فرۆید دەڵێت "مرۆڤ گەرچی زوو زوو باسی مەرگ دەکات، بەڵام لەناخی خۆیدا باوەڕی پێناکات"[٢] واتە مرۆڤ بەجۆرێك ئاوێزانی ژیان بووە، ئیدی مردن، کە لە ژیانکردنە ئاسان نییە باوەڕکردنی، بەواتایەکی تر خووگرتن بە ژیانەوە، مردنی لەبیربردووینەتەوە، دیارە ئەم خووگرتنەش هێندەی مەترسیە بۆ سەر ژیانمان هێندە مەترسی نییە بۆ لەیادکردنی مەرگمان، یان ئەم دەربڕاوانە بۆ ئەو مرۆڤانەیە، کە نارەسەنانە* دەژین، واتە گەر ڕەسەنانە بژین ئەوا مردن بەدابڕاو لەخۆیان تەماشا ناکەین. ئەم مردنە دەبێت چی بێت، کە بەئاگایانە و بێ ئاگایانە بەردەوام لەناو بیرو لەسەر زمانمانە.

لەلایەکی دییەوە مردن دەشێت هەم بە ڕاسپێراوێکی ئەمین لێی بڕوانین، کە دێتو کارو ئەرکەکەی خۆی جێبەجێدەکاتو هیچ لەبارەی ئەودیوەوە بە مرۆڤ نالێت، واتە نهێنی پارێزە، بەڵام ئەمە بۆ مرۆڤەکان جێگەی دوودڵییە. هاوکات دەشێت وەك دەسەڵاتدارێکی مەعریفی لێی بڕوانین ئەو بە زانینەکەی ئێمە کۆیلە کردووە، واتە زانین لێرەدا هەم پۆزەتیڤە هەم نێگەتیڤ، پۆزەتیڤە سەبارەت بە خۆی نێگەتیڤە سەبارەت بە مرۆڤ. واتە ئەو زانینەی پاش مردن چی؟ مرۆڤ هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە مردن بێنێتە گۆو بێژێ لە پاش مردن چی بەسەر مرۆڤدا دێت؟ بەڵام ڕەنگە پاشا فەرمانی کردبێت ئەو تەنیا ئەرکی خۆی جێبەجێبکات بە بێدەنگی؟ دەشێت ئەو بێدەنگ خولقابێت، بێ هەست سازابێت لەبەرانبەر هەستی مرۆڤەکاندا؟ هەستی نەبزوێت؟ دەشبێت ئەوە مرۆڤبێت لە زمانی ئەو نەگات، لە ئەرکو هەستو بێدەنگی ئەو نەگات؟

ئەوەی ئەم باسە بخوێنێتەوە تێدەگات بەڕاستی مردن لە زمانی کوردیو بیرکردنەوەی کورددا ئامادەبوونێکی چڕو دیکتاتۆرانەی هەیە، هەروەك مردن خۆشی دیکتاتۆرێکی دادپەروەرە(٢)، چونکە دێتو خۆی دەسەپێنێت بێ ئەوەی مۆڵەتمان لێ وەرگرێت (ئەمە دیکتاتۆرییە)، بەڵام دادپەروەرە لەبەرئەوە مردن بۆ هەموو مرۆڤێکەو جیاوازییەك ناکات لەنێوان مرۆڤەکاندا، هیچ مرۆڤێك نییە لەمردن هەڵبێ. ئامادەبوونە دیکتاتۆرییەکەی مردن تەنیا لەزماندا بوونی نییە بەڵکو لەکرداریشماندا ئەم مردنە ئامادەیی دەبینرێت، گەر نیگایەکی ئەم شارە بکەیت، وەك چاودێرێك بزانیت تا چەند ژیان لای ئەم خەڵکە خۆشەویستە، ئەم خۆشەویستییە تا چەند لەئاکارو کردارەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، ئەوکات تووشی جۆرێك لەنائومێدی دەبیت، لەرووی مرۆییو ئایینیشەوە بەرپرسیارێتی ڕۆڵی خۆی نەگێڕاوە لەوەی، کە ئەم ژیانە ئەمانەتێکە دراوەتە مرۆڤ، ئێمە دەژین بە ئەمانەت واتە

ئەمانەتێکین یان ژیان ئەمانەتێکە لەدەست ئێمەدا یان ئێمە ئەمانەتێکین لەدەست ژیاندا، بەڵام ئێمە ئەمانەت پارێز نین، نەژیان دەپارێزین نە خۆمان، ئەم بڕیارە گەرچی گرانە بەڵام ڕاستییەکی تاڵە، تەنیا نیگای لێخوڕینی ئۆتۆمبێلو ژینگەو نەخۆشخانەکان بکەین ئەمەمان بەباشی بۆ دەردەکەوێت، تەنانەت دەتوانین بڵێین نەك بۆ کورد بەڵکو بەگشتی ئەم سەردەمە، وەك کاتیٚ جەنگ وایە، مردن بە نەزانراوی نایەت** .

لەبەرئەوەی لە بابەتی باسەکەم دەرنەچم دەبێژم، گرفتەکانی ئەم باسە گەلێکن، بەڵام سەرەکیترینیان نەزانینی زمان، کە بووە هۆی دەستڕانەگەیشتنم بەو سەرچاوە زۆرەی لەم بارەیەوە بەزمانەکانی تر هەن، چونکە کتێبخانەی کوردی گەلیٚ هەژاربوو بۆ بابەتی باسێکی لەم چەشنە. نەبوونی فەرهەنگێکی کوردی/کوردی زانستی. سەرەڕای ئەم گرفتانەش باسەکەم بەم چەشنە دابەشکردووە. لە چوار بەش پێکهاتووە بەشی یەکەم، لەچوار پاردا جیاکراوەتەوە، پارەکان بەمجۆرە دابەشبوون، مردن لەئەفسانە، ئایین، فەلسەفە، زانست. بەشی دووەم، لەشەش پار پێکهاتووە، بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر واتایە، واتە ئەم بەشە تایبەتە بە واتاو جۆرەکانیو یەکەکانی واتا، واتای سیمانتیکیو پراگماتیکی، تیۆرەکانی واتا، بەتایبەتیش تیۆری بەکارهێنانمان باسکردووە لەبەرئەوەی تاڕادەیەکی زۆر ئەم تیۆرە بۆ باسەکەی ئێمە گونجاو بوو. بەش سێیەم، کە گرنگترینو قەبەترین بەشە، چونکە پراکتیکە بەش(بەشە پراکتیکە)، زۆرینەی ئامارەکانمان هێناوەو واتامان داونەتیٚ، یان واتاکەیمان کەشفکردووەو نموونەمان بەپێی پێویست هێناوەتەوە. جگەلەوەی ئەم بەشە کەشفکردنی واتاکانی مردنی لە ئەستۆ گرتووە تایبەتە بەخستنە ڕووی واتاکانی مردن لەزمانە جیاوازەکان، بەتایبەتیش لە زمانی کوردیدا، لەم بەشەدا مردن لەفەرهەنگە جیاوازەکاندا چۆن واتا کراوە، پاشان بەشێوەیەکی سەربەست

تـەنیا لـەپێناو لێکدانـەوەو کەشـفکردندا بەشـێوەیەکی گشـتی ئـەو وشـە، دەربڕاو، ئیدیەم، میتافۆر، پەند، وتوێژانەم هێناوەو واتاکانیم ڕاڤەکردووە.

بەواتایەکی تر بەشێوەیەکی ئازاد بـێ ڕەچاوکردنی جیاکـاری زۆرینـەی ئەو دەربڕاوانەی، کە (مردن/مەرگ)ی تیا بەکارهاتوون یان هەر فۆرمێکی تـر کە ئاماژەبێت بۆ مردن، لێکدانەوەی بۆ کراوە. ڕەچاوی واتـای سیمانتیکیو پراگماتیکی ئەو دەربڕاوانـەمان کـردووە. ڕەچـاوی ئـەوەمانکردووە کـە ئێمـە لـەناو زمانـدا بیردەکەینــەوە، دنیـابینی مرۆڤـی کـوردیش لـەو دەربڕاوانـەدا دەردەکەوێت.

ڕاڤـەکردنی مـردن بـە چەشـنێك ڕاڤـەی ژیانـە، چـونکە ژیـانو مـردن دوانەیـەکی لێکدانـەبڕاون. کاتێـك کەسـێك دەمرێـت ئیـدی شـتەکانی تایبـەت بەخۆی نامێنێت، ئەوەی پێشتر هەیبوو، تایبەت بوو بەو ئێستا هی ئەو نییە، ژمارەی موبایلەکەی دەسڕێتەوە، ناوی لـە فەرمانگەکـە دەکوژێتـەوە، ئیـدی ئەو مرۆڤـەی هـەموو ڕۆژێـك لـە فـلان شوێن دەمـانبینی نابینینـەوە، مەگـەر لەخەودا نەبێت، یان بە وێنـەو وێنـاکردن... وەك ڕامیـار مـەحموود لـە دێـڕە شیعرێکیدا دەڵێت: ڕەنگە مردن تەنیا بەتاڵبوونەوە بێت لە شوێن.

جگەلەوەی مرۆڤی کورد بەهۆی گرنگیدانو پیرۆزکردنێکی زۆریـەوە بـۆ مردن، خۆشەویستی کەسی مردوو بەچەشنێك پاشماوەکانی کەسی مـردووش پیرۆز دەکاتو تابوی دەکات، پاراستنی شتە پاشماوەکانی کەسی مردوو لای زیندووەکان ئەرکێکی گرنگە، وەك چۆن وەسیەت پیرۆزە، کە پاشماوەیـەکی ئاراستەکراوە، تا زیندووەکان لەلایەن مردووەکانەوە ئاراستەبکرێن.

بەشی چوارەم، کە یەکێکە لەو بەشانەی هەوڵمداوە چەند چەمکێك ساز بکەم، تایبەت بێت بە چەند جۆرێکی مردنـی تایبەت(خۆکوشـتن). ئـارەزووی مەرگی بێ هۆکار، تەنیا لە پێناو مردن خۆیدا بمری... پاشان لەسـەر نـەمری نووسیومە بە تایبەت نەمری دەق.

بۆ ئەوەی زیاتر خۆم بە ڕاڤەی ئەو نموونە زۆرەی کۆمکردۆتەوە خەریکبکەم کەمتر لایەنی تیۆریم ڕەچاوکردووە، هۆکەشی زۆری دووبارە بوونەوەیەتی لەو سەرچاوانەی، کە پێش ئەم باسە کراون، بەڵام لەکوێدا پێویستی کردبێت ڕوونکردنەوەم داوە. سەرباری هەموو ئەوانەش دیارە هیچ کارێك بێ هەڵەو کەموکورتی نابێت، ئەم کارەی منیش بەهەمانشێوە، بەڵام ئەوەی گرنگە چاوپۆشی لە هەڵەکان نەکەین، بەڵکو هەڵەکان ببنە هۆکارێك بۆ وتوێژ بۆ بەرەو پێشبردنی کارەکان.

**پەراوێزی پێشەکییەکە:**

١. مارتن هایدیگەر، بوون و کات، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەزگای سەردەم–سلێمانی، ٢٠١٣. ل. ٣٣٩، ٣٣٢.

٢. بەیان سەلمان، ڕۆمانی (بوراق)، بە عەرەبی نووسراوە، لە ٢٠٠٨ دا بڵاوکراوەتەوە.

٣. عەبدوڵڵا ئۆجەلان، عەشقی کورد، چاپخانەی ڕەنج.

٤. سەردار عەزیز، پایزو مەرگ، ڕۆژنامەی ئاوێنە، ستوون بەناوی"ئێرەو ئەوێ"، ژ، ٠٦-١٢-٢٠١١،

*مەبەست لەمرۆڤی "ڕەسەن" ئەو مرۆڤانە دەگرێتەوە کە خۆیانو کۆیلە نییە، نە لە کرداردا، نەلە بیرکردنەوەدا، مرۆڤی ناڕەسەنیش بەپێچەوانەوە نە شەیدای ئازادیە، نە بڕیار دەداتو لەبەرپرسیاریەتیش هەڵدێ، ئەم مرۆڤە ناڕەسەنە ئەوە دەکات کە ئەوان دەیکەن، ئەو کتێبانە دەخوێنێتەوە کە ئەوان دەیخوێننەوە، گوێ لەو مۆسیقایە دەگرێت کە ئەوان گوێی لێدەگرن... ئەم وشەیەشم بەو واتایە بەکارهێناوە کە د. محمەد کەمال بەکاریدەهێنێت، کەهەندێك لەبەرهەمەکانیم وەك سەرچاوە بەکارهێناوە خوێنەر دەتوانێت بۆی بگەڕێتەوە.

٥. ئازاد حەمە، فەلسەفەی فینۆمینۆلۆژی یان پاتۆچکە، چاپخانەی چوارچرا–سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی، ٢٠١٠. ل.١٢٦.

** ئەم دێڕەم لە زنجیرە درامایەکی هندی وەرگرتووە، کە یەکێك لە کارەکتەرەکان دەریبڕی.

## بەشی یەکەم

لـــەم بەشـــەدا هەوڵـــدەدەین چـــەمکی مـــردن لەلایـــەنی مێـــژوویی و بەشێوەیەکی فرە ڕەهەندو فرە لایەن بخەینـەڕوو. واتـە مـرۆڤ سـەرەتا چـۆن بـــیری لــە مـــردن کردۆتـــەوە، ئەمـــەش لەڕێگـــەی ئەفســـانەکانەوە، لـــەناو ئەفسانەشدا تـەنیا ئەفسـانەی نەتەوەیـەکمان وەرنـەگرتووە بـەڵکو ئەفسـانە بەگشـتی وەرگـیراوە. پاشـان ئـایین، لـەناو ئایینیشـدا تـەنیا یـەك ئاییمـان وەرنەگرتووە بەڵکو چەندین ئایینمان وەرگرتووە، تا بیرکردنەوە لەناو ئاییندا بخەینـە ڕوو، دواتـریش فەلسـەفە، ڕەچاوی ئـەوەمان کـردووە لەسـەرەتایی سـەرهەڵدانی فەلســەفەوە(ئەفلاتوون)ەوە هــەتا ســەردەمی پۆســتمۆدێرن (هایدیگەرو دێریدا) بیرکردنەوەی فەیلەسووفان بۆ مردن بەرچـاو بخـەین. لـە پاری چوارەم، کە کۆتا پارە لەم بەشەدا، مـردن لەزانسـتدا خراوەتـەروو، لـە زانستدا چۆن مردن ڕوودەدات، یان مردن لە زانستدا چییە.

**١/ مردن لە ئەفسانەدا:**

ئەفسانە چییە: پێناسەکردنی ئەفسانە کارێکی ئاسان نییە، لەبەرئەوەی لێکۆڵەران بەپێی کات* پێناسەی جیای بۆ دەکەن، هۆکاری ئەمەش بۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە، کـە سـەرەتاییترین بـوارە، کـە مـرۆڤ بیرکردنـەوەی خـۆی تـێ ئـاخنیوە. (ئەفسـانە بـۆ کۆمەڵگـەی سـەرەتایی بناغەیـەك بـووە بـۆ ژیـانی کولتـــووریو کۆمەڵایـــەتی[(١)] هاوکـــات فرەیـــی بابـــەتو بیرکردنـــەوەی تیـــا ڕەچاوکراوە. هەروەك لێکۆڵەرانی بواری ئەفسـانە دەبنـە سـێ دەسـتە، (کـە دەستەی یەکەم پێی وایە هەموو شتێك لەسەر ئەفسـانە دەزانێـت. دەسـتەی دووەم هەرچـەند پێناسـەی ئەفسـانە دەکـەن بـەڵام بـەدوا زانـینی دانـانێن. دەستەی سێیەم. بە گومانن لە زانینەکـەی خۆیـان، پێیانوایـە ئەفسـانە وەك "ژیانو مردن" نهێنی ئامێزنو کەس ناتوانێت دوا بۆچوونی خۆی لەبارەیەوە

بلێ) [٢]، بەپێی ئەم سێ دەستەیە ڕوانینی جیاواز بەرهەمدێت چونکە هەرسێ دەستەکە بەڵگەی خۆی هەیەو لەو گۆشەنیگایەوە دەڕوانێت، کە خۆی بنیادیناوە. هەروەك لیڤی شتراوس دەڵێت (پرسیاری ئەفسانە چییە، پێویست دەکات وەڵامی نەبێت)[٣]، لەبەرئەوەی کۆبوونەوەی ئەم وەڵامە سانا نییە، فراوانی ئەفسانە کارێکی کردووە ئەستەمبێت ناساندنی لەپێناسەیەکدا، کە پێناسەش سنووری خۆی هەیە، لەبەرئەوەی ئەفسانە جۆرە داهێنانێکی سەرەتایی مرۆڤبووە، لەم داهێنانەدا هەموو شتێ هەیە، فەلسەفەو زانستو ئاینو... بەلام وەك ناساندنێك دەڵێن "ئینسکلۆپیدیایەکی کۆن و دەوڵەمەندو پڕ نهێنی هەموو مرۆڤایەتییە، هەموو هۆزو نەتەوەو ئایینێکی کۆن و تازە هاوبەشن لەدروستکردن و دەوڵەمەندکردنیدا" مرۆڤی سەرەتایی هەموو شتێکی نهێنی، یان هەموو دیاردەیەکی نائاشکرا سەرنجی ڕاکێشاوەو بۆچوونو چیرۆکی لەبارەوە بۆ داتاشیووە، دیاردەی مردنیش یەکێك بووە لەو دیاردانەی لەئەفسانەدا زۆر بەقووڵی بوونی هەیە. (مرۆڤی سەرەتایی خەونو نەخۆشیو مردن بە سێ نهێنی دەزانی، کە بەردەوام ترسی بەرانبەریان هەبوو)[٥] ئەم ترسەشە بووەتە هۆی هۆنینەوەی گێڕانەوەکان. مرۆڤ، کە خۆی بێدەسەلات بینی لەبەرانبەر هەرشتێکدا ئیدی لێی دەترسێ یاخود ئاگایی و نەناسینی ئەو دیاردەیە زاڵبووە بەسەریدا، مرۆڤ ناتوانێ نەخۆش نەبێ، یان خەون نەبینێ یان نەمرێت، بۆیە جگە لە دەسەلات نەشکانەوە بەسەریاندا زانینێکی باشیشی نەبووە لەبارەیانەوە، هاوکات خەون و مردن وەك دوانەیەکی هاوواتایی، لەجێی یەك هاتوو بەکارهێنراون. لەزۆر شوێندا، وەك نووستنێکی هەتاهەتایی، خەوێکی خۆش... هەموو وەك مردن بەکارهێنراوە، نەخۆشیش وەك ڕوویەکی تری مردن، یان هاوسێی مردن بینراوە، چونکە هەر بەراستی نەخۆشی هۆکاری بنچینەیی مردنە. وەك بڵێی نەخۆشیی دانرابێت– هەبێ،

بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ مردن گران نەکەوێ لەسەر مردن، یان شتێ لەبارەی مردنەوە، کە نەخۆشی هەبوو مردن پاساوێکی هەیە، واتە نەخۆشی وەك پاساوێکی مردنیش وەهایە، بە واتا نەخۆشی پێش گریمانەو پێش زانینێکی مردنە.

لەبەرئەوە ئەو سیانەیە وەك خێزانێکن، وەك گریمانەیەك لەم سەرەتایەوە دەتوانم بڵێم بەشێك لە خەسڵەتەکانی مردن یان هەندێ ڕوانینی ئێمە بۆ مردن بەهۆی خەون و نەخۆشییەوە خراوەتە پاڵ مردن، ترس لەنەخۆشی و ئازاری نەخۆشی، نەمانی توانای بیرکردنەوەو جووڵە، دڵەڕاوکێ بۆ چاکبوونەوە، بێدەنگی، سستی...چەندین خەسڵەتی دی لەنێوان مردن و نەخۆشی و خەوندا هاوبەشن، کە لە بەشی سێیەمدا باسی ئەم خەسڵەتانەم کردووە. هاوکات ئەم حەزەی مرۆڤیش بۆ ئەوەی لەکاتی خەوتندا بمرێ، چەندین لێکدانەوە هەڵدەگرێ، کە مرۆڤ دەترسێ بەئاگاییانەوە ڕووبەڕووی مەرگ بێتەوە، بە واتایەکی قووڵی فەلسەفی بڵێین ئەمە خەسڵەتێکی نارەسەنانەیە، کە تەنانەت بۆ مردنیش مرۆڤ ناتوانێ بەتەنیا بێ، ناتوانێ بەهێزبێ، خۆیەتی خۆی ئەزموون بکات بەشێوەیەکی ئاگاییانە. ئەم مرۆڤە نایەوێت بۆ ساتێ ڕووبەڕووی خۆی بێتەوە، چونکە مردن بەشێکە لە بوونی خۆی. مرۆڤ تا ئەمرێ لەخۆی هەڵدێ. بە واتا مرۆڤ، کە دەیەوێ بە بێ ئاگا بمرێ (لە کاتی خەودا) چونکە وای بۆ دەچین، ئەو ترسەی مرۆڤ هەیەتی لە مردن ئاگاییە، بەڵام بێ ئاگایی ڕووبەڕووبوونەوەی مردن، واتە نەبینینی ڕووداوێکی ناخۆش، ئەم کەسە دەترسێ بە ئاگاییەوە مردنی خۆی ئەزموون بکات، ترس لە مردن ترسە لە بە ئاگایی مردن.

ترس بنچینەیەکی قووڵی هەیە، چون مرۆڤ ڕووبەڕووی نهێنییەکان دەبێتەوە، لەلایەکی دییەوە نەناسین هۆکارە بۆ ئەم ترسەو بەهۆی ئەم ترسەوە چەندین نهێنی دی سازدەبێت، کە هەموویان هۆکاری درێژکردنەوە

ترسەکەمانن. هەروەك لۆكريش دەڵێت "ترس يەكەمين دايكى خواوەندەكانە"[٦] بەواتا بوونى خواوەندەكان ترس دروستيكردن، چونكە ئەم ترس‌و بێدەسەڵاتييە دەبوايە چارەبكرێت، ئيدى دەسەڵاتێك بنيادبنرێت هەرچەند وەهمى بێ يان ڕاستەقينە گرنگ نييە، بەڵكو گرنگ ئەوەيە ئەو بێدەسەڵاتى‌و ترسەى مرۆڤ بۆ دياردە نەناسراوەكان بسازێنێت، واتە مرۆڤ لە نەزانين و بێدەسەڵاتى بەرانبەر ئەو دياردانە، هەوڵيدا نهێنى دى بسازێنێت تا ئەو نهێنيانەى پێ ئاشكرابكات، خوا كە نهێنييە هەوڵدرا نهێنى مردن، خەون، نەخۆشى پێ داپۆشرێت. هاوكات بۆ ڕەواندنەوەى ترس‌و گومان‌و نەزانين خواوەندەكان سازێنران، لەبەرئەوەى ئەم خواوەندانە دەستكردى مرۆڤ خۆى بوون، بۆيە هێند مەترسى گەورە نەبوون هێندەى مردن، بەڵكو هەوڵدرا ئەو مەترسيانە لەڕێگەى خواوەندەكانەوە ئەهوەن‌و ئارام بكاتەوە، ترسى مرۆڤەكان لە نەزانين‌و بێدەسەڵاتى خواوەندەكانى پێ دروستكردن، ياخود بەجۆرێ خواوەندەكان خۆيان سەپاند، چونكە خواوەندەكان دەستكردى مرۆڤبوون ئەوا ناسراوتربوون لە مردن‌و نەخۆشى نە ناسراوەكان، هەروەك دايڤيد هيوم دەڵێت "ئەو بنەمايەى، كە ئەفسانەى لەسەر پەيدابوو ترسە"[٧]. وەك چۆن هەنووكە بۆ شاردنەوەى ڕاستييەك چيرۆك دەهۆنينەوە، منداڵێك چيرۆك سازدەكات بۆ باوكى تا لێى نەدات، واتە ترس بە چەشنێك درۆمان پێدەكات، چيرۆكمان پێدەهۆنێتەوە.

مرۆڤى سەرەتايى بەهۆى بوونى ئەو هەموو ترس‌و نهێنييەوە ناچاربوو (بڕوا بە بوونى چەند هێزێكى زاڵ‌و بەديهێنەر بهێنێت، كە خاوەنى هێزێكى زياتر لە مرۆڤى ئاسايى)[٨] لێرەوە دروستكردنى خواوەندەكان هاتنە ئاراوە، خواوەندگەلێكى زۆريان دروستكرد، كە هەندێك سەرچاوە دەڵێن "خواوەندەكان لە مرۆڤەكان زياتربوون"[٩] كە بێگومان خواوەندى "مردن" يشى تێدابووە، تەنانەت مرۆڤى كۆنيش بيركردنەوەى لۆژيكى هەبووە لەم

بارەیەوە(لۆژیکی نا لۆژیك بووە)، هەرچەند دەگوترێت بیرکردنەوە کلاسیکی بووە، بەڵام بەبڕوای من مرۆڤی کۆن پێی قەبوڵ نەبووە تەنانەت شتێك هەبێ هەر لەخۆوە، ناکرێ مردن لەهیچ بووبێ، یان هۆکارێ بۆ بوونی نەبێت، بۆیە دەبێ خواوەندێك هەبێ وەك خاوەنی یان هۆکاری بوونی ئەم مردنە. فرۆید زۆر ورد شیکاری مردنی کردووە لە ئەفسانە کۆنەکاندا خوێنەر دەتوانێ لە کتێبی "تەوتەم و تابۆدا" بیخوێنێتەوە.

کاتێك خواوەند هەبووبێت ئەوا قوربانیشی بۆ کراوە، (راع کە یەکێك بووە لە خواوەندەکانی میسر، کە مرۆڤەکانی فێرکرد قوربانی بۆ بکەن، وە قوربانییەکەشی لە مرۆڤەوە گواستەوە بۆ گاو باڵندەکان)[10]. دیارە لەسەرەتاوە مرۆڤ خواوەندی دروستکرد، وەلێ دواتر بیری کردەوە، کە ئەی خۆی چۆن دروستبووە؟ (خواوەندەکان دروستیان کردووە، بۆ ئەوەی ئەرکی خواوەندەکان بگرێتە ئەستۆو ببێتە جێنشینی ئەوان)[11] لێرەوە مرۆڤی خواوەندی زۆر بوو، یان مرۆڤ گەلێك، کە بانگەشەی خۆ خواوەندیان دەکرد.

لەبەرئەوە باسی بوونی ئەو خواوەندانە دەکەین، کە یەکێکە لەهۆکارەکانی دروستبوونیان نهێنی بووە، مردنیش نهێنی بووە، هاوکات دروستکردنی خواوەندەکان هۆکار بووە بۆ گۆڕانی ئایدیای مرۆڤی کۆن بۆ مردن. بۆ نموونە دیاردەی مردن بەپێی ئەفسانەکان بەشێوازی جیا جیا پەسنکراوە، (سۆمەریەکان مردن وەك سزایەك وێنا دەکەن، کە لە فەرمانەکانی خواوەند(عەشتار) دەرچوون، هاوکات جیهانی ژێرەوە بە جیهانی مردووان دانراوە[12]. واتە خواوەندەکان وەك باوك وابوون سزای رۆڵەکانیان داوە، هاوکات ئەمە پێماندەڵێت پاساوی مردن بە بوونی خواوەندو سزاکەیەوەیە، واتە من کە دەمرم دەبێ هۆیەك هەبێ بۆ مردنم لێرەشدا سزا هۆو پاساوێکە، هاوکات لە نەبوونی بیرکردنەوەی دروستدا یان لەنەبوونی هۆی لۆژیکیدا لەلای سۆمەریەکان ئەم هۆیە دانراوە، گەر

سەرنجیش بدەین لە ئیستاشدا گوێڕایەڵنەبوونی منداڵ بۆ دایكو باوكی وتـنی ئەتكوژمی تێدایە، واتە گەر منداڵەكە گوێڕایەڵ نەبێ لەلایەن دایكو باوكییەوە دەكوژرێن. لەلایـەكی تـرەوە مـردووان شـوێنیان هـەبووە، ژێـرەوە بەرانبـەر بەسەرەوە، لە زمان و بیرماندا لـە زۆر بـاردا ژێـرەوە وەك كـەمتر لەسـەرەوە دانراوە، واتە شوێنی شایسـتە زیـاتر سـەرەوەیە تـا خـوارەوە. سۆمەرییەكان بەچەشنێ ڕوانیویانە، كە مردنـی لـەخۆوە یـان مـردن وەك مـن مـرۆڤم دەبـێ بمرم، نـەیانڕوانیوە، بـەڵكو وەك ئـەوەی، كـە مـردن سـزای هەڵەیەكـە دەبـێ بدرێ، واتـە بـاجی هەڵەیەكـە، ئەمـەش مـردن وەك هێزێـك بـەكارهێنراوە بـۆ ئەوەی گوێڕایەڵی پێ بهێنرێتە ئاراوە.

دیاردەیەك بەدیدەكرێت لە ئەفسانە كۆنەكاندا، كە كـەم شارسـتانییەت هەیـە، كۆششـی بـۆ نـەكردبێتو شكسـتی نـەهێنا بێـت، ئـەویش مەسـەلەی نەمریـە. دیـارە هـەر لـەم شارستانییەتەشـدا پاڵەوانـەكان گـەڕانی زۆریـان كردووە بەدوایی نەمریدا، هەندێكیان بەدەستیان هێناوە، لەڕێگـەی هێـزەوە، هەندێكیشیان لـە ڕێگـەی ئایینـەوە. (گـەلكامێش زۆر بەزەحمـەت بەدەسـتی هێنا وەلێ زۆر بەئاسانی لەدەستیدا بەلاَم ئۆدۆسیۆس نەمری ڕەت دەكاتەوە و ئاواتی گەڕانەوەیە بـۆ زێـدی خـۆی) [١٣]. بـەواتا "لـە ئەفسـانەكاندا مـردن ئەگەری دیكەی زیندوو بوونەوەی تێدایە"[١٤] هەروەك لە ئەفسـانەی لوقمـانی حەكیم"ئەو دەرمانەی لە مێشكە سەری شا ماری دروستكردبوو، مردووی پێ زیندوو دەبووەوە"[١٥]. بەلاَم ئەمە تەنیا جۆرێك بوو لە دڵخۆشكردن و هەوڵێك بوو، هەرچەند ئەمەش بۆ من گرنگە، كە هەوڵدرێت سنووی مەرگ ببەزێنرێت، واتە بەو ئومێدەوە بژیتو كۆشش بكـەیت، ئەمـە چـەند وەك خـەیاڵپلاو لێـی بڕوانرێت بەلاَم سەیری ئـیرادەی پشـت ئـەم گەڕانـەش دەكـەمو پـێم گرنگـە. دیارە بۆ بەدەستهێنانی نەمری بەردەوام كۆشش كراوە بۆی بەلاَم هەوڵـەكان سـەركەوتوو نـەبوون، سـەركەوتنەكەیان هەتاهـەتایی نـەبووە، وە هەنـدێجار

داواکارییــەکان یــان ئەلتەرناتیڤــەکانی بەرانبــەر بــە مــەرگ، واتــە بــۆ بەدەستهێنانی دەبێ بەرانبەری شتێ ببەخشیت، کە دواجـار ڕوویـەکی تـری مەرگ بووە، واتە مەحاڵییەك هەبووە بەرانبەر بە بەدەستهێنانی نـەمری، کـە لـەدەرەوەی توانـای مـرۆڤ بـوون، بـەڵام مـرۆڤیش تـا ئێسـتا لـەم کۆششـەی بەردەوامە، کە ئەمە وەك نهێنییە گەورەکە وەهایە، دۆزینەوەی ئەم نهێنییـە زۆر نهێنی دی کەشفدەکات، کە هەنوکە ئەفسانەی زانستیش سـەرقاڵی وەهـا کارێکە.

بەڵام بابزانین مردن چۆن هاتە بـوون؟ ڕووداوی هاتنـە بـوونی "مـردن" لێکدانەوەی فراوانی بۆ کراوە، بـۆ نموونـە هەنـدێك ئەفسـانە مـردن بـۆ ئـەوە دەگەڕێننـەوە، کـە لـە (ئـەنجامی گوێڕایـەڵی نـەکردنی مرۆڤـە بـۆ ڕاسـپاردە خوداییــەکان، یــان بــە کردارێکــی ســزادان و ناڕەوایانــەی بوونــەوەرێکی شەیتانییەوە گرێـی دەدەن، واتـە یـەکێك لـە دوژمنـەکانی خوداوەنـد مردنـی دروستکرد، وەك لە ئەفسانەی ئوسترالییەکان و سیبریا و ئەمەریکای باکووردا دەبینرێت، وەك ئەوەی لە ئایینەکاندا هەیـە ئـادەم وەك سـزا ڕەوانـەی سـەر زەوی کرا، هاوکات لەم دنیایەشدا مرۆڤـەکان بەهـەمان لۆژیـك ژیـان دەکـەن، مرۆڤە ژێردەستەکان یـان هـەر سیسـتمێکی تـر، کـە لـەدەرەوەی ئاغایـەتی و کۆیەلەیەتی بێت، چون ئێستا بەناوی ترەوە هـەمان سیسـتم پیادەدەکرێـت، کاتێ داوایەك دەکرێت گەر بەقسە نەکرێت و گوێڕایەڵ نەبیت ئەوا گـەر سـزای ڕاستەوخۆی ئەو گوێڕایەڵییە وەرنەگریت ئەوا سزای ناڕاستەوخۆ دەدرێیت[١٦] لێرەدا دەکەوینە نێوانی ئـازادی مـرۆڤ و یـاخیبوون، کـە مـرۆڤ یـاخیبووە بـۆ ئەوەی ئازادبێت سڵی نەکردۆتەوە، واتـە ئـازادی باجەکـەی بریتییـە لەسـزای مەرگ. لەبەرئەوە لە ئەفسانەکانیشدا ئەوەی، کە مـرۆڤ یـاخیبووە و کۆششـی ئـازادی کـردووە هەیـە، بـەڵام ئـەوەشمان لەپێشچـاوە، کـە مرۆڤگـەلێ هـەن لەهـەموو سـەردەمێکدا ملکەچـی دەنـوێنن یـان ئاغایـەتی دەنـوێنن، ئـەوەی

گوێڕایەڵ نەبێ مـەرگی دەداتـێ، وەك بڵێـی مـردن هـی ئـەوبێتو مـردن ئـەو بیدات، واتە خوایەك بێ سزابدات بـە مـەرگ، بەكوردییەكـەی نـەك مرۆڤـەكان بەموڵكی خۆی بزانێ بەڵكو لەو ڕێگەیەوە بیەوێ مردنیش بكاتە كۆیلەو گـوێ لەمستی خۆی، كە من دەسەڵاتم هەیەو مەرگ دەدەم، چونكە لـە كۆنـدا وەك لەسەرچاوەكاندا هاتووە مرۆڤـی خواوەنـدیش گـەلێ زۆربـووە، ئـەم جـۆرەی مـــرۆڤیش هـــیچ نـــەبووە جگـــە لـــە خۆبـــاڵاكردنو خۆجیاكردنەوەیـــەك لەئەوانیدی(بێهێزو ژێردەستەكان). هاوكات بۆ خۆم یەكێك لـە لێكدانـەوەكانم بۆ خواردنی سێوەكە لەلایـەن حـەواوە ئەوەیـە، كـە حـەوا بـە هۆشـیارییەوە سێوەكە دەخوات، جگە لە ویستی تاقیكردنەوەی ئەوەی ڕێگـەی لێـدەگیرێت ئەزموونكرێت، واتە تابۆكان هەمیشە خواستیان لەسەرە، ئەوەیـە، كـە حـەوا لەبەرئەوە سێوەكە دەخوات تا ڕێگە لە نا بگرێت، تا ئەوەی ئازادی ئەزموون بكـات، ئـەو ئـازادی گەرەكـە، ئـازادی لـە هـەموودا دەنـا، نـەك ئازادییـەكی مەرجـدار، واتـە ویسـتی ئـازادی ئـەزموونكردن ڕەنگـە حـەوای هانـدابێت بـۆ خواردنی سێوەكە. حەوا ئامادەیە هەموو شتێك لە دەستبدات بۆ یـەك شـت. وەك چۆن نایەوێت ئازادییەكی سنووورداری هـەبێت، ئـاواش ئامادەیـە هـەموو شتێ لە دەست بدات بۆ ئەوەی یەك شت بە دەست بێنێت، دیارە ئەمە تـەنیا گریمانەو لێكدانەوەیەكە.

لە یەكێك لە ئەفسانەكاندا باسی ئـەوە دەكـات، كـە مـردن چـۆن هاتـە ئاراوە "خوا نامەی نەمری بە تیرتیرە(الحربا)و نامەی مردنی بە دووپشكدا بۆ بـاوو بـاپیران نـارد. بـەڵام تیرتـیرە لـە ڕێگـادا دواكـەوت، ئیـدی دووپشـك لـە پێڕاگەیاندنی نامەكەدا پێشكەوت، بەهۆی ئەوەوە ڕوودانـی مـردن لەجیهانـدا هاتە ئارا"[(١٧)] لەم ئەفسـانەیەدا وەك بڵێـی لـە پێشـبڕكێیەكدا مـردن هاتبێتـە ئاراوە، یان سزایەكە بۆ دواكـەوتن، گـەر بهاتبایـە تیرتـیرە دوانەكـەوتبا ئـەوا نەمری بوونی دەبوو، هاوكات ئەوەش دەبینین سزای مرۆش دراوە لەكاتێكدا

تاوانەکە تاوانی تیرتیرە بووە، کە دواکەوتووە، ئەو دواکەوتووە باجەکەی مرۆڤ دەیدات. بەڵام ئایا سروشتی تیرتیرە بە بەرانبەر بە دووپشک خاوترو لەسەر خۆتر نییە؟ بەڵام چۆن پاساو بهێنرێتەوە بۆ بوونی مردن، چۆن مرۆڤ لاف زانینی هەموو شتێ لێبدات، کە بڵێ من دەزانم چۆن مردن هاتە بوون؟ هاوکات نەمری پێدانە نەك ئەوەی مرۆڤ خۆی هەڵیبژێرێت. واتە ناوەندێك هەیە بۆ ئەوەی پەیامی خواوەند بە مرۆڤ بگەیەنێت، وەك چۆن لە ئایینەکانیشدا ناوەند هەیە لە ئەفسانەکانیشدا ناوەند هەیە، بۆ پەیوندی نێوان مرۆڤو خواوەند.

بەڵام ئەوە روونە، کە زۆربەی ئەفسانەکان جەخت لەسەر هەربوونی(حەتمیەتی) مردن دەکەنەوە، ئەو پاڵەوانانەشی بەدوای نەمریدا وێڵن مەرجیان بۆ دادەنرێت بۆ نەمرییەکەیان، کە بەدیهێنانی مەرجەکە نەکردەیە، لەبەرئەوە هەر لەسەرەتاوە ئەوە دانراوە، کە "نەمری" بۆ خوایەو "مردن" یش بۆ مرۆڤە. مردنیش وەك سزایەك بۆ لادانی مرۆڤ دانراوە، کە هەرکاتێك هەڵە بکات، سزای هەیە، واتە خوا دەسەڵاتی سزای هەیە، جگەلەوەی بەرجەستەکردنی دەسەڵاتە لەوەی هەم دەسەڵاتی سزام هەیە، هەم هی لێخۆشبوون، لەبەرئەوەی مرۆڤەکان ناچاری گوێرایەڵی فەرمانەکانی بن!

بۆ نموونە لە ئەفسانەیەکی میلانزیدا، هاتووە، (کە باوو باپیرانی کۆن بە پۆشینی پێستێکی نوێ وەك مار گەنجیان دەستدەکەوتەوە، جارێکیان پیرەژنێك دووای دەستکەوتنەوەی گەنجێتی دەگەڕێتەوە ماڵ، وەلێ کوڕەکەی نایناسێتەوەو ئەویش بۆ هێورکردنەوەی کوڕەکەی پێستە کۆنەکە دەپۆشێتەوە ئیدی لەو کاتەوە مرۆڤ بووە بوونەوەرێکی تیاچوو(مردوو).

لێرەدا دەبینین مردن سزادانە، هاوکات لە بەشەوە بۆ گشت هەیە، واتە لە پیرەژەنێکەوە بۆ گشت مرۆڤەکان، کە ئەمە جۆرە پاساوێکە بۆ هەر

دەبێی مردن، دەنا لە ڕووی لۆژیکییەوە ناشێ سزای ئەو بگشتێنرێت، چونکە ئەمە نادادیە. لێرەدا ئەوەش دەردەخات، کە دایک بە میهرەبانییەوە ئامادەیە بۆ جەرگەکەی قوربانی بدات. دیارە ئەوەش کە بۆ پێستی مار، پرسیار سازدەکات!

یان لە ئەفسانەیەکی سەرنجڕاکێشی ئەندۆنیسیدا هاتووە، کە سەرەتا ئاسمان لە زەویەوە نزیك بووە خوا بەهۆی پەتێکەوە دیاری بۆ مرۆڤ شۆڕ دەکردەوە، ڕۆژێکیان لەجیاتی دیاری بەردێکی شۆڕکردەوە، باوو باپیرانیش ئەوەیان پێ قەبوڵنەکراو وتیان هیچ پێویستیمان بە بەرد نییە، شتێکمان بۆ بنێرە پێویستیمان پێی بێت، خواش داواکەیانی بەجێگەیاند، مۆزی بۆ ناردن خەڵکیش بەمە شادمان بوون، بەڵام دەنگێك لە ئەسمانەوە هات، وتی مادام ئێوە مۆزتان هەڵبژارد ئەوا ژیانیشتان وەك مۆز دەبێت، چونکە کاتێ درەختی مۆز خەڵفی نوێی کرد، ئیدی ئەسڵییە بەرگرەکەی دەمرێت، ئێوەش ئەوا دەمرنو منداڵەکانتان جێگەتان دەگرنەوە، بەڵام گەر بەردتان هەڵبژاردایە ئەوا وەك بەرد ژیانتان جێگیرو نەمر دەبوو)[١٨].

گەر لەم دیمەنانە بڕوانین هەست دەکەین مرۆڤ لەنێو خۆشیدا شتێ هەبووە بۆ ڕازیبوونو قەبوڵکردنی مردن، هاوکات ئەفسانەکان نەمریان وەك پاساوێك هێناوە. لەو دوو ئەفسانەیەی پێشوودا تێبینی ئەوە دەکەین تایبەت بەنەوەکان، لەئەفسانەی پیرەژنەکەدا، ئەوە بەیاندەکرێ کە لەبەر نەوەی نوێ پیرێتیو سزا دەدرێ، واتە وەك بڵێی نەوەی نوێ بایەخی نەبێ، بەڵام لەئەفسانە ئەندۆنیسیەکەدا نەوەی نوێ گرنگی هەیەو دەبێ جێگەی پیرەکان بگرنەوە. لەلایەکی دییەوە دەبینین ڕازینەبوونی مرۆڤ هۆیەکی دییە، کە مردن دەهێنێتە ئاراوە، هاوکات هیچ داوایەك بێ باجدان نییە. لەلایەکی دییەوە سروشتی بەردو مرۆڤ جیاوازی زۆرە، دەبێ گریمانەی ئەوە بکەین مرۆڤ ڕازینەبووە وەك بەردبێت، لەبەرئەوەیە مردن باشتربووە، وەك ئەوەی مرۆڤ وەك بەرد ئازاد نەبێت. لەلایەکی دییەوە هەرچەند ژیان ئەزیزە بەڵام

گریمانە دانی مەرگێك بۆ کورەکەی ئاسانە. مرۆڤ ڕازینەبووە ژیانی وەستاو بێت، ئەو مرۆڤە پڕ جووڵەیە، وەستاو نییە.

لەلایەکی دیەوە دابڕان لەژیانی ئاشناو دۆستان زۆر لەمەرگ سەختترە، وەك لە ئایینەکانیشدا دەبینرێت، کاتێ یارانی ئەشکەوت بەخەبەر دێن تووشی چ جۆرە دابڕان و دڕدۆنگیی و نامۆبوونێك دەبن، هاتنەوەی ئەو پیرەژنەش هەمان دۆخ بەرجەستە دەکات. لەو ئەفسانەیەشدا کە بەرد ڕەدکراوەتەوە، پێمان دەڵێ کە مرۆڤ مافی ڕەدکردنەوەی نییە، هاوکات جۆرێك لە تووڕەیی خواوەندی دەردەخات، وەك چۆن پێشمان دەڵێت هەموو کارێکی خوا حیکمەتێکی تێدایە (کەئەمە ئایینەکان زۆر کاری پێدەکەن)، واتە وەك دڵنەوایی دەوترێت، کاتێ خوا بەردی ناردووە ئەوا ناردنی ئەو بەردە حیکمەتێکی تیابووە، کە مرۆڤ پێی نەزانیوە، بەڵام هات و هاوارو نارازیبوونی مرۆڤ بێئەوەی بزانێت ئەو حیکمەتە چییە ئەکامەکەی ئەو سزایەی لێکەوتەوە بەمەرگی مرۆڤ خۆی کۆتایی هات، کە لەوێشەوە وەك بڵێی فێری ئارامیمان بکات.

لە ئەفسانەکانی جیهاندا بەشێوەی جۆراوجۆر لەمردنیان ڕوانیوە، نهێنی مردن وایکردووە، کە پیرۆزی پێ ببەخشن، هاوکات ترسیش لە مردن وایکردووە، کە گەڕان بەدوای نەمریدا بکرێت، ڕێوڕەسمی تایبەت بۆ مردوو سازکراوە و بەشێوەی جیاواز مامەڵە لەگەڵ مردوودا کراوە. هەروەك جیهانی مردووان پێکهێنراوە لێپرسینەوەو پاداشت و سزاش هەبووە. بەمجۆرە بۆمان دەردەکەوێت، مردن لە ئەفسانەدا پێگەیەکی بەرزی هەیە و کولتووری هەڵسوکەوتی جیاجیای لەگەڵ دەکرێت،ماڵی بۆ دروست دەکرێت و قوربانی بۆ دەکرێت و زیندووی لەگەڵ دەنێژرێت، قوربانی بۆ دەکرێت، کەسی مردوو دەبێتە تابۆو دۆستەکانیان نابێ ببیرنرێن بۆ ماوەیەکی کاتی ... دیاردەی نامۆو بەرانبەر بەمردن ئەنجامدراوە، کە دەکرێت چەندان کتێبی تایبەتی لەسەر بنووسرێت، چوون هەر یەك لەو مامەڵەکردن و دیاردانە هۆکارگەلێ

لەپشتیانەوە هەن، کە دەکرێت بەشێوەی شیمانە ڕاڤەبکرێن. لەم پارەدا بە ئەفسانەیەکی کۆنی کورد کۆتایی پێ دێنم، کە دەششێت لای زۆربەمان ئاشنابێ. ئەویش ئەفسانەی "میرمح" ئەمەش ئەفسانەیەکی کۆنی باوی ئێزیدییەکانە. ئەم ئەفسانەیە، کە گەڕانی میرمحە بە دوای نەمریدا، بەڵام لێکچونێکی زۆر لە نێوان ئەم ئەفسانەیەو چیرۆکە ئایینییەکەی ئادەمو حەوا هەیە، بەوەی نەکەی لە سێوەکە بخۆی، بۆ میرمح نەکەی لەو دارە نزیک بیتەوە. بەڵام وەك پێشتر گوتمان مرۆڤ بە سروشتی خۆی ئازادی گەرەکە، حەزی لە قەدەخەشکێنییە. لە گەشتی خۆیدا میرمح زۆری پێدەگوترێت، کە مردن لە هەموو شوێنێکە وەلێ نابیستێت، بەڵام دواجار خۆی هەنگاو دەهاوێ بۆ مردن، دەشێ خواردنی سێوەکەو نزیکبوونەوە لە دارەکە تەنیا پاساوێ بێت بۆ ویستی مردنو پەشیمان بوونەوە لە نەمری! لەو ئەفسانەیەدا نەمری یەکسانە بە وەستانی زەمەنو بە چەشنێ هەڵهاتن لە شوێن(جیهان). لە لایەکی دییەوە ئەم ئەفسانەیە، کە سۆزی غەریبی میرمح بۆ خێزانەکەی نیشاندەداتو سێو بە هۆکاری مانەوەی دانراوە، بەڵام لەبەرئەوەی مرۆڤ هەر ئەبێ بمرێیە، ئەوا بە هەر هۆیەك بێت، دەبێ ئەم سێ سێوەی، کە بە میرمحە بۆ ئەوەی بتوانێ پاش گەشتەکەی بۆ چوونەوە ناو خێزانی بگەڕێتەوە بۆ بەهەشتی نەمران، واتە سێو وەك ڕێنیشاندەرو ڕێگەگر لە مردن دانراوە. بەڵام دواجار میرمح مرۆڤە هەستو سۆزی هەیە، ئەو ڕووداوانەی پێشی دێن بۆ ئەوەی بێ سێو بێتو بمرێت، پاساوێکن بۆ هەر ئەبێی مردنی میرمح. لەو ئەفسانەیەدا پێمان دەڵێت نەمری نەکردەیە بۆ مرۆڤ. هاوکات مرۆڤ بە هاتنە نێو سنووری بوونەوە، هاتە نێو جیهانەوە دەبێ بمرێ. واتە لەو ئەفسانەیەدا شوێنو کات مەترسین بۆ مردنی مرۆڤ، مرۆڤ لە سنووری کاتو شوێندایە، بۆیە ناتوانێ نەمرێت. لەلایەکی ترەوە مرۆڤ ئارەزووی زانینی هەیە، ئارەزووی جیاوازی هەیە میرمح دەیەوێ بزانێت

نەمری چییە، دەیەوێ جیاواز لەمرۆڤەکانی دی نەمربێ. ئەم ئەفسانەیە پێکەوەژیان بە گرنگتر دادەنێ لە نەمری، میرمح دوور لە خێزانی نەمربوو، بەڵام ئەم دوورییە لە مردن سەختتر بوو بۆی بۆیە دەگەڕێتەوە، هەرچەند گەڕانەوەکەی بە چەشنێ دڵنیایی مردنی لە خۆدا هەڵگرتووە، بەڵام دواجار مرۆڤ بڕیار دەدات، میرمح بڕیار دەدات خۆی چیبکات. ئەم ئەفسانەیە زۆر لێکدانەوە هەڵدەگرێت، بەڵام ئێمە ناچارین لێرەدا کورتبڕبین، چوون گەشتێکی درێژمان لە ڕێیە.

### ٢/ مردن لە ئاییندا:

مرۆڤ لەسەرەتایی ژیانییەوە هەوڵیداوە باوەڕ بە چەند هێزێکی سەرووسروشتی بهێنێت، تا ئەو شتانەی، کە لەسروشتدا ڕوودەدەن بیداتە پاڵی، یان هۆکار بۆ ڕوودانیان بدۆزێتەوە. ئاینیش یەکێك بووە لەو هۆکارانەی، هۆکاری بۆ ڕوودانی شتەکان داناوە، ئارامی بەمرۆڤ بەخشیووە لەم لایەنەوە. لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤەکان گەڕۆك نین بە دوایی زانیندا، مرۆڤە ڕەشۆکەکە پێویستیان بە ژیانێکی ئاسایی هەیە، دوور لە گەڕان بە دوایی ڕاستییەکاندا، ئایینییش وەڵامی داونەتەوە، بەڵام وەڵامەکە ڕاستە یان نا ئەوە بووەتە جێگەی لێکۆڵینەوەی گەلێ زانا. جگە لەوەی ئایین جۆرە سزایەکی داناوە کە مرۆڤەکان ڕازیبکات، بەوەی کە ئایین لێکدانەوەی بۆ دەکات، واتە ئەوەی لە ئاییندا هاتووە ڕاستییە، سزاش هەیە بۆ ئەوانەی لە ڕاستییەکان لادەدەن، واتە لە نێوان هۆکارو هەڕەشەدا، ئایین وەڵامی زۆر پرسیاری مرۆڤی داوەتەوە، ئیدی مرۆڤەکان دابەشبوون بۆ ئەوەی بڕوا بەو وەڵامانە بکەن یان نا، یاخیی بن لە هەڕەشە یان ملکەچ بن.

ئایین چەندین پێناسەی بۆ دەکرێت ناتوانین پێناسەیەکی ڕەهای بۆ بکەین، چونکە هەندێك بیرو ئایدیا هەیە، ئایین وەك هۆکارێك بۆ دیلکردنو

نامۆکردنی مرۆڤ دەبینێت[19] بۆچوونی تریش هەیە بە پێچەوانەوە ئایین بە ڕزگارکەری مرۆڤ دەزانێت[20] لەبەرئەوە چەند پێناسەکردنی ئایین گرنگە، هێندەش گرنگە ئەو پێناسەیە بەدوا پێناسە نەزانرێت، بەتایبەت بۆ بابەتی ئایین، کە خۆی یەکێکە لەو بابەتانەی هەڵگری خوێندنەوەی جیاوازە. هاوکات دەبێ ئەوە جیا بکەینەوە، کە ئایینو ئایینەکان لەسەرەتایی مێژووەوە جیاوازبووە، چونکە ئایینەکانی سەرەتا فرە خواوەندی باڵادەستبووە، کە هەنوکە بەپێچەوانەوە ئایینی ئاسمانی باڵادەستە(ئایینی تاك خواوەندی)، کە ئەمەش وادەکات پێناسەکان جیاوازبن.

ئایین،"پەیوەندییەکی ڕۆحی و سۆزدارییە لەنێوان مرۆڤو هێزی سەرەوەی سروشتدا... یارمەتیدەرێکە بۆ پەیوەندیکردن بەو هێزە"[21] بەپێی ئەم پێناسەیە ئایین هۆکارێکی نزیکخەرەوەیە لە خوا، چونکە ئەوە ئایینە کە مرۆڤ و خوا بەیەك دەگەیەنێت، مرۆڤ لەڕێگەی ئایینەوە خوا دەناسێتو عەشقو پەیوەندی لەگەڵ دەگرێت، لەبەرئەوە خودی خوا نییە بەڵکو هۆکارە، هاوکات پێمان دەڵێت خوا لەسەرەوەیە، ئەمەش گەر لەگەڵ ئەو بیرکردنەوە ئەفسانەییە بەراوردی بکەین، کە جیهانی مردووەکان جیهانی ژێرەوەیە ئەوا دەردەکەوێت، کە شوێنی خوا پێچەوانەی شوێنی مردنە، گەر شوێنی خوا سەرەوە بێت ئەوا شوێنی مردووەکانە ژێرەوەیە، گەر خوا لەئاسمان بێت ئەوا مردووەکان لەژێرەوەی زەویدان. هاوکات ئەم پێناسەیە دەشێ بڵێین زیاتر پێناسەیەکی تایبەتە بۆ ئەو مرۆڤە ڕۆحانیانە یان سۆفیو عارفەکان، نەك ئەو مرۆڤانەی، کە چاوەڕوانییەکانیان لە خوا زیاتر دوورخستنەوەیە لە ترسی سووتاندنو دۆزەخ.

لەدیدی تایلۆرەوە ئایین بریتییە لە"باوەڕبوون بە بوونەوەرە ڕۆحییەکان"[22]. باوەڕ واتە تەسلیمبوون، واتە خۆ یەکلایکردنەوە، واتە بڕیاردان، بوونەوەری نەبینراو، ئەوەی هەستەکان نایبینێت دەبێت مرۆڤ

لەئاییندا بڕوای پێبکات، واتە ئایین دەبێ ئەو هێزە بێت بڕوا بەمرۆڤ بهێنێ بۆ ئەو بوونەوەرانەی، کە لەنێوان بوون‌و نەبووندان، واتە هەمیشە شوێنی گومانن، چونکە لەڕێگەی هەستەوە درک ناکرێن، بەڵام مرۆڤی بڕوادار دەبێ، باوەڕ بهێنێت بەوەی بوونەوەری ڕۆحی هەیە، کە زیاتر مەبەست لێی فریشتەو شەیتان‌و دواجار خوداشە.

لەلایەکی ترەوە تۆکفیل، باس لەوەدەکات کۆمەڵگەی بێ "ئیمان" ئەستەمە بدۆزرێتەوە، چونکە مرۆڤ خۆی ناتوانێت حەقیقەتەکان بدۆزێتەوە، ئیمانی ئایینیش دەتوانێت زۆرترین کەس لەسەر سفرەی خۆی کۆبکاتەوە، گرنگی ئایینیش لەوەدا دەبینێت، کە دەتوانێت وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە، ئەوەش دەڵێت، ئایینی بێماناش هەیە، کە گرفت بۆ هۆشیاری مرۆڤ دروست دەکات[٢٣]. تۆکفێل گرنگی ئایین‌و ئیمان دەخاتەروو، بەشێوەیەکی واقعی شتە ڕاستەکە دەڵێت، ئیدی دەشێ هاوڕای نەبین بەڵام ڕاستییەك هەیە لەبۆچوونەکەیدا، کە ئایین بۆ مرۆڤی ڕۆژانەیی‌و سادە پێویستییەو زۆرێك لەو نهێنیانەی لەژیانیدا تووشی دەبێت کەشفکراوە یان زۆرێك لەپرسیارەکان وەڵامی دراوتەوە لەکاتێکدا ئەم مرۆڤە خۆی ئیرادەی گەڕانی نییە بەدوای وەڵامدا. ئەم پێناسە جیاوازانەی ئایین هۆکارن پێمان دەڵێن، کە ئایین دیاردەیەکی سانا نییە بەڵکو دیاردەیەکی تایبەتە لەبەرئەوە بایەخێکی فرەی هەیە لەسەرجەمی نەتەوەکاندا. دەکرێت ئایین ببێتە هۆی دۆگمایی، دەشکرێ ئایین هۆکارێ بێت بۆ ڕەهایی(ئازادبوون) بەڵام دیدگاکان‌و مامەڵەکردنەکان لەگەڵ ئایین یان کەسی ئایینی خۆی ئەمە پێڕەودەکات، چونکە تێگەیشتن لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، مامەڵەکردن‌و تێگەیشتنی موسڵمانێکی خۆرئاوایی بۆ ئایینی ئیسلام جیاوازە لە موسڵمانێکی ڕۆژهەڵاتی، تەنانەت موسڵمانێکی کوردستانی ناوچەیی لەگەڵ موسڵمانێکی کوردستانی شاری، گەر باشتر بڵێم، لەناو یەك ماڵ و خێزاندا

جیاوازی هەیە، یان موسڵمانی ئایدۆلۆژیا جیاوازەکان ڕوانینیان جیاوازە بۆ ئایین. هاوکات ئایینەکانیش دنیایەکی بەرینن و جیاوازیان هەیە، دەشێ ئایینێك کراوەو بواری نوێکردنەوەی زیاتر تیا بێت بەبەراورد بەئایینێکی دی، بەڵام هیچ ئایینێ نییە بواری نوێبوونەوەی تیا نەبێت مەگەر مرۆڤەکان ئەمەی تیا بکوژن، چونکە من بڕوام وایە ئەمە زیاتر پەیوەندی بەپێڕەوکەرانی ئایینەکەو کولتوورو ناوەندەکەوە هەیە، چونکە ئایینەکان هەڵگری خوێندنەوەی فرەن ناکرێ هیچ دەقێ، کە فرە خوێندنەوە هەڵگرێ بواری نوێکردنەوەو بەرهەمهێنانی نوێی تیا نەبێت. بەرینی ئایینەکان پێماندەڵێت، کە دەبێت ئایین سیستەمو پرەنسیپی تایبەتی بۆ زۆرینەی بوارەکان و دیاردەکانی ژیان هەبێت، وەك چۆن ئایینەکان کاریگەری لەسەر کولتوورو بیرکردنەوەی مرۆڤەکان دادەنێین، ئەواش کولتوورو سیستەمە جیاوازەکانی ژیاری مرۆڤو بیرکردنەوەکانی کاریگەر لەسەر ئەو ئایینە دادەنێت، کە چۆن ئایینێك بێت، ناشێ لە کولتوورێکی کراوەو ڕێزگر لە مافەکانی مرۆڤو ئازادی بیرکردنەوەدا، ئایینێکی تۆتالیتار هەبێ، ئایینەکان چەند کاریگەری لەسەر مرۆڤ دادەنێن، مرۆڤەکانیش بەو سیستەمانەی هەیانە کاریگەری لەسەر ئایینەکان دادەنێین.

بابزانین ئایینەکان چۆن باسی مردن دەکەن، چونکە ئایینەکان زۆر سوود لەم نهێنیانە وەردەگرن بۆ قایمکردنی پێگەی خۆیان، مردن هەمیشە بابەتێکی گرنگ بووە بۆ ئایینەکان، تا گوتارو پێڕەوەکانی خۆیان لەسەر بنیادبنێن و ئامۆژگارییەکانی خۆیان ئاراستە بکەن لەرێیەوە.

مردن و مامەڵەکردن لەگەڵ مردوودا، لەناو ئایینەکاندا سەرچاوەیەکی بنەڕەتییە "یەك لە نیشانەکانی بیرۆکەی ئایینی هەڵسوکەوتە لەگەڵ مردوو، هیچ ئایینێك نییە رێورەسمی تایبەتی خۆی نەبێ بۆ شاردنەوەی مردووەکانی"[٢٤] ئایین و مردن پێکەوە دێن، هەروەك ویل دیورانت دەڵێت

"مـردن، سەرچـاوەی هـەموو ئایینەکانـەو ڕەنگـە ئەگـەر مـردن نەبووایـە خواکانیش نەبوونایە"(٢٥). مردن ئەو هێزە دیارو نادیارەیە، کە زۆر نهێنی و هێزی دی لەپشتیدا خۆی مەڵاسداوە، یان نهێنی گەلی دی هەن، کە مـردنیش بەشێکە لەو نهێنییانەو دەستکردی ئەو نهێنییە گەورەیـەن. مـردن وشـەیەکە زۆر وشەی دی لەپشتیەوە خۆی مەڵاسداوە، خـۆ دەشـبێ ئـەوە خـوابێ، کـە زۆر وشەی دی لەهەناویدا بن(خوێنەر دەتوانێت بە پێـی بۆچـوونی ژان لاکـان تایبەت بە ڕیال خوێندنەوە بۆ ئایین بکات، ئایین بەو شـوێنە بەتاڵـە دانـێین، کە بە پڕکردنەوەی شەبەقێکی دی دروست دەبێت، بڕوانە سێوی سێهەم، لـە نووسینی بەختیار عەلی لاپەڕە ١١٨).

بۆ ئەوەی لە باسی مردن لە ئاینـدا نزیـك ببینـەوە پێویسـتە بۆچـوونی ئایینە کۆنـەکانو ئایینـە نوێیـەکان بخەینـەروو. بیروبـاوەڕی ڤیداییـەکان لـە (براهمـا)وە دەسـت پێـدەکات، کـە باوەڕیـان وابـووە "هـەموو بوونـەوەرێکی زیندوو ڕۆحی هەیە، ئەو ڕۆحەش لە براهماوە دێت، براهمـا هـەرگیز نامرێـت، کەواتە ڕۆحـی ئـەو بوونەوەرانـەی لـە براهمـاوە دێـن هـەرگیز نامرن...کاتێـك مرۆڤێك مـرد ڕۆحەکـەی لـە جەسـتەی دێتـە دەرەوەو یەکسـەر دەچـێتە نـاو جەسـتەی منـداڵێکی تـازە لـەدایکبووەوە"(٢٦) لـەم بیروبـاوەرەدا مـرۆڤ دابەشـبووە بـۆ دوو بـەش بەشـێکی دەمرێـتو بەشـێکی نـەمرە، کـە ڕۆحـە، هاوکات سەرچاوەی ڕۆح، کە نـەمرە براهمایـە، مـرۆڤیش نـەمرە، چـونکە لـە نەمرەوە ڕۆحی وەرگرتووە.( واتە بڕوایـان بـە گیـانگۆڕین هـەبووە، هـەروەك بڕوایان بە بەهەشتو دۆزەخ هەبووە)(٢٧)، بەپێی چینەکان ڕۆحەکان ئـاڵوگۆڕ دەکەن، هەتا دەشێت گیانی مرۆڤەکە بچێتە گیانی ئاژەڵێکەوە (٢٨). واتە لەم ئایینەدا بوونەوەرەکان ڕۆحدارن، لەبەرئەوە هەموو بوونەوەرێك بەهاداربووە، گرنگە مرۆڤیش ڕێز لە بوونەوەرەکان بگرێت چون دەشێ ڕۆژێ ڕۆحـی خـۆت بچێتە نێو یەکێ لەو بوونەوەرانەوە، هەروەك ڕۆحـی تـۆش بەشـێکە لـەڕۆحی

خوا(براهما). لەم ئایینەدا نەمرێك هەیە نەمری دەدات، واتە بمرێ نا توانێ نەمری بدات، براهما نەمرە بۆیە دەتوانێ نەمری بدات. لەم ئایینەدا بۆیە رێزی زۆر لە بوونەوەرە بەدەر لە مرۆڤیش دەگیرێت لەبەرئەوەی ئەوانیش رۆحدارن، رۆح پیرۆزی پیرۆزەکانە. ئەوەی درێژەدەری زیندووان و ژیانە رۆحە، بە واتا پیرۆزییەك هەیە بۆ ژیان، لەبەرئەوەی رۆح لەنێو ژیاندایە.

هەر لەم ئایینەدا بودا ریفۆرمی کرد لەو بیروباوەڕانەی پێشخۆیدا، بۆ نموونە (نەهێشتنی قوربانی[29] و هەروەك د. محمەد کەمال دەڵێت لە بیروباوەڕی (جانییەکان)دا بەوریاییەوە هەناسەدەدەن هەتا ئەو زیندەوەرە بچووکانەی ناو هەوا نەکوژن[30]، واتە ئەو گۆڕانانەی بودا ئەنجامیدان لەم ئایینەدا بووە هۆی بووژانەوەی ئایینەکە، چونکە گۆڕانەکان دڵخۆشکەرو بڕوا پێکەربوون بۆ خەڵکی. بودا بڕوای وابوو مردن حەتمییەو هەردەبێت رووبدات، هەروەها مردن شتێکی پیرۆزە[31] دەبێ ئەوە بڵێین، کە بیرورایی هیندییەکان و ئایینەکانیان زۆر بڵاوبۆتەوەو کاریگەری لەسەر تەواوی مرۆڤایەتی داناوە[32] دیاردەیەکی سەیر لەلای هیندییەکان هەبووە ئەویش جەستەی مردوویان سووتاندووە[33]. لەم ئایینەدا رووە ناشرینەکەی مردن سڕاوەتەوەو رووبەکی دی وەرگرتووەو پیرۆزکراوە.

لەلایەکی ترەوە لە چین و یابان، بڕوایان بە کۆنفۆشیۆس هەبووە، کە پاشان بووەتە رێبازێك بە ناوی کۆنفۆشیۆنیزم. ئەم پەروەردەکارە زانینی ژیانی پەیوەستکردووە بە مردنەوە، وەك دەڵێت "ئەگەر لە ژیاندا دەستەوەستانی لە خزمەتکردنی خەڵك، کەواتە چۆن لەکاتی مردندا دەتوانیت خزمەتی رۆحەکان بکەیت؟ ئەگەر تۆ ژیان ناناسیت ئەدی چۆن بۆت هەڵدەکەوێت شتێك لەبارەی مردنەوە بزانیت"[34]، ئەم ئایینە لەنێوان ژیاندۆستی و مەرگدۆستیدا جۆلانێی کردووە، بەڵام پێموایە ژیاندۆستی تێدا زاڵە لەبەرئەوەی ناسینی ژیان پێشمەرج بووە بۆ ناسینی مردن، خزمەتکردنی

ژیان و مرۆڤەکان لەم ژیانەدا پێشمەرجی باشبوونتن و چاکە کردنتن لەگەڵ ڕۆحەکانی دی. ئەم ئایینـە زۆر بڵاوبووەتـەوە چونکە وردکارانـە ڕوانیویانـەو برێـك عەقڵانیانـــەو مرۆڤدۆســتانە بیروباوەڕەكــەی خۆیــان دارشــتووەو بڵاوکردۆتـەوە. ڕێزیـان لەسـەرجەم بوونـەوەران‌و زینـدەوەران گرتـووە. ئـەم ئایینە کارێکی کردووە پەیوەنـدی نێـوان مرۆڤـەکان لەسـەر گیـانی هاوکـاری بنیاد بنرێت، بەوەی گەر بۆ مرۆڤەکانی دی باشنەبیت ئیدی چۆن دەتوانیت بۆ خۆت باشبیت. هاوکات ئەم ئایینە تەواوکاری‌و پەیوەندی نێـوان جەسـتەو ڕۆحی دەرخستووە. لەلایەکی ژیانی بە ئاوێنەی مەرگ بینیوە، گەر ئاوێنـەی ژیانت تەڵخ بێت، مەرگیشت تەڵخ‌و ناروون دەبێت، وەلێ گەر ڕوون بێت ئـەوا بێگومان لە دەمی مردنیشدا ڕۆحـت ڕوون‌و سـاف دەبێـت، ئـازار نـابینی‌و لـە مەرگ ناترسیت. ژیان پەروەردەکەری ڕۆحبووە.

لـەئایینی زەردەشـتیدا بـەجۆرێکی تـر لـەمردنیان ڕوانیـوەو مامەڵـەی جیاوازیان لەگەڵ مردوو کردووە. لەم ئایینـەدا "ئـاگر نیشـانەی خواپەرسـتی بووە"[٣٥] هەروەها بۆ ڕەوینـەوەی تـرس لـە مـردن دەبووایـە (شـوێنکەوتەی زەردەشتی لایەنگری ئاهورامەزدا بکات‌و دژی ئەهریمەن بووەستێت، ئەمـەش هۆکـارە بـۆ ئـەوەی بچـێتە شـوێنی پاکبوونـەوە لـە پردەکـە بپەڕێتـەوە بـۆ "بەهەشت" لەوێش بۆ هەمیشە لەگەڵ ئاهورامەزدادا بژێت، دیارە فەلسەفەی ڕۆژی حەشر لەو کاتەدا بۆ جولەکاکان گوازراوەتەوە، کـە پارسـەکان بەسـەر فەلەستیندا زاڵبوون)[٣٦]. هەروەها بڕوایان وابـووە کـە (مـرۆڤ دەمـرێ ڕۆحـی یەکسەر لە جەستەی دەرناچێ، هەتا سێ شەو و ڕۆژ، گیان پەیوەندی لەگەڵ خوادا دەکـات‌و گـەر گیانەکـە گوناهکـار نـە بێـت ئـەوا بەخۆشـیەوە کاتەکـە بەسەر دەبـات، گـەر گوناهکـار بێـت بـە خەمباری،پاشـان گیـان لـە جەسـتە جیادەبێتەوە، جەستە لەسەر خاك دەبێت تا خاکەکە پاکدەکاتـەوە[٣٧] واتـە بڕوایـان بـە پاداشـت‌و سـزا هـەبووە، هـەر لـە کتـێبی "ئاڤێسـتا"دا هـاتووە

"مردووەکان هەناسەدەدەن‌و بۆ هەتاهەتایە پیری‌و مردن‌و گەندەڵی و نەمان لەو بوونەوەرە ماددییەدا نامێنێت"[٣٨]. لەبەرئەوەی هێزی چاکەو خراپە لەدێرەوە هەبووە، ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر دابەشکردنی چارەنووسی مرۆڤ لەنێوان چوونە نێو بەهەشت یان دۆزەخ، هاوکات مرۆڤ، کە ڕزگاری بوو لەو جەستەیە، کە هۆکاری گەندەڵبوونی مرۆڤ و ڕۆحی مرۆڤە، ئەوا گەر بەهەشتی بێت لەو نەهامەتی یان لەو هێزانە ڕزگاری دەبێت، کە مرۆڤ لەسەرەتای بوونییەوە کۆششی کردووە بۆ فریادبوون لەو هێزانە، واتە کاتێ کە بگەیت بەنەمری‌و جاویدانی‌و نەخۆشی‌و پیری‌و گەندەڵی نەمێنێ ئیدی ئەمە گەیشتنە بەکەماڵ، ئەمەش خەونی سەرەتاو ئێستاو ئاییندەی مرۆڤە، بەڵام ئەم خەونە لەئایینەکاندا بەدیدەهێنرێت وەلێ لەم دنیایەدا نا بەڵکو لەدنیایەکی دی، بەڵام ئەم دنیایەو ژیان لەم دنیایەو چۆنیەتی کردارەکانی مرۆڤ دیاریدەکات، کە ئاکامی مرۆڤ لەو دنیا چیدەبێت.

له ئایینی ئێزیدیەکانیشدا دوو کتێبیان هەیە "جیلوە– مەسحەفا ڕەش" لەم ئایینەدا داخرانێکی زۆر دەبینرێت، چونکە نابێت بەهیچ جۆرێک باسی ئایین‌و کتێبەکەیان بکرێت، بەواتا جۆرێک لەتابوو هەیە بۆ باسکردن‌و کەشفکردنی ئایینەکەو نهێنییەکانی. "چەندین ئێزیدی...مەرگی پڕ جەفایان چەشتووە هەر لەبەرئەوەی ناوی کتێبە ئایینییەکانیان ئاشکراکردووە"[٣٩]، ئەوەی چۆن ئەم زانیاریانە زانراوە ئەوە چیرۆکی خۆی هەیە، کە ئێرە شوێنی باسکردنی نییە. لەم ئایینەشدا وەکو زۆرێک لەئایینەکانی دی باسکردنی سزاو پاداشت بوونی هەیە، بۆ نموونە له جیلوەدا باس لە سزاو پاداشتی پاش مردن کراوە، نووسراوە "ئەوانەی دژی من دەجووڵێنەوە لەو دنیای تر سزایان دەدەم...ئەوانەی ڕازونهێنییەکانی من دەپارێزن پاداشتیان دەدەمەوە"[٤٠]، بەواتا لەم ئایینەدا داوای پاراستنی ئایینەکە کراوە، نەك ئەوی هەوڵدرێت بۆ گەشەپێدان‌و بڵاوکردنەوەی لەنێو خەڵکدا، بەواتایەکی

دی وەك فـەرزو ئـەركێك لەسـەر پێڕەكـەران دانـراوە، كـە ئایینەكـەیان بڵاونەكەنەوە!

ئەم دەستگرتنە لە بڵاوكردنـەوە پێویسـتی بـە خوێندنـەوەی تایبەتـە، چونكە هیچ ئایینێك نییە بانگەشە بۆ فراوانبوون‌و بڵاوكردنەوەی پەیامەكـەی نەكات، بەڵام ئەم ئایینە بۆ بە پێچەوانەوەیە؟

لەلایەكی دییەوە ئەم ئایینە وەك چۆن لای (یارسانەكان‌و ئەهلی حەق‌و عەلەویەكان "دۆنادۆن"هەبووە لای ئێزیدییـەكانیش كراسـگۆڕین هـەبووە)[٤١] دیارە چەمكی جیاواز بۆ ئەم دیاردەیە(لەشـگۆڕین) هـەبووە بـەڵام لێكنزیكـی لەمەبەستدا هەیـە، ئەمانـە بـەكاردێن (دۆنـادۆن–كراسـگۆڕین– لەشـگۆڕین– تناسخ الارواح)، ئەمەش پێمان دەڵێت، كە باوەڕیان بە نەمری ڕۆح هەبووە.

هـەروەك لـە كتـێبی جیلـوەدا هـاتووە مردنـی خـەڵكی ئاسـایی جیاكراوەتەوە لە مردنی ئـەو كەسانەی خواوەند ڕازیدەكـەن، پۆشاكپۆشـی وەك پاداشتێكە،"ئەوانەی هەوڵدەدەن مـن ڕازیبكـەن وەكـو خـەڵكی ئاسایی نامرن...ڕێگە بەهیچ كەس نادەم ماوەیەكی زۆرتر بژی كە بۆم داناوە... گـەر بزانم شیاوە بە پۆشاكپۆشی دوو سێ جار دەینێرمەوە سـەر زەوی"[٤٢]. لـەم ئایینەدا زیاتر هەست بە تارمایی مرۆڤێكی بە دەسـەڵات دەكـەین، لـە وێنـەی پاشایەك. لەم ئایینەدا ئەوە ڕووندەبێتەوە، كە كاتی مـردن دیـاریكراو بـووە، جیاوازی نێوان كەسە ئێزیدیەكان هەیە، لەوەی كە كامیان خواوەند ڕازیبكات پاداشتی هەیە. چەمكی ڕازیكردن لـەم ئایینـەو سـەرجەم ئایینەكانـدا هەیـە، بەڵام ڕازیكـردن بۆچـی؟ ڕازیكـردن هۆكارێكـە تـەنیا بـۆ ئـەو نییـە بـەڵكو بـۆ خۆشـە، واتـە ئـەو مرۆڤـە بـڕوادارەی كـە خـوا ڕازیبكـات، ئـەوا خـواش ئـەو ڕازیـدەكات، بـە پاداشـت دانـەوە، لێـرەدا هەسـت بـە جـۆرە مامەڵـەكردنێك دەكەین. من خوا ڕازیدەكـەم‌و خـواش مـن ڕازیـدەكات‌و پاداشـتم دەداتـەوە. ڕازیكردنـی خـواش گوێڕایەڵیـە. ڕازیكردنـی ئـەو خـۆ ڕازیكردنـە. ڕازیكـردن

وازهێنانه له خۆ بۆ ئەوەی ئەو ڕازیبکەیت، گەر ڕازینەکەیت دەتترسێنێت، سزات دەدات، گەر ڕازیکەیت پاداشت وەردەگرێت. ڕازیکردن کۆششکردنە، هەوڵدانە، لەبەرئەوە پاداشتی هەیە.

مەسیحیەکانیش بروایان بە پاداشتو سزای دوای مردن هەیە، هەروەك لەباسی دەرکردنی ئادەمدا هاتووە، کە (لە درەختی زانینی چاکەو خراپەیان خوارد بە هۆی فریوخواردنی ژنەکەوە، کە مارێك فریویدا، خوا وتی نابێ لێی بخۆن دەنا دەمرن، مار وتی بیخۆن نامرن)[٤٣] سەرەتای سزاکە گوێڕایەڵی نەکردن بووە. وەك پێشتر باسمکرد ڕازینەبوون بە خواردنی سێوەکەو ئەزموونکردنی ئازادی لە نەخواردنی سێوەکە. بەڵام تێبینی ئەوە دەکەین، لە درەختی زانینیان خواردووە، واتە گەر مرۆڤ نەزان بێت سزای نییە؟ لێرەدا ئەوەی زانین یان نەزانین زۆر خوێندنەوە هەڵدەگرێت، بەڵام باسەکەمان لەسەر مردنە!

هەروەها باس لە زیندووبوونەوەی مەسیح دەکرێت، بۆیە هەندێك دەڵێن (مەسیح جەستە نەبووە بەڵکو ڕۆحی پیرۆز بووە[٤٤] هەربۆیە ڕۆحیش لە خاچ نادرێت، بەواتا کاتێك دەوترێت مەسیح ڕۆحی پیرۆز بووە، وەك ئەوەیە بگوترێت مەسیح خوا بووە، هەربۆیە نەمرە، لەلایەکی دییەوە ڕۆح ماددە نییە تا لەخاچ بدرێت، واتە ڕۆح ئەو خاسیەتەی نییە، کە لەخاچ بدرێت، شتێ لەخاچ دەدرێت نامێنی بەڵام مەسیح ئەو شتەنییە، کە لەخاچ بدرێت، ئەو ڕۆحە نەك جەستە، ئەوە جەستەیە لەخاچ دەدرێت. لێرەدا تێبینی پەڕاندنەوەی خوایەتی دەکەین بۆ مرۆڤ، مرۆڤی چۆن پیرۆز دەکرێ، ئەو مرۆڤە بە ئاوێزانبوونی بە ڕۆحی خوا دەبێتە خوا.

هەروەك لەئایینەکاندا (بەتایبەت ئایینە تاك خودابیەکان–تەوحیدیەکان) باس لە پەرجوو(موعجیزە)ی پەیامبەران کراوە، بەواتا هەر پەیامبەرێك پەرجووی هەبووە، یەکێك لە پەرجووەکانی عیسای کوری مریەم

زیندووکردنەوەی مردوو بووە[٤٥]. ئەمەش بۆ خۆی بە پێی بیرکردنەوەی مرۆڤی سەربەست لە ئایین گرفت هەڵگرە، بەڵام لە چوارچێوەی ئاییندا ڕاستییەکی دوور لە گومانە، چونکە ئایین بریتییە لە ڕازیبوون، تەسلیمبوون.

هاوکات لە ئایینی ئیسلامیشدا مردن وەك سزایەکە بۆ ئادەمو حەوا، هەروەها چۆن خوا گیانی بە مرۆڤداکرد ئەوهاش دەیمرێنێتو زیندووشی دەکاتەوە[٤٦]. گەر چاکەکار بێت پاداشتی دەکات، گەر تاوانبار بێت سزای دەدات. گەر ورد بڕوانین لە ئایینەکان هاوکێشەیەك دەبینینەوە ئادەمو حەوا کارێکیان کرد، کە نەدەبوایە بیکەن، لەبەرئەوە سزایان دراو ژیانێکی کاتیان پێدرا، واتە فڕێدرانە ژیانەوە. ژیانیش ئەگەری خراپەکردنو گوێڕایەڵی نەکردنی لە خۆدا هەڵگرتووە، ناکرێ مرۆڤ بژی تەواو گوێڕایەڵ بێت. لەبەرئەوە گوێڕایەڵبوونو نەبوونی پێویستی بە پاداشتو سزا هەیە، گەر گوێڕایەڵبوویت پاداشت وەردەگریت، وە بەپێچەوانەشەوە. واتە مردنی مرۆڤ بە خاڵی دەرچوونو گەرانەوەی مرۆڤ دانراوە لە ئاییندا، گوێڕایەڵنەبوونی مرۆڤ لە بەهەشت دەرچوون (مردن) بوو، بۆ نێو ئەم جیهانە، ئەم جیهانەش مەڵبەندی تاقیکردنەوەیە، کە دەبێ پاش جیهان بگەڕێیتەوە بۆ لای خواو پاداشتو سزای کردەوەکانت وەرگرێتەوە. ئەوەش، کە مرۆڤ دەتوانێت سنووری مردن ببڕێت هۆکارەکەی ئەوەیە، کە خاوەنی ڕۆحێکە، ئەم ڕۆحە بەشێکە لە ڕۆحی نەمر(خوا).

لەلایەکی ترەوە "لە ئاییندا خوا ئەو بوونەیە، کە مردن تیایدا شوێنی نابێتەوە...هەروەها مردن بەجێهێنانی وەزیفەیەکی خوداییە کە زیندووبوونەوەی تێدایە، کە مرۆڤ نامرێ و خاوەنی ئەو ڕوحەیە کە زیندوو دەبێتەوە" [٤٧]، کە دەڵێین مرۆڤ خاوەنی ئەو ڕۆحەیە، ئەوا مەبەست ئەوەیە، کە ڕۆحێکی پێدراوە نەمرە، بەواتا ڕۆحی مرۆڤ بەشێکە لەڕۆحی خوا، یەکێك لەخاسیەتەکانی ڕۆحی خواش نەمرییە. هەر لە قورئاندا

شـەهید(کە لەڕێگـەی خـوا دەکـوژرێ) پلەیـەکی بـەرزی پێـدراوەو بەنـەمر پەسنکراوە، دەفـەرموێت مـەڵێن مـردووە ئـەو زینـدووە بـەس ئێـوە هەسـتی پێناکەن[48]. هەر لەم ئایینەدا هاتووە، ڕۆژی مردنی هـەموو مرۆڤێك لەسـکی دایکیـدا دیـاری کـراوە، ئـەو فریشـتەیەی، کـە بەرپرسـە لـە گیانکێشـانو دەمرێنێت[49] ناوی ئیزرائیلە.

ئەوەی گرنگە باسی بکەین ئەوەیە، کە ئایینەکان سەبارەت بەمردن زۆر شـت باسـکراوە بـەڵام نـاکرێ بـەم کورتـە نووسـینە بەسـەرکرێنەوە بـەڵکو پێویستی بەباسی تایبەتی هەیـە، بـەڵام لێـرەدا بـەخێرایی هەنـدێك سـەرنج و باسکراوی تایبـەت بـەمردن، کـە لـەنێو قورئانـدا هـاتووە تۆمـار دەکـەم، بـۆ نموونە:

نەمری بەهۆی سـامانەوە بەدەسـت نایـەتو هـیچ شـتو کەسـێ فریـای ناکەون کارەکانی خۆی نەبێت. لێرەدا دەردەکەوێت نەمری بەدەستدێت بەڵام هەموو مرۆڤەکان ناتوانن بەدەستی بێنن، هاوکات نەمری شتێ نییە بکرڕدرێـت یان بسەنرێت(بەواستەو خزم خزمێنـە)، بـەڵام شتێکیشـە دەکرڕدرێـت، وەلـێ ئـەو پارەیـەی پێـی دەکرڕدرێـت تایبەتـە، لێـرەدا کـرداری چـاك، کـە جـۆرە پارەیەکە لەلایەن مرۆڤی موسڵمانەوە، لـەم دنیایـەدا دەتوانرێـت نـەمری پـێ بکرێت. هاوکات شەهیدبوون لە ڕێگەی خوا، واتە مردن بۆ خوا نەمرییە، وەك چۆن لـە ئـایینی ئیزیەکانیشـدا ئـەوەی بتـوانێ ڕازیبکـات مردنەکـەی جیـاواز دەبێ، لە ئایینی ئیسلامیشدا مردنی شەهید نەمرییە، واتـە مردنێکـی نـەمری هێنەرە، ڕاستە مردووە بەڵام لای خوا نەمرە، چـون ئـەو خـوای ڕازیکـردووە. گرنگە وردبینەوە لە کرداری مرۆڤ کە هۆکاری بەدەستهێنانی نەمرییـە، بـەڵام ئەم کارە دەبێت ڕەنجی شانی خـۆت بێـت، بـەواتا تـەنیا خـۆت، ڕزگارکـەری خۆتیت.

هەروەها کوشتنی نەفسی بەد پاداشتیی هەیە. لەبەرئەوەی نەفسی بەد هۆکاری ڕێگە خراپەیە، ئەو مرۆڤەی دەروونێکی بەدی هەیە دەتوانێ نەفسە بەدەکە بگۆڕێ بە نەفسی چاکەکار، کە هۆکاری بەدەستهێنانی نەمری و ئاسوودەییە، لەزۆرکاتدا کوشتنی ئەم نەفسە وەك کردەی مردنێك وایە، بەڵام مردنێکی پێویستە.

هاوکات وەسیەتکردن پێویستە، واتە کەسێك پێش مردنی وەسیەت دەکات بۆ دوای مردنی. وەسیەتکردن لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێ لە بەشی سێیەمدا هەوڵدەدەم بەسەریبکەمەوە.

هەروەها مردن وەك حاڵەتێکی خودی پەسندەکرێت، کە کەس فریای کەس ناکەوێت. ئەمەش ئەوە دەگرێتەوە ئەوەی کە متمانە بەکەس نەکرێت، مرۆڤ وریا بێت و زوو خافڵ نەبێت، چونکە ئەوەی ڕزگارکەری خودە خود خۆیەتی، کردارەکانی خۆیەتی، هاوکات کەس ناتوانێ من لەمردن فریاد بکات، مردن چارەنووسی هەموو مرۆڤێکە بەڵام چۆن دەتوانین مردن ئاسان بکەین، یان چۆن دەتوانین دڵنیا بین لەوەی پاش مردن نەمری بەدەستدێنین ئەوە شتێکە دەبێ خۆمان بڕوا بەخۆمان بهێنین. هاوکات لە ئایینی ئیسلامدا لە فەرموودەو گێڕانەوەکاندا ئاماژە بەوە دەکرێت، کە کۆتا کار، کە مرۆڤ پاداشتی لەسەر وەردەگرێت مردنە. لەم ئایینەدا باسلەوە دەکرێت، مردنی ئەو مرۆڤانەی لای خوا پلەیان بەرزە مردنیان زۆر نارەحەتە. چونکە خۆشەویستن. لەبەرەئەوەی ڕۆح تەمەنێك لەگەڵ ئەو جەستەیەدا بوو ژیاوە بۆیە ئاسان نییە جیابوونەوە و نارەحەتی دەوێت. خوا دەڵێ تەنیا لەرۆحکێشانی باوەڕداران دوودڵ بووم (خواش دوودڵ دەبێت، لە بڕیاردان)- یکره الموت- هاوکات ڕۆحکێشان کۆتا کاری مرۆڤی موسڵمانە، کە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت. بۆیە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ حەزناکەم ڕۆحکێشانەکەم لەسەر سوکبێت. ڕۆحکێشانی مرۆڤی کەم باوەڕ قورسە تا

ڕۆحکێشانەکەی ببێتە هۆی زیادکردنی چاکەکەی. بەڵام مرۆڤی زۆر باوەڕدار قورسە ڕۆحکێشانی چونکە خۆشەویستە بەڵام ئاسانە بۆ خۆی، واتە لای خوا مرۆڤی باوەڕدار ئاسانە ڕۆحکێشانی بەڵام بۆ خوا کارێکی گرانە، چونکە ئەم مرۆڤەی خۆشدەوێت. بەڵام گەر مردن چاکە بێت بۆ مرۆڤ ئیدی بۆ، بۆ خوا کارێکی گران بێت ڕۆحکێشانی ئەم مرۆڤە لە کاتێکدا بانگهێشت کردنەوەی بێت بۆ لای خۆی. واتە زیاتر نزیک خستنەوەی بێت لە خۆی؟ هەربۆیە دەگوترێت شەهید زۆر ئاسان ڕۆحی دەردەچێت، ئەو کەسەی دەیکوژێت وەك ئەوەی چرنوقێکی لێبیگرێت. هاوکات شایەتمان هێنان ڕۆحدەرچوون ئاسان دەکات.

ئاوات خواستن بۆ مردن تا بە بەهەشت بگەیت، هەروەك ژیانێکی چاك بە ئیزنی خوا پێشمەرجی چونە بەهەشتە. مردن بەکافری سزای توندی هەیە، ئەوانەی بەبێ باوەڕی دەمرن نەفرەتی خواو فریشتەو خەڵکیان بەردەکەوێت.

لەم ئاینەدا ئێمە ئەمڕۆ تێبینی ئەوە دەکەین، مرۆڤەکان زێدەتر بەرژەوەندی خوازن بەرانبەر ئاین، ئەوان زیاتر گرنگی بە بەهەشت دەدەن نەك بە خوا، ئەوان داوای بەهەشت نەك خوا دەکەن، ئەوان کە نزا دەکەن بۆ ئەوەیە، کە خوا بیانخاتە بەهەشتەوە نەك وەك عاشقێ شادیان بکاتەوە.

ژیان لەم ئاینەدا پردێکی پەڕینەوەیە، وەك سەردانکردنێکی خێرا وایە، واتە سەفەرێکە، بەزۆرو بێ هەڵبژاردنی خۆت دەبێ بکرێت و دەشبێت لەم سەفەرە بگەڕێیتەوە، لەکوێوە هاتوویت دەبێ بۆی بگەڕێیتەوە(بەڵام من دەڵێم لەکوێوە نێراویت)، بۆیە گەڕانەوە بۆ ماڵ و بۆ هەوەڵین شوێن گرنگی زۆری هەیە، دەبێ دووروونزیك لەو سەفەرە کورتە بگەڕێینەوە بۆ شوێنی یەکەم، بەڵام ئەم سەفەرە هەروا لەخۆڕا نییە، سەفەرکردن ئامانجێك لەپشتیەتی، کە ئامانجێکی باڵایە، سەفەرکردنی ژیانی خێرا بڕیاردەری

دەستنیشانکردنی ماڵی ئەبەدیە، واتە ئەم گەشتە کورتەی ژیان پێمان دەڵێت تۆ بەهەشت شوێنت دەبێ یان دۆزەخ، واتە پێشمەرجی چوونە بەهەشتو دۆزەخ ژیان یەکلایی دەکاتەوە، لەبەرئەوە هیواخواستن بۆ گەرانەوە بۆ مەنزڵو ماڵی هەمیشەیی لەلایەن مرۆڤی چاکەکارەوە لەقورئاندا پێویستە، چونکە ژیانی بەهەشت ژیانێکی مسۆگەرو هەتاهەتاییە، بەڵام ژیانی سەرزەمین وەك کاروانسەرایە، ڕاگوزەرە.

هەروەها بۆ مردنە جیاوازەکانی وەك ئاژەڵو ڕوەك وشەی جیاوازی لە مردنی مرۆڤ بۆ دانراوە. وەك چۆن لەزمانی کوردیدا جیاکراوەتەوە، کە مرۆڤ نەما پێی بگوترێت (مرد)، ئاواش کە ڕووەك مرد پێی بگوترێ (وشکی کرد)، کە ئاژەڵیش مرد پێی بگوترێت(تۆپی)، هاوکات جیاکردنەوەی مردنو نەمانی زیندەوەرەکان هۆکاری خۆی هەیە، کە دەشێ شا هۆکار پەیوەست بێ بەپیرۆزیو جیاکردنەوەی مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی دی بەگەورەترو بەرێزتر. لەلایەکی دییەوە دۆری مردن گرنگی خۆی هەیە، مرۆڤ لەچ کاتو شوێنێكو لە چ دۆخێکدا بمرێت، هەندێ مردن هەیە، مرۆڤ دەبێ نزا بکات بەو جۆرە نەمرێ، بە نموونە مار پێوەی نەدا، یان لە تەوالێتدا نەمرێ، بەڵکو لە سوجدەدا بمرێ. مردن لە مەککەو مەدینە جیاوازە وەك لە بارێکدا یان لە شارێکی دیدا بمریت. یان مردن لە ڕۆژی هەینی جیاوازە لە مردن لە ڕۆژێکی دیدا... واتە جۆرو شوێنو کاتو دۆخی مردن گرنگی خۆی هەیە.

گەر مردن وەك تاقیکردنەوەی مرۆڤ بزانرێت ئارامی دەبەخشێتو بێدەسەڵاتی مرۆڤو دەسەڵاتی خۆی نیشانداوە لەوەدا، کە مرۆڤ ناتوانێ لەمردن هەڵبێت[٥٠]، مرۆڤ بەردەوام تاقیدەکرێتەوە، دەبێ ئاگامەندانە ژیان بەسەر ببات چونکە ژیان بریتییە لەتاقیکردنەوە، گەر لەم تاقیکردنەوەیە دەرنەچیت بۆ هەتاهەتایە دەکەویت، تەنانەت مردنیش تاقیکردنەوەیە، هەرکات مرۆڤ مردنی وەك تاقیکردنەوە زانی ئیدی ئارام دەبێت، مردن وەك

درندە نابینی، دەبێ ئەوەش بزانین ئێمەی مرۆڤ کەمتوانانین لەبەرئەوە ناتوانین ڕەدی تاقیکردنەوەکان بدەینەوە، ئەوەی گرنگە خۆمان ئامادەی تاقیکردنەوەکان بکەین، بۆ ئەوەی سەرکەوتووبین، چارەنووسی مرۆڤ بەتاقیکردنەوەکانەوە پەیوەستە، لەژیانی ڕۆژانەشدا بەمجۆرەیە، بەلام ئەوەش گرنگە تاقیکردنەوەکان فرەن پێویستە مرۆڤ بتوانێت لە زۆرێك لەتاقیکردنەوەکان سەرکەوتووبێت، بێ هیوا نەبێت. مرۆڤ مەحکومە بە تاقیکردنەوە، مرۆڤ دەبێت، واتە مرۆڤ ناچار بە کردنە، ئیدی ئەنجامی کردنەکە چیدەبێت، ئەوە لە دەسەلاتی ئەودا نییە، وەك ناسر سوبحانی دەڵێت: مرۆڤ توانای کردنو نەکردنی هەیە، واتە چی بکەم و چی نەکەم. بەلام چی دەبێتو چی نابێت ئەوە خوا دیاریدەکات، مرۆڤ بێ دەسەلاتە لەوەی چیدەبێ و چی نابێ، بەلام بەرپرسیاریشە لەوەی دەیکات، واتە بەر چی دەبێو چی نابێ بە چەشنێ ڕەنگدانەوەی چی بکەمو چی نەکەمە. هاوکات مرۆڤ لە تاقیکردنەوەیەکەوە بۆ تاقیکردنەوەیەکی تر جیاوازی هەیە، تاقیکردنەوە هەیە نمرەی زیاتری لەسەرە لەبەرئەوە ئەبێ بزانین تاقیکردنەوەی مردن نمرەیەکی فرەی لەسەرە. مردن یەکێکە لەو دەسەلاتانەی کە مرۆڤ ناتوانێت بیبەزێنێت، گەرچی لاف دەسەلاتی بالا لێدەدەین بەلام لەئاست مردندا لاوازین، هەروەك مرۆڤگەلێ هەن بەهێزن بەلام ئەم مرۆڤانە خاوەن ئیمانێکی پتەون(ئەمە لەئاییندا- بەلام لەبوارەکانی دیدا مرۆڤگەلی بێ ئاینیشمان هەیە، کە ئازایانە بەرانبەر بەمردن دەوەستێ). بەلام نابێ ئەوە لەیادبکەین، کە مردن نابەزێنرێت بەڵکو گرنگە ئازایەنە بەرانبەری بووەستین، مردن ئەو دەسەلاتەیە، کە پێیەکی لەنێو میتافیزیكو پێیەکی لەنێو فیزیکدایە، لەبەرئەوە دەسەلاتی مردن مرۆڤ بەزێنە.

هاوكات لەقورئانـدا پەیوەنـدی نێـوان مـردنو كـات زۆر بـەزەقی دەردەكـەوێت، جگـە لـەوەی شـێوەی جیـاواز لـە مردنـی تێـدا دەبینرێـت... چەندین حاڵەتی تـر لەسـەر مـردن لـە قورئانـدا هـاتووە ئەمـە تـەنیا شـتێكی كەمبوو خستمانە ڕوو، تا وێنەیەكی مردن لە قورئان بخەینە ڕوو.

٣/ مردن لە فەلسەفەدا:

فەلسەفە چییە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە گرانە لەبەرئەوەی پێمواپە هەر فەیلەسووفەو وەڵامی خۆی بۆ ئـەم پرسـە هەیـە، هـەر قوتابخانەیـەكی فەلسەفی یان بەپێی سەردەمە جیاوازەكـان وەڵام بـۆ ئـەم پرسـیارە هەیـە[٥١] "لـەڕووی زمانەوانییـەوە وشـەی فەلسـەفەphilosophy، وشـەیەكی لێكـدراوە لەهــەردوو بڕگــەی (philo)عیشــق،(sophy) دانــایی، واتــا خۆشەویســتی دانایی"[٥٢] فەیلەسـووفە بەراییـەكانی یۆنـان فەلسـەفەیان بـە زانینێكـی بـێ خەوشو زانینێك، كە هیچ سوودێكی مادی نەبێت یان تەنیا ئامانج گەڕان بێت بەدوای حەقیقەتدا داناوە[٥٣] فەلسەفە عەشـقە، عاشـقی ڕاسـتەقینە ئەوەیـە، كە ژیانی بەختبكات لە پێناو زانینی حەقیقەتدا، مەعشوق حەقیقەتـەو دەبـێ عاشق بوێرانە بۆ مەعشوق خۆ بەخت بكات.

كـاری فەیلەسـووف هەوڵدانــە بـۆ پرسـیاركردن لــە بـوونو ماهیـەتی شــتەكان، ڕووداوەكــان، دیــاردەو چــەمكەكان، چــۆنیەتی پەیــدابوونیان، بوونیـان[٥٤] بایـەخی عـەقڵ بـۆ فەلسـەفە زۆر بـەهادارە، كـە زۆركـات وەهـا پێناسـەی فەلسـەفە دەكرێـت وەك"چـالاكییەكی عـەقڵی"[٥٥] هـەروەك لای ماركس فەلسەفەو فەیلەسووف (ئەركی گۆڕینی جیهانـە نـەك لێكدانـەوە)[٥٦] لای ئەرستۆ "فەلسەفە لە واتای بوون دەكۆڵێتەوە"[٥٧]. لای ژیـل دۆلـۆزیش كاری فەیلەسووف و فەلسەفە بریتییە لە داهێنانی چەمكەكان.

مردن له فەلسەفەدا بۆچوونی جیاواز هەڵدەگرێت. هەوڵدەدەم بۆچوونی هەندێکیان زۆر بەکورتی بخەمەروو. ئەفلاتوون پێیوایە ئێمە نازانین مردن چییە، بۆیە نابێت لە مردن بترسین، مرۆڤی بۆ دوو بەش دابەش دەکات"مرۆڤ دەروونەو لەنێو لەشدا دانراوە، لەش دەرەکیو دەروون لایەنی ناوەکی مرۆڤە"[٥٨] هەربۆیە بڕوای بە نەمری دەروون(رۆح) هەیە. دیارە گەر لە وشەی دەروون وردبینەوە، تێبینی ئەوە دەکەین، لە دەرکەوتنو ون پێکهاتووە، دەر(دەرکەوتن) ون(نادیار). واتە دەروون، دیارێکی نادیارە، دەرکەوتەی هەیە، بەڵام خۆی دیار نییە.

ئەفلاتوون بەمجۆرە پێناسەی مردن دەکات(مەرگ لەناوچوونە، واتە کەسێك دەمرێت ئیدی هەست بەهیچ ناکات، یان گواستنەوەی ڕۆحە لە جیهانێکەوە بۆ جیهانێکی تر)[٥٩] لێرەوە ئەفلاتوون مردنو خەون بەیەکدی دەچوێنێت، پێیوایە خەونێکی هەتاهەتایی خۆشیەکی زۆر بە "شا"ش دەبەخشێ نەك بەمرۆڤی ئاسایی. هەروەها گەر مردن گواستنەوەی ڕۆح بێت، ئەوا ئامادەم نەك جارێ چەندین جار بمرم، چونکە جیهانەکەی تر ڕاستەقینەیە نەك ئەم جیهانە، ژیانێکی جاویدانی لەوێ هەیە، هەروەك پێیوایە کەسە چاکەکان نە لە ژیانو نە لە مەرگ خراپەیەك نابینن، چونکە خوداوەند چاوی سۆزیان لێنابڕێت[٦٠]. لەلایەکی ترەوە ئەفلاتوون چەند بەڵگەیەك بۆ نەمری ڕۆح دەهێنێتەوە، کە دکتۆر محمەد کەمال پێنج بەڵگەی دەستنیشان کردووە[٦١] .(پێش ئەوەی بێینە ئەم جیهانەوە شتەکانمان زانیوەو ناسیوە هاتنە ئەم جیهانە لەبیری بردووینەتەوە، واتە ڕۆح پێش جەستە هەبووە، ئەگەر بەلەدایکبوونمان لەمەرگەوە بێینە ناو ژیانەوە، کەواتە پێویستە دوایی مەرگیش ڕۆحمان بمێنێتەوە. بە واتایەکی تر ڕوودانی کەوتنە نێو جەستە زانینەکانمان لە بیرچۆتەوە. بەڵگەیەکی تر دژەکانە، هەمووشتێ لەدژەکەیەوە لەدایکدەبێت، لەزیندوو مردوو دێتە بوون،

لەمردنیش ژیان دێتە بوون، کەواتە دەبێ ڕۆحی مردووەکان لەشوێنێ بن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ژیان)[٦٢] ئەفلاتوون لەزاری سوکراتەوە دەڵێ، کە خوا فەرمانی پێکردووە بەدوای زانستدا بگەڕێت، بۆیە شەرمە لەترسی مەرگ لەفەرمانی خوا لابدات، هەروەك نەزانینی مەرگ چییە، هۆکارێکە کە بۆ ئەوەی مەرگ بە نیعمەتی خوا بزانین نەك بە بەلا[٦٣] سوکرات لەپێناو زانیندا سزای مەرگی بەسەردا سەپێنرا بۆیە دەڵێت(کاتیك مرۆڤ بیەوێت کارێ بکات ئەوکارەی ژیان یان مردنی پێدەبەخشێ)[٦٤]، ئەمە بیرکردنەوەیەکی گرنگە، کە مرۆڤ لە ئەگەرەکانی یان کردەکانی ئامادەیی مەرگی هەبێت، واتە هەر کارێ ئامادەیی مەرگە لەو کارەدا، لەبەرئەوە مرۆڤ بێ بەها بڕیار نادات، ناکات، چونکە بەهای کردەو بڕیارو ئەگەرەکانی کە هەڵیدەبژێرێت هاوتا دەبێت بە ژیانی.

سوکرات، کە لەزینداندایە هاوڕێکانی ڕێگەی بۆ خۆش دەکەن لە زیندان هەڵێتو لەمەرگ ڕزگاری بێت، وەلێ سوکرات دەڵێ(نابێت لەترسی مەرگ خۆم لە یاسا لادەم)[٦٥] بەڵکو سوکرات لە پێناو چەسپاندنی یاساو دادپەروەریدا مەرگ قەبوڵ دەکات دەڵێت "هەڵهاتن لەمەرگ زۆر دژوار نییە بەڵکو هەڵهاتن لە خراپە دژوارە، چونکە خراپە لە مەرگ تیژترە"[٦٦] هەروەها پێیوایە (هەر مرۆڤێك کە ڕووبەڕووی مەرگ بێتەوە دەتوانێت پێشبینی ئاییندە بکات)[٦٧]. دەبینین سوکرات لەبەردەم مەرگدا خۆی ڕەزیل نەکات، بەڵکو دلێرانە ڕووبەڕووی مەرگ دەبێتەوە، چونکە مردن هێندەی خراپە خراپ نییە، بەڵکو مردن نەك خراپە بەڵکو باشەیەو چاکەیە، چونکە چاوو عەقڵی مرۆڤ دەکاتەوە لەوەی پێشبینی بکات.

هەر لە بیریارە کۆنەکان پیتاگۆراس (باوەڕی بە "لاشەگۆڕین" هەیە، ڕۆژێك پیتاگۆراس پیاوێك دەبینێت لەسەگەکەی دەدات، پێی دەڵێت، کە لێی نەدا چونکە ئەو دەروونەی لە لەشی سەگەکەدایە هاوڕێی پیتاگۆراسە)[٦٨].

ئـەم بۆچـوونە زیـاتر ئایینییـە، بـەڵام لای فەلسـەفە بۆچـوونەکان ڕاسـتە هەنـدێجار بـەرگی ئـایینی دەپۆشـن، بـەڵام لـە ناوەڕۆکـدا فەلسـەفین، واتـە ئەفلاتوون، کـە بـاوەڕی بـە نـەمری ڕۆح هەیـە، هاوکـات بەڵگـەکانی بەڵگـەی فەلسـەفین. لەلایـەکی دییـەوە ئەرسـتۆش وەك ئـەفلاتوون بـڕوای بـە دابەشـکردنی مـرۆڤ هـەبووە بـۆ نـەفس و لـەش، وە پێـی وایـە، کـە (نـەفس زیندوویەتی دەداتە لـەش، لەشـیش زیندوویـەتی هەڵدەگرێت)[٦٩]، دەشـێت دەرکەوتەی دەروون لە لەشدا بێت.

بەڵام بەپێچەوانەوە لای دیمکریتس ڕۆح نـەمر نییـە، زیندووبوونـەوەش نییە[٧٠]. لای فرانسیس بیکۆن (زانـین وادەکـات ترسـی مـەرگ بڕەوێنێتـەوەو ئاسانی بکات)، [٧١] لە وەسیەتنامەی بیکۆن نوسراوە "ڕۆحی خۆم بە خـوداو جەستەشم بە نادیاری... دەسپێرم)[٧٢] واتـە بیکـۆن بـڕوای بـە نـەمری ڕۆح و لەناوچوونی جەستە هەبووە. هەروەها لە فەلسـەفەی سـەدەی نۆزدەیەمـدا و بە دیاریکراوی دوای جەنگەکانی ناپلیۆن، مردن زیاتر لە نووسینەکانی هیگـڵ و شۆپنهاوەردا خۆی دەردەخات، گەرچی ڕۆمانتیکەکان بەوە بەناوبانگن کـە "شـکۆ"یان بەخشـیوەتە مـردن، هیگـڵ لـە فینۆمینۆلۆژیـای ڕۆحـدا، لـەو بەشەیدا/ کە تەرخانکراوە بۆ دیالێکتیکی پەیوەندیی کۆیلە و سەردار، ئاوڕی داوەتەوە لە (ترس لە مردن) و (دڵەڕاوکێی مردن) و هەروەها (خۆبـەختکردن لـەپێناوی ئـەوی تـردا). کۆیلـە، کۆیلایـەتیی لـە مـردن پـێ باشـترە. زانینـی ئـەوەش، کـە مـرۆڤ لـە مـردن دەترسـێت بـەس نییـە. دەبێـت ژیـان ببێتـە شوێنکەوتە و پاشکۆی مەرگ. بەڵام – ژیـانکردنی لـەمجۆرە–، خزمەتکردنـە بە کەسێك، کە مرۆڤ لێی دەترسێت و دڵەڕاوکێ دەخاتە دڵی مرۆڤـەوە. بـەبێ ئەم خزمەتکردنە، دڵەڕاوکێ ناتوانێت بوون بگۆڕێت. خزمەتکردنی ئەوی تر و پەیوەستبوونە بەوانی ترەوە، کە مرۆڤ لە دەستی ترسێکی کۆیلەسـاز ڕزگـار دەبێت، کە بیری مردن بەسەر ڕۆحیـدا زاڵ دەکـات.[٧٣] هیگـڵ، مردنـی نـەك

تەنیا لە دیالێکتیکی هێزی نێوان کۆیلە و سەرداردا، بەڵکو لە "دیالەکتیکی عەشق"یشدا شی دەکردەوە: (مردن خودی عەشق خۆیەتی، لە مردندایە کە عەشقی ڕەها خۆی دەردەخات).[٧٤]، گەر عاشق، عاشق بێت، دەبێت

مردنی خۆی لە مەعشوقەدا ببینێتەوە، بەهای ژیانی لە مەعشوقەدا ببینێتەوە. ئەم تێگەیشتنە بۆ مردن، نزیکە لەو مردنەوە، کە ڕۆمانتیکەکانی سەردەمی هیگڵ بڕوایان پێی بوو. بۆ هەندێك لەوان،(مردن جەزب و توانەوەیە لە هەمەکیەتدا (کل). بۆ هەندێکی تریشیان دەستپێکی ژیانی ئەبەدییە کە مەسیحیەت باسی کردووە، بەوجۆرەی کە عارفان و شەهیدانی مەسیحی بڕوایان پێی بوو[٧٥]. دەبینین لای هیگڵ ترس لە مردن دەبێتە زەمینەی کۆیلایەتی، واتە ئەو مرۆڤانەی دەترسن دەبنە کۆیلە، ئەوانەشی ناترسن دەبنە سەردار، بەڵام مرۆڤی سەردار پێویستی بە دانپێدانانی مرۆڤێکی سەربەستە بۆ سەرداریيەکەی، وەلێ ئەو لە نەبوونی مرۆڤی بە باوەڕهێنان بە سەربەستییەکەیدا دەژی، لێرەوەیە جەنگی کۆیلە بەسەر سەرداردا کە هۆشیار دەبێتەوە سەردار دەرووخێنێ. واتە لای هیگڵ مرۆڤ دەکەوێتە جەنگی مان و نەمان لە پێناو دانپێداناندا. نۆڤالیس دەیگوت "ژیان سەرەتای مەرگە، ژیان خۆی لە پێناوی مەرگدایە، مردن هاوکات هەم سەرەتایە و هەم کۆتا"[٧٦]. بۆ زۆرێك لە ڕۆمانتیکەکان مردن هێجگار سەرنجڕاکێش بوو، بۆ نموونە شیلی دەیگوت: (چ سەیر و ستایشئامێزە مردن!). هەروەها مردن بۆ کلایست و هۆڵدەرلینیش هەروا بوو، کە کۆتاییان بە ژیانی خۆیان هێنا. کلایست، لەسەر گۆڕی مەعشوقەکەی خۆی کوشت. ڕەنگە ئەم کارەی بۆ ئەوە کردبێت تاکو نیشانمان بدات کە مەرگ، خودی عەشق خۆیەتی[٧٧].

بۆچوونی شۆپنهاوەر بۆ مردن نەرێنییە، ئەو دەڵێت "ئەوەی لە مردنمان دەترسێنێت، بە هیچ شێوەیەك ئازار نییە، چونکە ئازار دەکەوێتە

ئەم دیوی مردنەوە، ئێمە زۆرجار لە ناو ئازاردا پەنا بۆ مردن دەبەین، هەندێ جاریش بە پێچەوانەوە بەرگەی ئازارێکی بەسوێ دەگرین بۆ ئەوەی لە مردن هەڵبێین[٧٨]. شوپنهاوەر دەیەوێت بیسەلمێنێت، کە (پەیوەستبوون بە ژیانەوە بەهیچ جۆرێ لەعەقڵەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لە ئیرادەیەکی کوێرو نائاگاوە سەرچاوە دەگرێت، دەنا گەر پێشتر لە مرۆڤیان بپرسیبایە ئەتەوێ بێیتە ئەم ژیانەوە ئەوا هەرگیز ڕازینەدەبوو)[٧٩]. بەڵام شۆپنهاوەر لە ڕوانگەی خۆیەوە دەڕوانێت و واقیع و بیرکردنەوەی مرۆڤە سادەکان پەراوێزدەخات، دەنا پێموانییە، مرۆڤەکان لەوە تێبگەن، کە ئازاری مردن دەکەوێتە ئەودیو مردنەوە. هاوکات ڕازینەبوونی مرۆڤ بەوەی، کە پرسی پێبکرایەو ڕازینەدەبوو، ڕوانگەی خۆیەتی، ناکرێ بگشتێنرێت، پاشان نهێنی و گرنگی مردن و ژیان لە پرس نەکردن و لە نەزانینەکەیدایە.

بۆ شۆپنهاوەر عەقڵ ڕووخێنەرە، گەر بە لەعەقڵ بژین ناژین و خۆ دەکوژین، لەبەرئەوەی لەعەقڵ دەزانێت ئەم ژیانە گەمەیەکی بێ مانایە، ئەوانەی دەژین لەعاقڵ نین، بەڵکو بە چاو داخستنەوە دەژین.

لای فرۆید. چەمکی "غەریزەی مردن". لەناو ئینساندا چەند مەیلی خۆنوساندن بەژیانەوە هەیە، ئاواش مەیلی بەجێهێشتنی ژیانیش هەیە. غەریزەی مردن لای فرۆید هێزێکە پێچەوانەی غەریزەی ژیان. ئینسان وەك چۆن هێزی ناوەکی ژیانی تێدایە، ئاواش هێزی مردنی تێدایە. غەریزەی مردن، کە لای فرۆید یەکسانە بە مەیلی تێکشکاندن و وێرانکاری، لە بنەڕەتدا[٨٠] فرۆید گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ساتەوەختی (مەرگ و خۆکوشتن) چیتر هاوشان نییە لەگەڵ ئازاردا، بەڵکو سەرێکی لەناو چێژدایە، وەك چۆن سەرێکیشی لە ناو ژیان و مانەوەدایە. مەرگ ئازاری نییە و لەگەڵ لەزەتدا لە پەیوەندیدایە[٨١]. هاوکات فرۆید (پێیوایە خۆ لادان و تورهەڵدانی مەرگ هۆکارێکە بۆ نامۆیمان لەم جیهانەی ئێستادا، ئێمە بەو هەڵوێستەمان کە

خومان پێوە گرتووە، نامۆبووین، چونکە دەمانەوێت مەرگ لەم ژیانە بکەینە دەرەوە)[٨٢] هەروەك (مردن تایبەتە بە خودی مرۆڤ، چونکە یەکەم بیرکردنەوەی مرۆڤیش لە مەرگ بووە، یان مرۆڤ بەبیرکردنەوە لە مەرگ فێری ئەندێشە بووە)[٨٣]. فرۆید لێکۆڵینەوەی وردی تایبەت بەمردن لە ئایین‌و ئەفسانە کۆنەکان کردووە. لە کتێبی تەوتەم‌و تابۆدا باسی ئەوەدەکات، مردن چونکە خۆی نهێنییە، کاتێ کەسێك دەمرێت، ئەو کەسەش دەبێتە بەشێك لە نهێنی‌و تابوو دەکرێت. تابوش هەم پیرۆزەو هەم ترسناکیشە، لەبەرئەوەی نەناسراوەو خاوەن هێزە. لێرەوە مردن ترسناکە چونکە خاوەن هێزەو نەناسراوە، دەتوانێت مرۆڤ لەناوببات، بۆیە پیرۆزکراوە، واتە مردن ناسیاوێکی نەناسراوە، بە بوونمانەوە لکێنراوەو ناتوانین لێی بکەینەوە، وەك سێبەرەکەمان وایەو لێمان نابێتەوە، سێبەرێکە هەمیشە دەمانترسێنێ، چونکە ناشیناسین، لێی دەترسین، پیرۆزی دەکەین. مردن ئەو نزیکەیە، کە لە رووی ناسینەوە زۆر دوورە لێمانەوە، ناتوانین بیبەزێنین، ئەو ئێمە دەبەزێنێت، بانترە لە ئێمە، چەند بانگەشەی ناسینی دەکەین وەلێ نایناسین. تابۆ ئەو شتانەن، کە دەبنە هۆی ترس‌و دڵنیگەرانی مرۆڤ، هۆو مەبەستی دەرکەوتنی تابۆش ڕەهەندێکی نەستی هەیە. فرۆید شیکاریی مردنی پەیوەست کردووە بە نەستەوەو لە ڕوویەکی سایکۆلۆژییەوە لە مردنی ڕوانیوە.

یەکێکی دی لەفەیلەسووفەکان، کە بە چڕیێ باسی مردنی کردووە، کە دەکرێ بگوترێت لەمێژووی فەلسەفەدا هایدیگەر یەکێك بووە لەو فەیلەسووفانەی مردن پانتاییەکی فراوانی نووسینەکانی داگیرکردووە، بۆیە ناکرێت بەکورتی بیری ئەم فەیلەسووفە بۆ مردن نەخەینە ڕوو. هەرچەند ئەستەمە بەبێ تێگەیشتن لە فەلسەفەکەی بتوانین لەمردن بگەین، چونکە مردن وەك پێشمەرجێك وایە بۆ بوونی مرۆڤ، هەروەك بوون لێرەو نیگەرانی،

بوون لەگەڵ ئەوان...پێشمەرجن بۆ مرۆڤ(دەزاین)*، "بوون بەرەو مەرگ" پێشمەرجێکە. لای هایدیگەر مرۆڤی ڕەسەن‌و نارەسەنمان هەیە، کە مردن بۆ هەریەکەیان جیاوازە.(ئەوەی ڕەسەنانە بڕوانێتە مردن، ئەوا مردن بەراستییەکی بوونی خۆ دەزانێت، کە تیایدا دەژی، دەزانێت ئەم وەك خودێك مردن ئەزموون دەکات، واتە ئەم دازاینە لە چاوەڕوانی بڕیاردانێکدایە بۆ مردنی، مردن شا ئەگەری بوونییەتی، کە دەبێ چاوەڕوانی لێی هەبێت‌و بڕیار بدات، بەڵام ڕوانینی نارەسەنانە بۆ مردن ئەوا مردن لەدەرەوەی بوونیاندا پەیدابووە، هەروەها دەزانن کە دەمرن، چونکە خەڵکی تر دەمرێت)[٨٤] بەواتا مردن بەدابڕاو لەخۆیان دەزانن، لەکاتێکدا مردن بەبوونیانەوە وابەستەیە، مردن جیا نییە لە من، مردن وەك کۆتا ئەگەری بوونی منە، چون بەمردن گشت ئەگەرەکانی بوونی من تەواو دەبێت، دوا هەڵبژاردنی من لەجیهاندا مردنمە، هەربۆیە وەك دوائەگەر مەحکومین بەوەی خۆمان بین، مردنێکی ڕەسانانە بمرین، خۆمان بمرین نەك ئەویدی، واتە لەڕوانینی دەرەوەی دازاین بڕوانینە مردن، مردنی منە هی تۆیە نەك ئەوانە، هەر مرۆڤێك دەبێ ئەزموونی مردنی خۆی بکات، چونکە مردن تاکە ئەزموونێکە کە ناتوانین نەیکەین، ئیدی بۆ دەبێت ئەم ئەزموونە لەڕوانین لە مردنی ئەوانیدی(نارەسەنانە) هەڵبژێرین. بۆ هایدیگەر مردنی دازاین دەبێتە هۆکاری گەیشتن بە سەرجەمی بوون. نیگەرانی مرۆڤ بۆ مردوو تەنانەت پاش مردنیشە، چونکە مامەڵەی مرۆڤەکان لەگەڵ لاشەکەدا نیگەرانی تێدایە. دازاین کاتێ لە مردن هەڵدێت خۆی وندەکات لەنێو ئەوانیدی‌و مێژووی جیهاندا، چیدی ئەم دازاینە خۆی نییە، خاوەنی مێژووکاری خۆی نییە. دازاین ئەو بوونەیە، کە نە لەدایکبوون لە ڕابردوویدایەو نە مردن دوورە لێی بەڵکو لە بوونیدایە، واتە مردن‌و ژیان دوورو نزیکی نییە، بەڵکو لە بوونیدایە. مردن بۆ کەسی ڕەسەن دەرچوون‌و بڕانەوە نییە لەم ژیانە، بەڵکو

کۆتاییهێنانە بە ئەگەرەکانی بە هەڵبژاردنو بڕیارەکانی، بە بوونی. لێرەدایە گرنگی هایدیگەر بۆ تێگەیشتن لە مردن دەردەکەوێت، کە مردن بە دابڕاو لە بوونی دازاین نابینێت. دازاین بوونێکی فڕێدراوی هەیەو بێ ناوەڕۆکە دەبێت ناوەڕۆك بۆ خۆی ساز بکاتو بەسەرجەمی بوونی بگات. واتە دەزاین خۆی بوونی خۆی سازدەکات، بوونێکی بەسەردا سەپێنراوی نییە، جووڵاندنی دازاین لە نێو ژیانو مردنیدا مێژووکارییە، واتە خۆی مێژووی خۆی سازدەکات، لەبەرئەوەیە، کە دازاین دوودڵە لە بڕیاردان، چونکە هەر بڕیارێ نەرێکردنی ئەوانیترە، هاوکات، بڕیار بڕیاری بوونە، نەك بڕیارێکی لاوەکی، بەڵکو بوونی ئەم دازاینە لەسەر ژیانی بڕیاردەدات.

دەزاین بۆ بوونی خۆی دەبێت بە کۆتایی، چونکە مرۆڤ کە دەمرێت باسیدەکرێ وەلێ ئەم خۆی لێرە نییە. واتە مردن هی دازاینە بە تەنیا هی کەسی دی نییە. دازاین تا لێرە بێت، هێشتا نەبووە، واتە دازاین بوونە لێرە(بوون لە جیهاندا)، کاتێ دەمرێ چیدی لێرە نییە، بە تەواوکۆیی دەگات، تا نەمردووە هێشتا نەبووە بەوەی دەبێت ببێت، چونکە ئەگەری دی لە پێشە، بەڵام کە مرد چیدی ئەگەری دی نامێنێ. دوودڵیو نیگەرانی دازاین مردن بە دیاردەخات، واتە نادیاری مردن لە نێو دوودڵیدا بەرجەستە دەبێت، دڵێك لێرەو(رانەبردوو) دڵێك لای ئەوەی نەبووە(داهاتوو) واتە دوودڵی ڕوو لە داهاتووە. لەبەرئەوە لای هایدیگەر دوودڵی هەوڵی بڕیاردانە، ئاماژە بۆ نەبوونێکی دیاریکراو دەکات، کە ئەو نەبووە دازاینەو لە بناغەوە فڕێدراوە بۆ نێوە مردن، واتە بوونێکە ڕووەو مردن، چونکە بوون لە جیهانداو توانایی بۆ بوون گەورەترین ئاماژەی مردنی لە خۆدا هەڵگرتووە. مردنی دەزاین لە پەیوەندی بەدەرەو هاوکات وازلێنەهێنراوە، ناتوانین وەك ئیشێك دەستی لێهەڵگرین. دازاینی ڕەسەن دڵنیابوونی لە مردنی بەکاتێکی نادیاریکراوەوە بەستراوە، وەلێ مردنی دازاینی نارەسەن خۆی ون دەکات لەنێو ئەوانداو

کاتەکـــەی دیـــاری دەکات(دیـــارکراوێکی نادیـــاریکراوە)، دڵنیایـــەکی نـــا دڵنیاو(دڵنیایی نادروست)و ڕاکردوو خۆی بزردەکات، بـۆ ئـەوەی ڕووبـەڕووی خۆیو مەرگی خۆی نەبێتەوە، وەك دەڵێ لەگەنجییەوە بۆ پیریو لە پیریەوە بۆ مردن. بۆ ئەوان مردن ڕوودەوە، ڕووداوێکی دڵتەزێنە، هایدیگەر وتەنی لـە گوتاری لە کارکەوتوو، ئالۆزو ڕاڤەی ڕۆژانەدا بەرجەستەی دەکەن، مـردن بـە دەقەو کاتژمێر دەبینن(هێشتا کاتی مردنی نـەهاتبوو)، نـەك وەك ئەگـەرێکی حەتمی بزانن، چونکە بۆ دەزاینی ڕەسەن ئەو دەمەی دەزایـن پەیـدادەبێ بـە تەمەن گەورەیە بۆ مردن. لەم مردنـەدا تایبەتمەنـدی نـامێنێ. مـردن دەبێتـە شتێکی دەرەکـی، وەك شـتەکانی دەرەوە لێـی دەڕوانرێـت، یـان مـردن وەك ئەوەی لە دەرەوە بەسەر دازایندا درابێتو بە ئەگەری بوونی خـۆی نازانێـت. ئەوان ئارامی بە یەکدی دەبەخشنو دڵنەوایی یەکدی دەکەن بەوەی لە کـاتی مردندا یەکتری بەجێناهێڵنو ئاگایان لەیەکتر دەبێـت، هـەموویان پێکـەوە لـە یەك جەبهەدا دەمرن(هەموومان دەمرین).

ئەوان دوودڵی دازاین بۆ ترس لە مەرگ دەگۆڕن. لای ئەوان مادام هەموو هەر ئـەمرین پێویسـت ناکـات بـیری لێبکەینـەوەو دەبـێ ئاسـایی وەریگـرین، ئەمەش نامۆبوونی لێدەکەوێتەوە، کە پاشـان کـەوتنی دازاینـەو ڕاکردنـە لـە مـردن. واتـە ئـەوان بـە نێـوی باوەشـکردن بـە مەرگدا لـە مـەرگ هەڵـدێن، بەڕووکەش دەڵێن مەرگ هیچ نییە، وەلـێ هەمیشـە لێـی ڕادەکـەن.(بۆ زیـاتر تێگەیشتن لە بۆچوونەکانی هایدیگەر کتێبی "بوون و کات"ی بخوێننەوە، کە د.محەمـەد کـەمال کردوویـەتی بـە کـوردیو لـە دەزگـای سـەردەم چـاپی کردووە).

هـەر سـەبارەت بـە بۆچـوونەکانی هایدیگـەر دکتـۆر محەمـەد کـەمال بەمجۆرە ڕاڤـەی دەکـات (یەکـەم، بـوونی مـرۆڤ ڕەوتێکـی دینامیکیـە بـەرەو کۆتایی. دووەم، گەیشتن بەو کۆتاییە بوونی مرۆڤ پڕوتەواو دەکات، لەهەموو

پرۆژەکانی داهاتووی ڕوتدەکاتـەوە، چییەتی مـرۆڤ بەگەیشـتن بـەم کۆتاییـە پێناسدەکرێت. سێیەم، کۆتاییهێنان بە مـرۆڤ هەمیشـەییە. چـوارەم، لەگـەڵ گەیشتن بە کۆتایی، مرۆڤ هیچ پەیوەندی بەجیهانو کەسانی دییەوە نامێنیو خۆی بەتەنیا دەبێتە خاوەنی ئەو ئەزموونە. پێنجەم، مـرۆڤ لەراسـتی بـوونی بەرەو کۆتایی دڵنیایە، واتە مـردن لایـەنی نـەبوونی ئـەم بوونەیـە)[85] بـەواتا بوونی مرۆڤ لەگۆڕاندایە، وەسـتاو نییـە، لـە نەبوونـەوە بـۆ بـوون پاشـان لـە بوونەوە بۆ نـەبوون، واتـە مـرۆڤ، کـە دێتـە بـوون، بوونـە ڕووەو مـەرگ. لای هایدیگەر مرۆڤ، کە بەناتەواویـەوە فڕێدرابێتـە نـاو بوونـەوە، واتـە مـرۆڤ وەك هەبووەکانی دی نییە پڕو تەواو بێت، وەك شتەکان نییـە کامـڵ بێـت. بـەڵکو بونێکە ناتەواوە، ئەو جەوهەرێکی پێشینەی نییە بـە هەڵبژاردنـەکانی بـوونی خۆی تەواو دەکات، ئەو دنیایەك ئەگەری لەپێشە، وەك چـۆن ئەمـە ئەگـەری منـە ئـەم نووسـینە بنووسـم، بابـەتێك هەڵبـژێرم بـۆ نووسـینەکەم، ئەمـە ئەگەرێکـە لەئەگـەرەکانی ژیـانم، دازایـن، کـە منـە بوونێکـە هەڵدەبـژێرێت، بەواتایەکی دی گریمانەی پڕی مـرۆڤ، مـرۆڤ لـەناودەبات، مـرۆڤ بـە مـردن پـڕ دەبێت، کامڵ دەبێت. مرۆڤ پرۆژەی هەیە تا لە ژیاندا بێت، بەڵام مـردن وەك دووا ئەگەرو پرۆژەی منە، بەڵام ئایا دەکرێ مردن بە پرۆژە بکرێ؟

(دکتۆر محەمەد کەمال بۆچوونێکی جیـاوازی هەیـە لـەم بارەیـەوە، کـە گرنگـە خوێنـەر بگەڕێتـەوە سـەر کتـێبی بـوون و داهێنـانی نووسـەر). مـرۆڤ ناچـارە بمرێـت، ناتوانێـت نـەمرێت، مـادام مـن هـەم دەبـێ بمـرم، بـەبوونم لەجیهاندا ناچارم بمرم، واتـە مـن نـاتوانم مـردن هەڵنەبـژێرم. بـەمردنم ئیـدی دابڕان ڕوودەدات لەنێوان من و جیهان چیدی من لێرە نیم، چوون لێرە بوونی مـن ئەوەیـە ئاگامەندانـە بێـت، نـەك ئـەوەی بـەمردووی لەگۆڕسـتاندا بم لـەم جیهانە، چیدی من لەگەڵ ئەوانیدی نـاژیم، چیـدی مـن نیگـەرانی ئەوانیـدی و جیهـان نـیم، لەبەرئەوەشـە، کـە مـن ئـەزموونی مـەرگی خـۆم دەکـەم نـەك

ئەوانیـدی، خـۆمم دووا ئـەزموونی خـۆم ئەنجامـدەدەم. هاوکـات مـرۆڤ لـەم ڕاستیە ئاگادارە، کە بوونە ڕووەو مەرگ، دڵنیایە ئـەم بوونـە بـەرەو نەبوونـە واتـە ئـەوەی ئێمـە دەڵـێین مـردن لەحزەیە(سـاتە) ئەمـە لای هایدیگـەر ناڕەسـەنانەیە چـونکە دازایـن لـەدەمی فرێـدانی بـۆ ئـەم دنیایـە دڵنیایـە ڕوو لەکۆتایە. (دەشێ مرۆڤگەلێکی ئیماندار-بڕواداری ئایینی لەگـەڵ زۆرێـك لـەم بۆچوونانە نەبن). بەڵام هایدیگەر بوونگەرانە لە مرۆڤ ڕووەو مەرگی ڕوانیـوە. هاوکات هایدیگەر مردنـی ڕەسـەنانە جیـا دەکاتـەوە لـە مردنـی ناڕەسـەنانە. ئـەوەی ئێمـە دەڵـێین "مـردن حەقـە- هـەمووومان مردنـێ قـەرزارین..." تـا ڕادەیەکی زۆر دەربڕینێکی ناڕەسەنانەیە بە قەولی هایدیگـەر، چـونکە مـردن شا ئەگەری "دەزاین"ە، واتە مردن کارێك دەکات ببمـە خـۆم."مردن شـتێکە کە هەر دەزاینە بۆخۆی پێویستە لەکاتێکدا ئـەزموونی بکـات"(٨٦). هـەروەها دڵەڕاوکێ بەرانبەر مەرگ بەرەو ڕەسەنایەتیمان دەبات، وەلێ ترس لە مـەرگ ناڕەسەنییە چونکە ترس ترسە لەشتێکی دیاریکراو بەس دڵەڕاوکێ بابـەتێکی دیاریکراو نییە، ئەوە ناڕەسـەنییە هـەڵێیت لـە ئەگـەرەکانی خـۆت، هـەروەك لەڕێی مردنی ئەوانیدیەوە بزانیت مردن هەیە وەك واقعێك بڕوانیتە مردن نـەك وەك ئەگەرێك. دڵەڕاوکێ یـان نیگـەرانی ڕەسـەنانەیە چـون پرسیارسـازە بـۆ دازایـن، مرۆڤـی هۆشمەنـد نیگەرانـە لـەوەی ئـەم کۆتـا ئەگـەرە هـەلی بـۆ دەرەخسێنێ تا لەبارەی بوون بەگشتی پرس بکات، واتە نیگەرانی وا لە مرۆڤ دەکات بوون بەگشتی لا ببێتە کێشە. ئەو دەربڕینانەی سەرەوە دەربڕینن لە دیدی ئەوان بـۆ مـردن، وە مـردن شـتێك بێـت هـی مـن نـەبێت، کـە بـە"کۆ- هەمووومان"قسەدەکات."مردن حەقە" وەك ئـەوەی ناسـینی مـردن لەڕێگـەی ئەوانیدییەوە، یان ئاساییکردنەوەی مردن، بۆ ڕەوینەوەی ئەو ترسـەی هەیـە لەمردن، یان بۆ دڵدانەوە. ئەم دەربڕینانـە گوزارشـت لەدیـدی ئـەوان دەکـات نەك منی ڕەسەن، هەر بۆیە ئـەم دەربڕینانـە بۆتـە دەربـڕینی گشـتی هـەموو

ئەوان[٨٧]. بۆیە ناتوانین مەرگ بە لەحزە یان ڕووداوێك بزانین لە ژیاندا. هەر لەبەر ئەمەش، بە ڕووداوی کۆتایی ناژمێردرێت، چونکە مەرگ، بوونیادی ناوەکیی وجودی ئێمەیە. دازاین دەمرێت بەڵام حەیوان نامرێت. مەرگ لە هەر ساتێکی بوونی دازایندا ئامادەیە. ڕووداوێك نییە لە داهاتوودا، کە دوور بێت لە دازاین و بە هەڵکشانی تەمەنی ئەگەری ڕوودانی زیاتر ببێت، ئەوان فێرن بەمجۆرە لەمردن بروانن، بەڵام دازاین بەکۆتا ئەگەری خۆی دایدەنێت[٨٨].

هەروەك بۆچوونی سارتەریش بۆ مەرگ ئەوەیە، کە مەرجێکی ناچارەکییە بۆ ئازادی و هەڵبژاردنی مرۆڤ. ئەوە مردنە مانا دەبەخشێتە ئازادی. لەلایەکی ترەوە، مادام مەرگ دەکەوێتە ئەودیوی سوبژێکتیڤیتەی منەوە، ئەوا لە سوبژێکتیڤیتەی منیشدا هیچ جێگەیەکی نییە.[٨٩]. بە واتا مردن بۆ سارتەر سنوورە، سنووریش دوو سەرە(سەرەتاو کۆتایی هەیە)، مردن پرۆسەیەکەو تا ڕادەیەکیش مانا بەخشە بە پرۆسەکە، واتە دووا بەشی گۆرانییەکە، کە هەمیشە بە بێدەنگی کۆتایی دێت، ئەو بێدەنگییە واتا بەخشی دەنگەکەیە، واتە مردن وەك دوابەشی گۆرانییەکە واتا بە ژیان دەدات، لەبەرئەوە مردن ڕووداوێکی نائاسایی و نامۆ نییە بەشێکە لە زنجیرەکە، بەڵام ئایا ئەمە نابێتە بڕوای خراپ؟(کە مردن دەکەوێتە کۆتایی تەمەنەوە-کۆتایی گۆرانییەکەوە) بڕوانە (کتێبی سارتەر، بوونو نەبوون، لە وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال. دەزگای سەردەم لاپەڕ ٥٢٨). سارتەر بڕوای وایە، مردن ئەگەری من نییە، بەڵکو ئەگەری لەناو بەری ئەگەرەکانمە. واتە دژی دیدی هایدیگەرە لەوەی مردن ئەگەری منە، بەڵکو مردن فاکتۆری هەڵکەوتووی منە، کە لە من ڕادەکاتو لەبنەڕەتیشدا سەر بە فاکتۆری بوونمە، کە نەدەتوانم مردنم بدۆزمەوە، نە دەشتوانم چاوەڕوانی بم، واتە نەناسراوە، مردنو لەدایکبوونمان فاکتۆری ڕووتنو لەدەرەوە بەرەو بوونمان

دێنو ئێمەش دەکات بە شتێکی دەرەکی. بەڵام مردن لە سنوورەکانمان ڕزگاردەکات.

سارتەر بڕوایی وایە مرۆڤ ڕووبەڕووی ئەو شتانە دەبێتەوە کە مرۆڤانەن، لەبەرئەوە مردنیش مرۆڤانەیە، هەرچەند سنوور دانەرە لەبەرانبەر بڕیارە مرۆڤانەکانماندا. هاوکات مردن تەنیا ڕووداوێکی مرۆڤانە نییە، بەڵکو مردنی تاکەکەسی منیشە، واتە مردن ژیانی تاک دەکاتە شتێکی تایبەتی، واتە ژیانی تاک وا دەردەخات کە جارێکی دی ناگەڕێتەوە، لەبەرئەوە لە ژیانو مردنم بەرپرسم. نەك لێپرسینەوە لە مردنەکەی بەڵکو لە بڕانەوەی ژیانم. مرۆڤ لەگەڵ مردن لە کێبەرکێدایە، لەبەرئەوەی مرۆڤ لە مردندا سەربەست نییە، بەڵام مەرگدارێکی سەربەستە. واتە مردن هەمیشە لەودیو خۆیەتی منەوەیە، واتە ناکەوێتە ناو خۆیەتی منەوە.

هاوکات جێگەی خۆیەتی بۆچوونی دکتۆر محەمەد کەمال پسپۆری بواری فەلسەفە لەبارەی مردنەوە بزانین، کە بۆچوونێکی گرنگی هەیە. ئەو پێیوایە (مرۆڤ بوونێکی کاتی هەیە... لەبەرئەوەی هەیە دەبێت بمرێت، ئەم (کات)یەتی بوونە شێوازێکی مێژووی بە بەری مرۆڤدا دەکات، بۆیە هەوڵدەدات خۆی بەدوا پلەی گەشەکردن بگەیەنێت)[٩٠] هەروەها پێیوایە مردن ڕووداو یان گونجاو نییە بەڵکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجییە، هەربۆیە بڕوای بەو جیاکاریە نییە، کە مرۆڤ بۆ گیانو جەستە دابەش دەکەن، دەڵێت مرۆڤ، کە مرد ئیدی تەواو خۆ ئاگرو باران نییە جارێکی دی سەرهەڵداتەوە بۆیە دەڵێت "ئەگەر (مردن)جەستە گۆڕین یان دەرچوونی گیان بەرەو جیهانێکی بەرزتر بێت، ئەوا بەمردن دانانرێت... دەبوایە شوێنکەوتوانی ئەم ڕێچکەیە زاراوەیەکی دیکەیان بۆ مردن بدۆزیبایەتەوە، چونکە چەمکی "مردن" بە چەمکی "نەبوون"ەوە بەستراوەتەوە"[٩١]. سەبارەت بە زانین لەبارەی مردنەوە دەڵێت(یەکەم، مردن لە گومان بەدەرەو شتێکی زانراوە،

"من هەر دەبێ بمرم" ئەمە خۆ سەفەرکردن نییە من پەشیمان ببمەوەو بڵێم نارۆم. دووەم، نەزانراوە، چونکە مردن هێشتا ڕوویندەداوەو تووشی نەبووم. کاتێك ڕودەداتو دەمرم، ئیدی من نابم تا لەواتای ئەزموونەکەم، کە مردنە بکۆڵمەوە بزانم چییە، مردنی کەسانی دیش زانینمان پێنابەخشێ چونکە ئێمە لەدەرەوەی ئەو ئەزموونە وەستاوین)[92]. بۆ ئەو، (مردن و ژیان دوو ڕووی پێکەوە بەستراوی ڕاستیەکن، بوونی مرۆڤ نەبوونیشە، لە یەکەم ساتی بوونەوە نەبوونی هەوڵی داگیرکردنی بوون دەدات، بۆیە بوون لەژێر دەسەڵاتی نەبووندا هەوڵی خۆ تەواوکردن دەدات، لەبەرئەوەی مردن پەیوەندی ناوەکی بە بوونەوە هەیە، بۆیە خەسڵەتی خۆیی بە ئەزموونی مردن دەداتو لەبابەتگەری دووری دەخاتەوە)[93].

ئێستا بۆچوونی یەکێك لەبیریارە فارسەکان دەخەینە ڕوو، کە زیاتر دیدە ئایینییەکە زاڵە بەسەریدا ئەویش بۆچوونی "عبدالکریم سروش"ە. سروش پێیوایە(ئێمەی بوونەوەر نەمرو جاویدانین، بەڵام نەمریمان لەگەڵ بەشێك لە لەناوچوون تێکەڵە، واتە بەشێك لەتەمەنمان لەم جیهانە دەگوزەرێ، بەشەکەی تر، کە ژیانێکی ئەبەدیە لەجیهانەکەی تر. ئایینەکان بۆ ئەوە هاتوون کە ڕێنیشاندەربن بۆ ئەم ژیانەو ژیانەکەی دی)[94] هەروەها پێیوایە (ئێمەی مرۆڤ نەمرین بەڵام ئاژەڵان نەمر نین، هەربۆیە ئەوان لەم ژیانەدا ئەرکیان لەسەر نییە، لێپرسینەوەشیان لێناکرێت، بەڵام چونکە مرۆڤ ئەرکی لەسەرە ئەوا لێپرسینەوەشی لێدەکرێت، هاوکات ئێمەی مرۆڤ جەستەمان شوێنکەوتەی نەفسمانە، بەڵام ئاژەڵان بەپێچەوانەوە)[95]. ئەم دیدەی سروش کە دەبێت بمرین بۆ ئەوەی نەمرین، واتە ژیانی ئێرە پردێکە بۆ ژیانێکی ئەبەدی، چونکە مرۆڤ ئەرکو لێپرسینەوەی لەسەرە.ئایینەکانیش ڕێنوێنی کەرن بۆ ئەبەدیبوونمان.

زۆر بەکورتی بۆچوونی ئیمیل سیوران دەخەینە ڕوو، سیوران پێیوایە "تراژیدیای ژیانی مرۆڤ لە مردنەکەیدا نییە، بەڵکو لە لەدایکبوونەکەیدایە"[96] سیوران لەبووندا هەست بەنامۆییەکی سەخت دەکات، دەڵێ هەموو ئایین و فەلسەفەکانیش بۆ ڕەوینەوەی ئەو نامۆییە هاتونە بوون. سیوران هەموو ژیانی لەتێڕامان لەمەرگ بردۆتە سەر، شیشرۆن دەڵێت، ژیانی فەیلەسووفەکان وردبوونەوە لەمردن زیاتر شتێکی دی نییە، سیوران دەڵێت قەیرانی مرۆڤ خودی مەرگیشی تێپەراندووە، لەبەرئەوەی ئێمە بەلەدایکبوونمان چیمان لەدەستداوە بە مردنیشمان هێندە لەدەست دەدەین[97]. واتە سیوران فەلسەفە بە فەلسەفەکردنی مەرگ دەبینێ، هاوکات سیوران پێیوایە مردن خراپەکە نییە، بەڵکو خراپەکە ئەوەیە، کە لەدایکبووین، دەبوو لە بنەرەتەوە لەدایکنەبین. کارەساتی لەدایکبوون پێشمەرجی کارەساتێکی دیکەیە، کە مردنە.

بەبۆچوونی فەیلەسووفێکی پۆست مۆدێرن کۆتایی بە باسی مردن لە فەلسەفەدا دێنم. ئەو فەیلەسووفە "ژاك دێریدا"ە. ئەو پێیوایە مردن پەیوەندییەکی پتەوی بە بەرپرسیاریەتیەوە هەیە، هەروەها مردن شتێکە دەدرێت یان دەبەخشرێت بەگشت ئەویتر، ئیدی ئەو دانە شێوەی جیاواز وەردەگرێت. هەروەها لای دێریدا ڕەوشت شتێکە، کە لەبەرپرسیاریەتی هەڵدێ، هەروەها ئەرکێکە، کە ڕەوشت قوربانی بەرەوشت بدا، گەر سەیری لەخاچدانی مەسیح بکەین یان چیرۆکی کردنە قوربانی ئیسحاق لەلایەن ئیبراهیمی باوکیەوە، کە ئیبراهیم، ئیسحاق دەبەخشێت بۆ خودا، ئەمەش بەرپرسیاریەتی ئیبراهیمە بەرانبەر بە خوا(گشت ئەویتر)[98]. هەروەها پێیوایە (مەرگ شتێ نهێنییە. بۆ نموونە هۆلۆکۆست مەرگێك بوو بە زۆر دەدرا، وە ئازاد نەبوون لە ڕەتکردنەوەی ئەم دانە. مادام مەرگ دانە، ئەوا

دەبێ وەرگر هەبێت، وەرگریش مەرگ وەردەگرێت، ئەگەر مەرگ پێدراوبێت ئەوا ژیانیش پێدراوە.

واتە مەرگ نهێنییەکی دیارە وەك ڕۆژی نیوەڕۆ، بۆ نموونە زیندەبەچاڵکردنی کوردەکان، مەرگێك بوو بە زۆر بە کوردەکان دەدرا، ئازاد نەبوون لە وەرنەگرتنی، واتە مەرگ لێرەدا لە خۆی نامۆکراوە، چونکە کەسانێك مەرگ دەدەن، واتە مەرگیان ڕامکردووە، واتە مەرگ ڕامکراوێکی ڕامنەکراوە، ئەوانە ڕامیان کردووە، بەڵام ناتوانن خۆشیان لێی ڕاکەن، بەعسییەکان نەیانتوانی لە مەرگ هەڵبێن.

بەڵام گرنگە بپرسین چییە مەرگ شیاودەکات؟ خوا یان کەسێ یان شتێ؟ هەروەها ئێمە ئازاد نین لەرەتکردنەوەی مردن، بۆیە مردن دێتو خۆی دەسەپێنێت، باشتر وایە هەریەکەمان لەچاوەروانی مەرگی خۆماندا بین، چون جێگۆڕکێ بەمەرگی کەسمان ناکرێ، هەروەك کوردەواری خۆمان نزیك لەم بۆچوونەوە، کە ئێمە دەتوانین ئەمەی لێ هەڵێنجین، هەرچەند بۆ مەبەستی جوداتر وتراوە، دەڵێ(کەس ناچێتە گۆڕی کەسەوە)[99]. سەبارەت بە ترس لە مەرگ دێریدا پێیوایە (ترسو لەرزین هەیە، بەڵام ئەوە چییە دەمانخاتە لەرزین، (خوا–مەرگ)ە، چونکە هەندێ دۆخی تایبەتی نەبێت کەس ئامادە نییە بمرێت، چونکە مردن میوانێکی زێدە ئازیز نییە، هەروەها لە بوونی مردنیشدا زۆردارییەك هەیە، چونکە مەرگ هەڕەشە لە بوونمان دەکات)[100]. بە واتا دێریدا بە جۆرێ ناسنامەی هەیە، ڕژێمی بەعس مەرگی دەدا بە کوردان چونکە کوردبوون.

جێگەی گرنگیە باسی ئەوەشبکەین، کە دێریدا (مەرگ بە هاوواتا دادەنێت لەگەڵ خوا. دەکرێ بپرسین چۆن؟ خوا لای دێریدا نهێنییە، نەناسراوەو شاراوەیە. هەروەها مەرگیش هەمان شتە نهێنییەو نهێنی پارێزیشە وەك چۆن لەزمانی کوردیدا دەگوترێت مەگەر گڵ لێم ببیستێ، واتە

کاتی پاراستنی نهێنییەك ئەمە دەگوترێت. هاوکات خوا بەوجۆرەی دەیەوێ ڕەفتاردەکاتو بۆ چۆنییەتی ڕەفتارەکانیشی پرسیار لە ئێمە ناکات، هەروەها هۆ بۆ ڕەفتارەکانیش نادۆزێتەوە واتە بەپێچەوانەی مرۆڤەوەیە، وەئەگەر خوا وانەبوایە(ئەو خەسڵەتانەی نەبوایە ئەوا خوا نەبوو)، هەروەها مەرگیش هەمان خەسڵەتی هەیە، هەروەها خوا نهێنییە هەر بۆیە بێدەنگیشە، ناسنامەی مەرگیش لوغزو نهێنییەکەیەتی، کە کەی بیەوێ ئەوکاتە دێ)[101] دیارە دێریدا جیاواز لەبۆچوونەکانی تر، باسی لەخودی مەرگ کردووە، نەك ئەوەی مەرگی مرۆڤ، واتە دەبێ جیاوازی بکەین لەنێوان مەرگ خۆی چییە، لەگەڵ مردن بۆ مرۆڤ چۆنەو چییە، ئەمە خاڵێکی جەوهەرییە، کە جیاوازی بکەین لەنێوان مردن خۆی لەگەڵ مردن بۆ مرۆڤ. هەروەها دێریدا پێیوایە (هەر منێك بەرپرسیارە لە مەرگی خۆی. مەرگ هەیەو هەر یەکجاریش دێ، مەرگ قەرزناکرێو جێگۆڕکێشی پێناکرێت، مەرگ نادیموکراسیترین دیاردەیە لەبوونا، ئێمە ناتوانین مەرگ بووەستێنین، ئەوەی وەستانویشمانە مەرگی ڕاستەقینە نەبووە، ئێمە دژی ویستی مەرگ کاردەکەین، دەمانەوێ مەرگ ڕاگرین، بەڵام مەرگ لەوپەڕی بەرپرسیاریەتی خۆیدا کاردەکات[102]. بەڵام ئەوەش گرنگە بپرسین کاتێك ڕوانینێك هەیە دەڵێت، مردن ڕوویەکی شاراوەی ژیانە، ئەو خواستەی هەمانە بۆ ژیان یان گەر بەپێچەوانەشەوە بێت لەم ڕوانینەدا هەڵوێستمان چۆن دەبێت، واتە هەر بەرەوپیرچوونێك بۆ هەرکامیان هیچ جیاوازییەکی نییە، یاخود هەر ڕاکردنێك لەمردن و ژیان نرخی نییە. گەر ئەم دیدە ڕاستبێت ئەو مرۆڤانەی لەمردن دەڕوانن وەك فریادرەس یان دژی مردنن هەڵوێستیان چۆندەبێت؟.

**٤/ مردن له زانستدا:**

زانست چییه؟ "زانست بریتییه له‌ده‌سته‌کانی هزرو هۆشیارییو داهێنانه‌کانی مرۆڤایه‌تی له‌سه‌ر ئاستی جیهان، له بواره‌کانی ژیانو سروشتو گه‌ردووندا"[١٠٣] ئه‌و داهێنانه‌ش، که زانست ده‌یکات له ئه‌نجامی وردبوونه‌وه‌و ڕوانینی قووڵه‌وه‌یه بۆ هه‌موو دیارده‌کان به‌شێوه‌یه‌کی بنه‌ڕه‌تیش پشت به ئه‌زموون ده‌به‌ستێت. جێگه‌ی ئاماژه‌پێکردنه زانست ڕۆژ به‌ڕۆژ له‌گه‌شه‌ی به‌رده‌وامدایه، واته زانسته‌کان سنوورێکی دیاریکراویان نییه له‌وه‌ی که هه‌نوکه زانسته‌کان چه‌ندین له‌به‌رگرتنه‌وه‌(کۆپی)یان ئه‌نجامداوه‌و پارچه‌ی یه‌ده‌گیان سازکردووه (دکتۆر مه‌ولوود ئیبراهیم حه‌سه‌ن له‌م بواره‌دا له کتێبنامه‌ی فێربوونی زمان به له‌به‌رگرتنه‌وه به وردی باسی ئه‌مه‌ی کردووه)، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش ده‌بێ بڵێین زانسته‌کان به‌گشتی ڕێژه‌ین[١٠٤] چونکه وه‌ك كارل پۆپه‌ر ده‌ڵێت ده‌بێ تیۆره زانستیه‌کان له نێو خۆیاندا ئه‌گه‌ری ڕه‌دکردنه‌وه‌یان هه‌ڵگرتبێت. له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ گۆڕانه‌کاندا ئه‌وانیش ده‌گۆڕێن ده‌رئه‌نجامه‌کانی ده‌گۆڕێت ئه‌مه بۆ گشت بواره جیاجیاکان ده‌بێت[١٠٥] گه‌ر باسی دروستبوونی مرۆڤ بکه‌ین له زانستدا، بۆچوونی جیاواز هه‌یه، چونکه هه‌ندێك زانا بۆچوونیان جیاوازه، له بۆچوونه‌کانی داروین* سه‌باره‌ت به گۆڕانو گه‌شه‌سه‌ندنی به‌رده‌وامی زینده‌وه‌ران، به‌ڵام دۆزینه‌وه‌که‌ی داروین جێگه‌ی گرنگییه‌کی زۆربووه[١٠٦] شۆڕشێکی زانستی بووه. زانستی بۆماوه‌زانی ده‌ڵێت (ئه‌و به‌ره‌یه‌ی له مرۆڤه‌وه بێت پێویسته مرۆڤ بێت، واته هه‌ر جۆره بوونه‌وه‌رێکی زیندوو له جۆری خۆی ده‌خاته‌وه و هه‌یه)[١٠٧]. به‌ڵام سه‌ره‌تا ئه‌وه گرنگه، بزانین مرۆڤ له چی پێکدێت، "هه‌موو مرۆڤێکی پێگه‌یشتوو پێکهاتووه، له سه‌د ترلیۆن تاك خانه. بۆ هه‌ریه‌ك له‌و خانانه ژیانێکی تایبه‌ت هه‌یه"[١٠٨]، به‌ڵام وه‌ك سه‌ره‌تا (ژیانی تاك له خانه‌یه‌کی هێلکه‌ی پیتراو ده‌ستپێده‌کات، ئه‌م خانه‌یه دوو هێنده ده‌بێت،

پاشان دووباره هەر خانەیەکی دەرچوو دابەشدەبێتەوە تا بەتەواوی ئەو بوونەوەرە پێدەگات، تاکی تەواو پێگەیشتوو توخمە خانە بەرهەمدێنێت. ئەم خانانە بەردەوام لەگەشەدان، چونکە خانەکان تاکی نوێ دەخەنەوە، بەڵام چۆنیەتی پەیدابوونی ژیان لەسەر زەوی ئاشکرا نییە، بەڵگەکانیش تا ئێستا، ناتوانن لەئەنجامی تاقیکردنەوەکان دەرچن)[١٠٩]، بەڵام ئەوە سەلمێنراوە، کە ژیان لە ژیانی پێشوترەوە پەیدابووە، چونکە بوونەوەرە زیندووەکان لە بوونەوەری زیندووی ترەوە لەدایکبوون، وەك سەرەتاییترین پێکهێنەری بوونەوەر لە خانە دەدوێین)، ناوەرۆکی خانە پێکهاتووە لەزیندە مادە(پرۆتۆپلازم)، کە ناوك و سایتۆ پلازم دەگرێتەوە[١١٠] (بەپێی زانیاریە سەرەتاییەکان ئەو هۆکارانەی، کە بەهۆیەوە خانەکان دروستدەبن لەسەر زەوی نەمان، خانەکان جا چ بەشێوەی تاك خانە بێت یان بەشێك لە کۆمەڵێك خانە، کە دروستکراوێکی زیندووی فرەخانەیان پێکهێناوە ئێستا لەسەر حسابی خانەکانی تر دروستدەبن. کە لەشلەیەکی سپی یەگرتوو (سپێرم) پێکدێت، وە ئەم کارە پێویستی بە پەنجا جەولەی دابەشبوو هەیە، (بەنزیکەیی) بۆ پێکهێنانی کەسێکی تەواو[١١١] پێش چوار ملیۆن ساڵ لەمەوبەر یەکەمین خانەی زیندوو گەشەدەکات، وە بەکۆمەڵێك کارلێك، کە ئێمە تەنیا دەتوانین بەگوترە(بێ بەڵگەی تەواو یەکلاییکەرەوە) دەستنیشانی بکەین، ئەو خانە سەرەتاییانە کۆبوونەتەوە تا بوونەوەرێکی فرەخانە پێکبهێنن، ئەمە لەنزیکەی ملوێنێك ساڵ دوای دروستبوونیو دەرکەوتنی یەکەمجاری تاکە خانە لەسەر زەوی[١١٢] شوێنی پەیدابوونی خانەش لەناو ئاودا بووە[١١٣] تاکە خانەکان توانای ژیانیان هەبووە لەگەڵ ئەمەشدا هەموو خەسڵەتەکانی ژیانی تێدابووە لەوانە توانست لەسەر خواردنو جووڵە لەسەر بەرهەمهێنانی وزە، هەموو ئەمانە لەلایەن ئەو تاکەخانەیەوە کراون و تا ئێستاش نموونەی ئەو تاکەخانانە ماون لەشێوەی

(میکرۆب-ئەمیبا-ڤایرۆس-هەوێن...) هەروەها چەندین شێوەی تر لەخانەکان ئەم خانانە بەهێزبوون بەرادەیەك، کە بتوانن ژیانی خۆیان بپارێزن، پێویستبوو کەوا بەهێزبن، چونکە ئەم خانە زۆر زۆر بچوکە پێویستبوو، کە بەسەلامەتی خۆیو پێکهاتەیەوە بەردەوامبێت، ئەم خانانە بەردەوام لە مەترسیدابوون، مەترسی سروشت یەکێك بووە لە مەترسیە زەقەکان، تیشکی خۆری سەروبنەوشەییو ئۆکسجینی هەوا هەمیشە هەڕەشەیەکی کاریگەرو بەردەوام بووە[114]، لەبەرئەوەیە خانەکانمان بەردەوام لەناودەچن، بەخانەی نوێ شوێنیان دەگیرێتەوە، واتە دابەشبوونی هەندێك خانە لە خانە بنچینەییەکانەوە بەرهەمدێن، ئەم کرداری دابەشبوونەش بەستراوە بە ناوکەوە، ناوك دەزگای دابەشکردنی خانەیە[115].

(سەرەکیترین خاڵی هاوبەشی سەرجەم زیندەوەران ئەوەیە، کە لەشی هەرهەمویان لە ورترینەوە بۆ گەورەترینیان لە خانە پێکهاتووە[116] ئەم گرنگی دانەمان بەخانە بۆ ئەوەیە، کە باس لە مردنی خانە بکەین، کە لەگەڵ مردنی هەر خانەیەکدا ئێمە لە ژیانمان دەڕوات. بە پێی بۆچوونی زانست خانەکان بنەمایی ژیانی مرۆڤن، لەبەرئەوەی کورتو درێژی تەمەنی مرۆڤو ماناوەی پەیوەستە بە ماناوەو کارایی خانەکان.

خانەکان چەند یەکەیەکی زیندووی بچووکترینن، کە لەشمان پێدەهێنن، بەشێوەیەك بچووکن، کە بڕوا پێنەکراوە، واتە ئەگەر دە هەزار دانەیەك لەو خانانە کۆببنەوە لەوانەیە، کە بەچاوی ئاسایی ببینرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەمو خانەیەك ئامادەیە(معەرەزە- ئامادەیە) بۆ لەناوچوون، لەسەر دەستگایەکی دابەشبوو کە بە(dna) ناودەبرێت، بەشێوەیەکی کیمیایی پلان بۆ دارێژراوی گشتی بۆ سەرجەم مرۆڤەکان تایبەتمەندە، هەر خانەیەك بەشێوەیەکی تیۆری بەلایەنی کەمەوە خاوەنی چەند زانیاریەکی پێویستە بۆ دووبارە پێکهێنانەوەی مرۆڤ بەو (dna)ە. خانەکانی لەشمان لەدایکدەبنو

دەژینو دەمرن، لەتاریکیەکی گشتگیرو هەمیشەیدا هەروەك چۆن بەشێکی زۆری خانەکانی لەشمان بەهیچ شێوەیەك ڕووناکی خۆر نابینن، واتە هیچکام لەوانە هەست بەبەرکەوتنی هیچ فۆتۆنێکی(یەکەیەکی پێوانەیی بڕی ڕووناکیە) ڕووناکی ناکەن. تەنانەت خانەکانی پێستیش بەشێوەیەکی سروشتی پۆشراون لەژێر چەند چینێك لە خانەی مردوودا و بەبێ ئەو خانە داپۆشەرانە ناتوانن بەسەر هەڕەشەی تیشکی خۆردا زاڵبن، کە مەترسی سەرەکییە بۆ بەردەوامی ژیانیان[١١٧] پێویستییەکانی ژیانی خانەکان تەنیا تاریکی بەس نییە بەڵکو لەناو لەشدا شێ(تەڕی) هەیە، هەموو خانەیەك لەبەشێکی نەرمدا لەو شلەیەدا مەلە دەکەن، ئەو شلەیە بە (لیمف) ناوزەد کراوە، سەرچاوەی ئەو شلەیەش لەچەند لقێکەوە لەدەمارەکانی دەوروبەری خانەکان، کە خوێنو ئۆکسجین دەهێنن، بۆ خانەکان لەپێناو بەردەوامی ژیانیاندا [١١٨] گەر ورتر لەسەر مردن بدوێین ئەوا پێویستە، وادابنێین کە خۆمان بۆ ساتێك لەناو خانەیەکی زیندوودابین، ئەو خانەیەش بۆ نموونە خانەیەکی ماسولەکەی دڵە کە دیواری(مزەخەیەکی )ماسولکەیی وەك دڵ پێکدەهێنن، خانەکانی ماسولکەی دڵ وەك هەر خانەیەکی تری لەش، ئەرکێکی زۆر تایبەتمەند دەگرنە ئەستۆ، هەر خانەیەك ئەم ئەرکەی بەهاوبەشی لەگەڵ خانەکانی تر ئەنجامدەدات، کە پاڵنانی خوێنە بۆ کۆئەندامی سوڕان لە لەشدا، لەناو هەر خانەیەکی دڵدا چینێکی پرۆتینی هەیە، کە توانایەکی گەورەی لەخۆیدا هەڵگرتووە، وە هەموو خانەکانی دڵ لەژێر کۆنترۆڵێکی خۆنەویستدان، کە بەهۆی شەپۆلێکی هاندەری کارەباییەوە وادەکات، کە لە دەوروبەری شەست بۆ حەفتا جار لێبدات لە خولەکێکدا، کاتێکیش ئەم لێدانە کەم دەکات، ئەوا نیشانەی گرفتە(نەخۆشیە). ئەگەر هاتوو هەر خانەیەك لەخانەکانی دیواری دڵ ئەو چینە پرۆتینییەی کەمکرد ئەوا لەلایەن خانەکانی ترەوە یارمەتی دەدرێت،

ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازبوونی خانەکانی پارمەتیدەر، لەکەمکردنی پرۆتینی خۆیان، ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازبوونی ماسوولکەی دڵ، هەروەها لاوازیی لەپاڵنانی خوێندا بۆ کۆئەندامی سوڕان، لەم بارەشدا مەترسی مردنی چەند خانەیەکی زیندووی دیکە دێتە ئاراوە (ئەم نەخۆشییەش پێی دەگوترێت نەخۆشی سەدمە یان جەڵدەی دڵ لەکەسی نەخۆشدا) [119]. واتە ڕاستە گیانی هاوکاری هەیە لە نێو خانەکاندا، وەلێ ئەم هاوکارییە دەبێتە هۆکاری لاوازی خانەکانی دی بەشەکانی جەستە.

جۆرێکی تری مردنی خانەکان، بەهۆی تێکچوونی هاوسەنگی وردو هەستیاری ناو لەشەوەیە، کە پارێزگاری لە ژیانی ئەو خانانە دەکات، کە زۆر دوورن لە ناوەندەوە، کە بەم هۆیەوە خانەکان دەمرن ئەمەش لەئەنجامی دووچاربوونیان بە ژەهراویبوونەوە، بۆ نموونە بەهۆی (toxin) هکانەوە — کە بریتییە لە ژەهری میکرۆبی، ژەهرێکە لەلایەن میکرۆبەکانەوە دەردەدرێت) ئەم جۆری مردنی خانانە لەناوبردنی کۆی بەشە ناوەکییەکانی خانەیە بە هەڵمژینی ئەو شلە ژەهراویانە لە دەرەوەی خانەکانەوە بۆ ناوەوەیان [120]. بۆ ڕوونکردنەوەی جۆرێکی تری مردنی خانەکان بابۆ تاوێك پەنا بۆ جیهانی منداڵی مرۆڤ ببەین، لەقۆناغێکدا، کە لە ڕەحمی دایکیدا گەشە دەکات، ئەو شوێنەی کە لەوانەیە شوێنێکی گونجاو نەبێت بۆ لێکۆڵینەوە لە مردن تێیدا لەکاتێکدا، کە ئەو شوێنە پێگەی ژیانو گەشەو زۆربوونە، لەگەڵ ئەوەشدا دیسان لێرەشدا مردن ڕۆڵی خۆی دەبینێت، ڕۆڵێکی گرنگ، بۆ پێکهێنانی بوونەوەرێکی نوێی پێکهاتە ئاڵۆز. واتە بۆ ئەوەی پێکهاتەیەکی تەواو دروستبێت، بەشێوەیەکی تر بڵێم بۆ ئەوەی باش بژین دەبێ بمرین، دەبێ هەندێ خانە ببنە قوربانی بۆ باش ژیانی ئێمە. یەکێك لەنموونەکان، کە دەتوانرێت لەڕێیەوە ئەمجۆرەی مردنی خانەمان بەڕوونی بۆ دەربخات دروستبوونی دەستی مرۆڤە(کۆرپەلە لەهەفتەی سەرەتادا–لەسکی دایکیدا–)

کە بەهەفتەی هەشتەمی سەرەتای ژیانی لەباری گەشەکردنی خانەکانیدایە بەشێوەیەکی بەردەوامو بەنزیکەیی ئەو ماوەیەیە، کە تێیدا هێڵکاری تەواوی لەشی دەستپێدەکات، هەروەها هەموو ئەندامەکانی هەناوی لەکۆتای هەفتەی هەشتەمەوە دەتوانین ئەو کۆرپەلەیە وەکو شێوەی مرۆڤ بناسینەوە[١٢١] پەلەکانی کۆرپەلە (باڵ،قاچ، پەنجەوپاشکۆکانی... تاد). چەندین ڕوونکردنەوەی توێکاری کراوە بۆ ماوەی سەدان ساڵە ئەم پرسیارە لەمێشکی مرۆڤدا بوو، کە ئایا ئەو خانانە چییان بەسەردا دێت، کە وەك پەردەیەك لەنێوان پەنجەی کۆرپەلەدایە؟ تا لەکۆتایدا ئەوە ڕوونبوویەوە، کە ئەو خانانە ناگوێزرێنەوە بۆ بەشی تری لەش واتە خانەکان لەناودەچنو دەمرن یەك لەدوای یەك و لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ئەو خانانەی، کە بەینی پەنجەکانی دەستو قاچ پڕدەکەنەوە لە کۆرپەلەی مرۆڤدا مردنێکی بێخواستیان نییە یان مردنێکی ناخۆش وەك مردنی خانەکانی دڵ، یان بەهۆی ئەوە وە نامرن، کە خوێنو ئۆکسجینیان لێببڕێت، یان بەهۆی دزەکردنی مادە ژەهرەکانو ئاوو کالسیۆم بۆ ناویان بەڵکو ئەوان لەژێر فەرمانی چارەنووسێکی نووسراودان، کە لەسەرەتای سەرهەڵدانو ژیانیانەوە بۆ یان دیاریکراوە، کە هیچ ڕەتکردنەوەیەکی تێدانییە بەڵکو مردنەکەیان ناچاریە. واتە مردنەکان لەپێناو ژیانێکی تەندروستدایە[١٢٢]. دەبێ ئەوە تەنانەت لەم لەناوچوونەشدا مرۆڤ مەحکومە بە لەناوچوون، واتە ئەزموونکردنی لەناوچوون بە شێوەی جیاواز مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە پێیدا تێپەر دەبێت.

ئۆکسجین بڕبڕەی ژیانە بەپێی زانست "ئەگەر چوار دەقە ئۆکسجین نەگاتە دەماخ ئەوا ئەو لەشە دەمرێت"[١٢٣] هاوکات بەپێی بوارە جیاجیاکان مردن تەفسیری جیای دەکرێت، زانست دەڵێت "مردن وەزیفەیەکی بایۆلۆژی و فیزیاییو فیزیایەو کۆتایی هاتنە بەو عەقڵ وەزیفەکانی "[١٢٤]واتە مردن لە

زانستدا، "وەستانی دڵو لەکارکەوتنی مێشکە"[١٢٥]. هەر لە نێو زانستدا سەبارەت بە مردنی مرۆڤ چەندین بۆچوونی جیاواز هەیە، وەك چۆن لە بوارەکانی دیدا باسمانکرد، بەڵام دەششێ هەموویان برێك لە ڕاستیان لە خۆیاندا هەڵگرتبێت، بەڵام هیچیشیان ناتوانن بە ڕەهایی پێمان بڵێن مردن ئەمەیە، چونکە زانست تەفسیری خۆی هەیە، کایەکانی دیش لێکدانەوەی خۆیان هەیە.

ئێستا کاتی ئەوەیە بپرسین بۆچی دەمرین: مرۆڤیش وەك هەر بوونەوەرێکی تر پێویستە بمرێت چونکە مردنێکی ناچاریو بەرنامە بۆ دارێژراوە، چەند ئالیەتێکی جێگیر تیاماندا هەیە کە دڵنیامان دەکاتەوە لەمردنمانو وەك هەموو گیانلەبەرێکی تر و تەمەنێکی دیاریکراو هەیە بۆ ژیانی گیانلەبەران، تەمەنی مێرو بەڕۆژ حساب دەکرێ، مشك ٣ ساڵ دەژی، مرۆڤ بەخت یاوەری بێت دەتوانێت تا ١٢٠ساڵ بژی ، زۆرێك لە بوونەوەرە تاك خانەکان بەهۆی ڕووداوێك یان گۆڕانکاری بارودۆخەوە دەمرن.

ئەمرین لەبەرئەوەی خانەکانمان دەمرێت، ڕوونە ئەو پێناسەیەی، کە مرۆڤ بۆ مردنی دەکات، لەئەنجامی بینینی ڕەگەزەکانی مردنەوە دایتاشیوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستە کاتێك ئەمرین، مردنمان لە خانەکانمانەوە دەست پێدەکات، ئەمەش لە ئەنجامی گۆڕانکاریەك لەو ڕێگەیەدایە، کە خانەکانی پێ زۆرو جۆراوجۆر دەبێت، دیارکردنی هەزاران مەلاین ساڵ لەگەشەکردن ڕێگەیەکی سەختە، لە کۆتایدا بڕیارە ئەو خانانە زۆر ببن لە ڕێگەی بەکارهێنانی ڕەگەزەکانی مرۆڤەوە وەك هۆکارێکی زۆربوون، لە هێڵێکی گەشەکردندا کە مرۆڤ پێشڕەوی دەکات، لەڕێگەی دروستکردنی(dna) کە ڕۆڵی زۆربوون دەگێڕێت، (dna) یەك ئامانجی هەیە، ئەویش زۆربوونە، بەو کارە هەڵدەستێت بە ڕێکەوتن لەگەڵ یاسا فیزیاییەکاندا- مبادئ

الترموديناميك(الديناميك الحراري)،كە ئەم یاسا فیزیایە فەرمانڕەوایی تەواوی گەردون دەكات.[١٢٦]

بەرێنوێنی (dna) هەموو خانەكانی لەشمان ژیاندەكەن، لەكۆتاییدا هەر خۆیان دەمرن، هەربۆیە ئەم مردنە بە مردنی بەرنامە بۆ داڕێژراو ناودەبرێت، كە لەلایەن dna یەوە بەرنامەی بۆ داڕێژراوە. شێوازی مردنەكەش لەتوێكاری لەشی مرۆڤێكدا كراوە، كە تەمەنی لە هەشتا ساڵ بەرەو ژوور بووە، بەشێوەیەكی ئاسایی نیو دەرزەن یان زیاتر لە هەڵە ترسناكەكان، كە دەبێتە هۆی مردنی خانەكان، بەشێوەیەكی ئاسایی بێت یان (ئەجەل) لەكاتێكدا خانەكان دەمرن بەشێوەیەكی یەك لە دوای یەك. شوێنە هەستیارەكانی لەش وەكو(گورچیلەكان–سیەكان–جگەر) كەمدەهێنن، لە ئەنجامی لەدەستدانی خانەكانەوە، دڵ لەلێدان دەكەوێت لەم كاتەدا كردەی مردن خێرا دەبێت بۆ بەشەكانی تری لەش، لەم كاتەشدا مردنێكی توند(العنیف) لەچەند دەقەیەكدا ڕوودەدات كە خانەكانی دەماخ، یەكەم خانەن، كە پاشان خانەكانی تری لەشیش دەمرن. ئەمەش پاش بەكاربردنی هەموو وزە گەرمیەكانی لەشەوەیە، كە لە زەمەنی ژیانی مرۆڤدا لەڕێگەی خۆراكەوە خەزنی دەكات[١٢٧]. هەندێجار لەڕێگەی نەشتەرگەریەوە بۆ ماوەیەك بەر لەمجۆرە مردنە دەگیرێت لەڕێگەی دانانی دڵی دەستكرد لەجێگەی دڵی مرۆڤ پێش ئەوەی لە لێدان بكەوێت بەڵام ئەم دڵە دەستكردە تەنیا دەوری مزەخەیەك دەگێڕێت، كە هەندێكجار سەرپێچی لە فرمانەكانی دەماخدا دەكات لەكاركردنیدا لەم حاڵەتەشدا مەحاڵە ژیان بۆ كەسی نەخۆش بگەڕێنرێتەوە بەڵكو تەنیا بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك دەژی، پیتەر سینگەر زانایەكی بایەلۆجی ڕەوشتە دەڵێ: ( فەرماندانی مێشك بۆ دڵ نا كۆتایە لەبەرئەوە زۆر گرانە كە داهاتوویەكی بەسوودو درێژ بۆ كەسی نەخۆش كە

ژیانی لەسەر دڵی دەستکرد بەندە هەبێت. مردن بەهەرشێوەیەك بێت کلیلی سەرەکی لەدەستدانی خانەکانە[128].

## سەرچاوەکانی بەشی یەکەم:

* بەگوێرەی ئەو زمانەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا داهێنرا، ئەفسانە بریتییە لە هەموو ئەوشتانەی بە واقیع ناکۆکە(سەردەم- ل.١٧١ ) ٢. لیڤی شتراوس، پێیوایە بیرکردنەوەی میتۆلۆژی لە دەرەوەی لۆژیك نییە، بەڵکو خۆی لەخۆیدا لێکدانەوەیەکی لۆژیکییە. هەروەها لێکۆڵینەوە لە ئەفسانە لە سەدەی هەژدەوە دەستی پێکرد، لەو کاتەوە تا ئێستا دیدی نوێ تایبەت بە ئەفسانە دێتە ئاراوە- ئەنترۆپۆلۆژیا- ل.١٦٢-١٦٣).


١. مێرسیا ئەلیاد، و. محەمەد حوسێن، گۆڤاری سەردەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم- سلێمانی، ژ.(٤٧-٤٨)ساڵی ٢٠٠٦،ل.١٧١.

٢. مەولوود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمرییدا، دەزگای ئاراس-هەولێر، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠٠٢، ل.٢٨.

٣. سەرچاوەی پێشوو.ل.٢٨.

٤. سەرچاوەی پێشوو.ل. ٣٣.

٥. رەحیم سابیر، ڤاتا(لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-فەلسەفی-ئایینییە، لەبارەی رۆح،نەفس،بەدەن)، لەسلێمانی چاپکراوە، ساڵی ٢٠١٢.ل.٢٠.

٦. سەرچاوەی پێشوو.ل.٢٠.

٧. مەولوود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمرییدا، دەزگای ئاراس-هەولێر، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠٠٢، ل.٩٠.

٨. سلێمان مەزهەر،و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨،ل.١٧.

٩. رەحیم سابیر، ڤاتا(لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-فەلسەفی-ئایینییە، لەبارەی رۆح،نەفس،بەدەن)، لەسلێمانی چاپکراوە، ساڵی ٢٠١٢.ل.١٣.

١٠. سلێمان مەزهەر،و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨،ل.٤٠.

١١. مەولوود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمرییدا، دەزگای ئاراس-هەولێر، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠٠٢، ل.١١٤.

١٢. ئەرخەوان محەمەد عوبەید، ڕەمزنووسینی سەر گۆڕەکان، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم ساڵی٢٠٠٨،لا. ٦.
١٣. مەولوود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمریدا، دەزگای ئاراس–هەولێر، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠٠٢، لا.١٤٣.
١٤. نەجات حامید ئەحمەد، سایتی ماڵێك لە ئاسمان.www.hemin.dk/mla /
١٥. یوری کراسنی–و،غەریب پشدەری– ئەفسانەکانی خۆرهەڵات، دەزگای ئاراس–هەولێر،چاپی یەکەم ساڵی.٢٠٠١ لا.١٢.
١٦.مرسیا ئیلیاد،و.ئیبراهیم فەتاح، ئەفسانەی مردن، گۆڤاری ئایندە، ژمارە، ٧٦، دەزگای سەردەم– سلێمانی،ساڵی٢٠٠٨، لا.٢٣.
١٧. سەرچاوەی پێشوو.لا.٣٣.
١٨. سەرچاوەی پێشوو.لا.٣٤.
١٩.چەند نووسەرێك، وەرگێڕانو لێکدانەوەی عادل باخەوان، ئایین چییە؟، دەزگای سەردەم– سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی٢٠٠٨. لا.٢٩.
٢٠. عەلی باپیر، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنای قورئانو سونەتدا، چاپی یەکەم، نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەوراگەیاندن–هەولێر،ساڵی ٢٠٠٦.لا. ٨.
٢١.ڕێبین ڕەسووڵ ئیسماعیل–دیار عەزیز شەریف. ئەنترۆپۆلۆژیا، دەزگای چاپوپەخشی ڕێبین.چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٤. لا.١٦٣.
٢٢.دانیاڵ ل.پاڵس، و.ئاوات ئەحمەد، لەبڵاوکراوەکانی گۆڤاری ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی فکریوسیاسی–سلێمانی.چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٧. لا.٥٦.
٢٣. چەند نووسەرێك، وەرگێڕانو لێکدانەوەی عادل باخەوان، ئایین چییە؟، دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی٢٠٠٨. لا٧٦–٧٧.
٢٤. مەولوود ئیبراهیم حەسەن، پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی،چاپخانەی ڕەنج–سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٧.لا.٢٨٣.
٢٥.ویل دورانت.و.عەبدوڵڵا ڕەسووڵی، مێژووی شارستانیەت–بەرگی دووەم.خانەی چاپوبڵاوکردنەوەی چوارچرا–سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی.٢٠١١.لا.٦٩.
٢٦. سلێمان مەزهەر،و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨،لا.٩٧.
٢٧.د.محەمەد کەمال.نیهلیزمو ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە، دەزگای سەردەم–سلێمانی. چاپی یەکەم، ساڵی،٢٠٠٥.لا.١٣١.

٢٨. . سلێمان مەزهەر، و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨،ل٩٨.
٢٩. سەرچاوەی پێشوو.ل.١٣٨.
٣٠. د.محەمەد کەمال.نیهلیزمو ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە، دەزگای سەردەم-سلێمانی. چاپی یەکەم، ساڵی،٢٠٠٥ .ل١٤١.
٣١. سلێمان مەزهەر، و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨،ل١٤٨-١٥٧.
٣٢.هاوبیر کامەران، زانستو فەلسەفە ڤیداییەکان، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم،ساڵی٢٠٠٩.ل.١٠٣-١٦٦.
٣٣. سلێمان مەزهەر، و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨.ل.٢٩٣.
٣٤. سەرچاوەی پێشوو.ل٢٠١.
٣٥. ویل دورانت.و.عەبدوڵڵا ڕەسوولی، مێژووی شارستانیەت- بەرگی یەکەم.خانەی چاپوبڵاوکردنەوەی چوارچرا- سلێمانی، چاپی یەکەم. ساڵی.٢٠١١.ل٦٠١.
٣٦. سەرچاوەی پێشوو.ل.٦٠٣.
٣٧.عەبدولخالق سەرسام، گۆڕ دەخمەکانی میدیاو زەردەشتییانو ڕێوڕەسمی مردوو سپاردن بە شاخ.دەزگای ئاراس- هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠٠٩.ل.٧٠.
٣٨. سلێمان مەزهەر،و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨.ل٢٢٩.
٣٩.ئەنستاس ماری کەرمەلی.و، د.نەجات عەبدوڵڵا. کتێبی پیرۆزی ئیزیدییەکان (جیلوەومەسحەفا ڕەش). دەزگای ئاراس-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٢. ل ٥٣.
٤٠. سەرچاوەی پێشوو.ل٦٦.
٤١. ڕەحیم سابیر، ڤاتا (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-فەلسەفی-ئایینیە، لەبارەی ڕۆح، نەفس، بەدەن)، لەسلێمانی چاپکراوە، ساڵی ٢٠١٢.ل١٢٤.
٤٢. ئەنستاس ماری کەرمەلی.و، د.نەجات عەبدوڵڵا. کتێبی پیرۆزی ئیزیدییەکان (جیلوەومەسحەفا ڕەش).دەزگای ئاراس-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٢. ل٦٥.
٤٣. سەرچاوەی پێشوو.ل٦-٧.
٤٤. ڕەحیم سابیر، ڤاتا(لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-فەلسەفی- ئایینیە، لەبارەی ڕۆح، نەفس، بەدەن)، لەسلێمانی چاپکراوە، ساڵی ٢٠١٢.ل١٣٣.

٤٥. ١. بورهـان محەمـەد ئـەمین. تەفسـیری ئاسـان بـۆ تێگەیشـتنی قورئـان. بڵاوکراوەکـانی کتێبخانـەی ڕۆشـنبیر-سـلێمانی-هـەولێر. چـاپی یەکـەم، سـاڵی ٢٠٠٤. سـورەتی البقـرە، ئایەتی ٢٥٣. ٢٥٢. لا. ٤٢. ( ٢). چیرۆکی هەڵبژاردە لە(کتێبی پیرۆز) لا. ٢٩٤.

٤٦. بورهـان محەمـەد ئـەمین. تەفسـیری ئاسـان بـۆ تێگەیشـتنی قورئـان. بڵاوکراوەکـانی کتێبخانـەی ڕۆشـنبیر-سـلێمانی-هـەولێر. چـاپی یەکـەم، سـاڵی ٢٠٠٤. سـورەتی البقـرە، ئایەتی ٢٨. لا ٥.

٤٧. نەجات حامید، سایتی ماڵێك لە ئاسمان.www.hemin.dk/mla /

٤٨. بورهـان محەمـەد ئـەمین. تەفسـیری ئاسـان بـۆ تێگەیشـتنی قورئـان. بڵاوکراوەکـانی کتێبخانـەی ڕۆشـنبیر-سـلێمانی-هـەولێر. چـاپی یەکـەم، سـاڵی ٢٠٠٤. سـورەتی البقـرە، ئایەتی١٥٤. لا.٢٤.

٤٩. سەرچاوەی پێشوو. سورەتی (السجدە). ئایەتی ١١. لا.٤١٥.

٥٠. سەرچـاوەی پێشـوو، نـاوی سـورەتو ئایەتـەکان بـەپێی ڕیزبەنـدی کـۆی سـەرنجەکان دادەنێم. ١. سورەتی (الهمزە) ئایەتی(٣) لا٦٠١/ ٢. سورەتی البقرە، ئایەتی (٥٦) لا ٨/ ٣. سورەتی البقـرە، ئایـەتی (١٨٠) لا٢٧/ ٤. سـورەتی البقـرە، ئایـەتی(١٨٠) لا ٢٧/ ٥. سـورەتی البقـرە، ئایـەتی(٩٤) لا. ١٥/ ٦. سـورەتی البقـرە، ئایـەتی (٢١٧) لا ٢٤/ ٧. سورەتی البقرە، ئایەتی (١٦٤)لا٢٦/ ٨. سورەتی البقرە، ئایەتی (١٦١)لا. ٢٤

٥١.د.نەبیل عەبدوالحەمید عەبدولجەبار، و.هاوار محەمـەد ڕەشـید، فەلسـەفە بـۆ ئـەو کەسـەی دەیەوێت، دەزگای چاپوبڵاوکردنەوەی ڕۆژهـەڵات- هـەولێر، چـاپی یەکـەم، سـاڵی٢٠١٠، لا.٣٧-٣٨.

٥٢. سەرچاوەی پێشوو.لا.٣٧.

٥٣. سەرچاوەی پێشوو.لا٣٩.

٥٤. سەرچاوەی پێشوو.لا٤١.

٥٥.فـاروق ڕەفیـق، فەلسـەفەو ژیـان، لـەبڵاوکراوەکانی خانـەی حیکمـەت بـۆ لێکۆڵینـەوەی فەلسەفی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩. لا.٣١.

٥٦.حەمید عەزیز، سەرەتایەك لەفەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، چاپخانەی شڤان-سلێمانی چاپی دووەم، ساڵی٢٠٠٥.لا٢٨.

٥٧.د.محەمەد کەمال، بوونوداهێنان،دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکـەم، سـاڵی ٢٠٠٤لا ١٥.

٥٨.د.محەمەد کەمال، فەلسەفەی ئەفلاتوون، دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠١٠، لا.١٩١.

٥٩.ئەفلاتوون، و.عیمران هاواری، سەرجەم بەرهەمەکانی ئەفلاتوون، چاپی یەکەم، بەرگی دووەم، چاپوپەخشی ڕێنما–سلێمانی، ساڵی٢٠١١، لا٦٠٤.

٦٠. ئەفلاتوون، و.عیمران هاواری، سەرجەم بەرهەمەکانی ئەفلاتوون، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، چاپوپەخشی ڕێنما–سلێمانی،ساڵی٢٠١١، لا٤٢–٤٤–٤٦.

٦١. د.محەمەد کەمال، فەلسەفەی ئەفلاتوون، دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠١٠، لا.٢٠٧–٢١٤.

٦٢. ئەفلاتوون، و.عیمران هاواری، سەرجەم بەرهەمەکانی ئەفلاتوون،چاپی یەکەم، بەرگی دووەم،چاپوپەخشی ڕێنما–سلێمانی،ساڵی٢٠١١، لا٦٠٠–٦٠٢.

٦٣. ئەفلاتوون، و.عیمران هاواری، سەرجەم بەرهەمەکانی ئەفلاتوون، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، چاپ و پەخشی ڕێنما–سلێمانی، ساڵی٢٠١١، لا٢٨–٢٩.

٦٤. سەرچاوەی پێشوو.لا.٢٧.

٦٥. سەرچاوەی پێشوو.لا.٣٣.

٦٦. سەرچاوەی پێشوو.لا.٤٣.

٦٧. سەرچاوەی پێشوو.لا.٤٤.

٦٨. د.محەمەد کەمال، فەلسەفەی ئەفلاتوون، دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠١٠، لا.١٨٧.

٦٩. حەمید عەزیز، سەرەتایەك لەفەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، چاپخانەی شڤان–سلێمانی، چاپی دووەم، ساڵی٢٠٠٥.لا٢٥٥.

٧٠.سیروان ئەحمەد سەعید، دەروازەیەك بۆ فەلسەفە(کلاسیك)، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان–سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩ لا.٦٧.

٧١.ویل دیورانت، و.تاریق کارێزی، سەربردەی فەلسەفە، بەرگی یەکەم، دەزگای موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٧.لا.١٣١.

٧٢. سەرچاوەی پێشوو.لا.١٤٨.

٧٣. محمد صنعتی، مجله ارغنون، مرگ در اندیشه غرب، شماره ١٧، چاپ سوم، ١٣٨٤، ص٣٤–٧٥.

٧٤. سەرچاوەی پێشوو، ص ٥٣.

٧٥.د.حەمید عەزیز، فەلسەفەی سەردەمی ڕۆمانتیکی، پرۆژەی هاوبەشی بەشی فەلسەفەی زانکۆی سەلاحەدین‌ودەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٠، ل.١٤٥-٢٢٤.
٧٦. محمد صنعتی، مجله ارغنون، مرگ در اندیشه غرب، شماره ١٧، چاپ سوم، ١٣٨٤، ص٤٢.
٧٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.
٧٨. جهان به مپابه اراده و بازنمود، شوبنهاور، نشر نی، ١٣٨٢، عبدالکریم رشیدیان، ص ٧٩.
٧٩.میهرادمیهرین، و.هونەر عەبدوڵلا، جیهانبینی شۆپنهاوەر،دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩. ل.٥٩-٦٢.
٨٠.مەریوان وریا قانع،ڕۆژنامەی ئاوێنە، ستون بەناوی"ئەودیو شتەکان"، ژ.٧٤، لاپەرە ٢. ٤/٨/ ٢٠١٠.
٨١. خردنامه (ماهنامه ی فرهنگی همشهری)، شماره ی ٤، تیر ١٣٨٥
٨٢.فاروق رەفیق، وێستگەیەك لەگەشتێکی فەلسەفی، ئەندێشە بۆ چاپوبڵاوکردنەوەی کتێب-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠١١، ل.١١٨.
*دەزاین: زاراوەیەکی تایبەتە بەهایدیگەر کەبیرە فەلسەفییەکانی خۆی تایبەت بەمرۆڤ تیا بەرجەستە کردووە، لێکدانەوە زۆر هەڵدەگرێت بەڵام واتای جەوهەری بریتییە لە بوون لێرە- بوون لە جیهان. بەهۆی ئەوەی هایدیگەر یەکێك لەپێشەرجەکانی بوونی مرۆڤی بەوە داناوە کە دەبێت بوون بێت لەجیهان، واتە من کە دێمە بوون لەناو جیهاندا دێمە بوون، ناکرێت مرۆڤێك هەبێت و لەدەرەوەی جیهان بێت.
٨٣.سەعید سلێمانی، دەرکەوتەی دڵخوازی مەرگ، بەڕێوەبەرێتی چاپو بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠١١.ل٤٤.
٨٤.د.محەمەد کەمال، هایدیگەر و شۆڕشێکی فەلسەفی، دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٧. ل.١٢٨.
٨٥. سەرچاوەی پێشوو. ل.١٣٩-١٤٠.
٨٦. فاروق رەفیق، وێستگەیەك لەگەشتێکی فەلسەفی،ئەندێشە بۆچاپو بڵاو کردنەوەی کتێب-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠١١، ل١٠٤-١١٢.
٨٧. سەرچاوەی پێشوو. ل.١٠٨-١١٢.
٨٨. هایدگر و پرسش بنیادین، بابك احمدی، نشر مرکز، چاپ پنجم، ١٣٨٨، ص٢٤٤.
٨٩. سارترکه می نوشت، بابك احمدی، نشر مرکز، چاپ سوم، ١٣٨٨، ص٢١٤

٩٠. د.محەمـەد كـەمال، بوونوداهێنان،دەزگـای سـەردەم-سـلێمانی، چـاپی یەكـەم، سـاڵی ٢٠٠٤لا.١٤٦-١٤٧.
٩١. سەرچاوەی پێشوو. لا،١٤٧-١٥٠.
٩٢. سەرچاوەی پێشوو. لا١٥٢.
٩٣. سەرچاوەی پێشوو. لا١٥٨.
٩٤. عبدالكريم سروش، و. موسعەب ئەدهەم زەڵمی، چیەتی مـەرگ!؟، خانـەی چاپوپەخشـی سایە-سلێمانی، چاپی یەكەم،ساڵی٢٠٠٩،لا. ٧-٨.
٩٥. سەرچاوەی پێشوو. لا١٢.
٩٦. حەمید زەناز، و.كامیل محەمەد قەرەداغی، ماناوتووڕەیی، خانـەی وەرگێـڕان-سـلێمانی، چاپی یەكەم، ساڵی،٢٠١٠، لا.١٠.
٩٧. سەرچاوەی پێشوو. لا٣٠-٣١.
٩٨. ئازاد حەمە، فەلسـەفەی فینۆمینۆلـۆژی یـان پاتۆچـكە، چـاپخانەی چوارچـرا-سـلێمانی، چاپی یەكەم، ساڵی، ٢٠١٠. لا.١٢٦-١٣١-١٣٢.
٩٩. سەرچاوەی پێشوو. لا١٣٠-١٣٤.
١٠٠. سەرچاوەی پێشوو. لا، ١٣٤.
١٠١. سەرچاوەی پێشوو. لا١٣٥-١٣٦.
١٠٢. سەرچاوەی پێشوو. لا١٤٤-١٤٥.
١٠٣. تەها وەهاب، بـەراوردێك لـەنێوان قوئـانو زانسـتدا، چـاپخانەی ئاوێنـە-سـلێمانی چـاپی یەكەم، ٢٠٠٩. لا. ٩
١٠٤.سەرچاوەی پێشوو.لا ١٠.
١٠٥. د.نوری جەعفـەر، و. سـابیر بۆكـانی، سروشـتی پەرەسـەندنی هـزر، خانـەی وەرگێـڕان- سلێمانی، چاپی یەكەم.(ساڵی چاپی تیا نیە).لا.٨٦
١٠٦.حەسـەن هـەمزە، بنەچـەی جۆرەكـان، وەڵامێـك بـۆ ئومێـد قـەرەداخی، ڕۆژنامـەی چاودێر.ڕوانگەو ڕەخنە ژ، ١٠٤.
١٠٧.عەبدولڕەحمان حەمـە چـاوش، بۆمـاوەزانی مـرۆڤ، چـاپخانەی ڕەنـج -سـلێمانی، چـاپی یەكەم. ساڵی ١٩٩٨. لا. ١٨.
١٠٨.وليم ر. كلارك، ترجمە، تيسير حسون، الجنس ومنابع الموت، دار الكلمە للنشر و التوزيـع، سوريە-دمشق، الگبع الۆلی. ص.٩٠.
١٠٩. عەبدولڕەحمان حەمە چاوش ، بۆمـاوەزانی مـرۆڤ، چاپخانەی ڕەنـج - سلێمانی، چـاپی یەكەم. ساڵی ١٩٩٨. لا.٢٤.
١١٠.سەرچاوەی پێشوو. لا.٢٧.

١١١ .وليم ر. كلارك، ترجمه، تيسير حسون، الجنس ومنابع الموت، دار الكلمه للنشر و التوزيع، سوريه-دمشق، الگبع الّولى. ص.١١.
١١٢. سەرچاوەی پێشوو. لا. ١٢.
١١٣. تەها وەهاب، بەراوردێك لەنێوان قوئانو زانستدا، چاپخانەی ئاوێنە-سلێمانی چاپی یەکەم، ٢٠٠٩. لا.٥٩.
١١٤. وليم ر. كلارك، ترجمه، تيسير حسون، الجنس ومنابع الموت، دار الكلمه للنشر و التوزيع، سوريه-دمشق، الگبع الّولى. ص.١٢
١١٥. عەبدولڕەحمان حەمە چاوش ، بۆماوەزانی مرۆڤ، چاپخانەی ڕەنج -سلێمانی، چاپی یەکەم. ساڵی ١٩٩٨. لا٢٩٧.
١١٦. تەها وەهاب، بەراوردێك لەنێوان قوئانو زانستدا، چاپخانەی ئاوێنە-سلێمانی چاپی یەکەم، ٢٠٠٩. لا ٥٩.
١١٧. وليم ر. كلارك، ترجمه، تيسير حسون، الجنس ومنابع الموت، دار الكلمه للنشر و التوزيع، سوريه-دمشق، الطبع الأولي. ص١٢-١٤
١١٨.سەرچاوەی پێشوو.لا. ١٤
١١٩. سەرچاوەی پێشوو.لا. ١٦.
١٢٠. سەرچاوەی پێشوو.لا. ١٩.
١٢١. سەرچاوەی پێشوو.لا. ٣٢.
١٢٢. سەرچاوەی پێشوو.لا. ٤٢
١٢٣. دیدار لەگەڵ حەسەن هەمزە،ئا.هەرێم عوسمان، کاکێشان، پاشکۆیەکە لەگەڵ کوردستانی نوێدا دەردەچێت، هەموو چوارشەمەیەك.ژ.٥٧٦١،ساڵی ٢٠١٢.
١٢٤.نەجات حامید سایتی ماڵێك لە ئاسمان.
١٢٥. د.محەمەد کەمال، بوونو داهێنان،دەزگای سەردەم-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٤لا١٥٤.
١٢٦. وليم ر. كلارك، ترجمه، تيسير حسون، الجنس ومنابع الموت، دار الكلمه للنشر و التوزيع، سوريه-دمشق، الطبع الأولي. ص ١٥٢
١٢٧.سەرچاوەی پێشوو. لا.١٥٤
١٢٨.سەرچاوەی پێشوو ١٥٣-١٥٤.
١٢٩- مارتن هایدیگەر، بوونو کات، و، د. محەمەد کەمال، دەزگای سەردەم-سلیمانی، ٢٠١٣.
١٣٠- ژان پۆل سارتەر، بوون و نەبوون. و. د. محەمەد کەمال، دەزگای سەردەم-سلیمانی، ٢٠١١ .

## بەشی دووەم

### ١/چەمکی واتا:

گرنگیدان بەواتا گرنگیدانە بەزمان، لەبەرئەوە لێکدانەوەی واتایی لێکدانەوەی بەشێکە لە زمان، زمان گەر فۆرم بێت ئەوا واتا جەوهەرەکەیەتی، چۆمسکی زوو پەشیمان بووەوە لەوەی کە ڕێزمان لە واتا جیابکاتەوە(١)، چونکە زمان بێ واتا لەنگی دروست دەکات. پێناسەی واتا گرانی گرانە، چونکە هیچ پێناسەیەك ناتوانێت پراوپڕی مەبەستەکانی واتا بگەیەنێت، بۆچوونی ئەفلاتوون بۆ واتا "بریتییە لە پەیوەندییەکی دوو لایەنی لەنێوان فۆرمێکی زمانی و کەرەسەیەك لەدەرەوەی زماندا"(٢)، ئەم دیدەی ئەفلاتوون بۆ واتا پێمان دەڵێت هەر وشەیەك هێمایە بۆ شتێك(تەن-روداو-شت-کەس)(٣). ئەم بۆچوونەی ئەفلاتوون سۆسێر بۆی دەگەڕێتەوە، لای ئەو(واتا بریتییە لەپەیوەندی نێوان(ناو، ناولێنراو)، کە بەهێما دەنوێنرێ، هێماش ئەو نیشانانەیە، کە بۆ لەیەکدی گەیشتن بەکاردەهێنرێت، واتاش بۆچوونێکە بەهێماوە بەستراوەو کۆمەڵ بەکاریدێنێت)(٤) بەڵام مردن ئەو ناوەیە بۆ دیاردەیەك، کە ئەم دیاردەیە هەم لە دەرەوەیە هەم لە دەرەوە نییە، واتە ناتوانین بڵێین ئەمە مردنە. گەر ئاماژە بۆ کەسێکی مردوو بکەیت بڵێیت ئەمە مردنە، کە ئەم کەسە مرد، ئەوا لەوێدا نەمانتوانیوە واتاکە دەربخەین، چونکە ئێمە لەوێدا ئاماژەمان بە کەسێك کردووە، نەك خودی مردن.

هەر سەبارەت بەواتا ئیبن سینا بەمجۆرە پێناسەی دەکات "واتا ئەو شتەیە یاخود ئەو بەشەی زمانە، کە لەمێشکدایەو نابینرێت ، ئەوەی کە مرۆڤ دەیبینێت ئەو شتەیە کە بەهۆی چاویەوە وێنەی گرتووە و پاشماوەی لە مێشکدا جێهێشتووە، ئەو پاشماوەیە واتایە"(٥) ئەم پێناسەیە مرۆڤی وەك

کامێرایەك نیشانداوە، کە وێنەی دنیای دەرەوە دەگرێتو واتای دەداتێ و واتاش نادیارە چوون گوێزانەوەی دنیای دەرەوەیە بۆ ناو مێشكو پاشان واتادانە پێی. ئەم پێناسەیەی ئیبن سینا پێمان دەڵێت شتەکان خۆیان لە خۆیاندا واتایان نییە، بەڵکو ئەوە ئێمەین واتا دەدەینە شتەکان. لێرەدا سەبارەت بە واتای مردن بە پێی بۆچوونی ئیبن سینا تێدەگەین، ئێمە دەتوانین بەمجۆرە لە واتای مردن بگەین، کە مردن دەبێ ڕوویدات، واتە لە مردنی مرۆڤەوە دەتوانین بڵێین مردن ئەمەیە، کە کەسێك ئیدی ناتوانێت بژیو لە جوڵەو گۆڕان دەکەوێت. واتە ئێمە لە مردنی مرۆڤەوە دەتوانین باسی مردن بکەین، چونکە مردن خۆی لە خۆیدا لە مردنی مرۆڤدا دەردەکەوێت، دەنا مردن خۆ باخچەیەك یان گوڵدانێ نییە، تا بە ناوهێنانی وێنەکەی لە مێشکماندا بێتەوە بەرچاومان. ئێمە ناتوانین پڕاوپڕ وێنەی مردن بکەین. وێنەکردنی مردن لە مرۆڤێکدا کە دەمرێ دەبینینەوە(ئەمەش بە شێوەیەکی ڕێژەیی وێنا دەکرێت لە شێوازی مردنو جۆری مردنەکەیدا).

گەر بکرێت خۆشمان پێناسەی واتا بکەین دەڵێین بریتییە لە بە فۆرمکردنی(فۆرمبەخشین) ئەم سێ دنیایە، دنیایی خۆو، دیار(جیهان)، دنیای نادیار(میتافیزیك). لەم پێناسەیەدا ڕەچاوی ئەوەمانکردووە، کە مرۆڤ لەم جیهانەدایە و بۆخۆی جیهانێکە لەناو خۆیدا، هاوکات ئەم مرۆڤە بایەخ بەجیهانێکی نادیاریش دەدات، واتاش پێکهاتووە لەم سێ جیهانە بەهەموو وردەکاریەکانییەوە.

٢/ واتاسازی (سیمانتیك):

ئەوەی واتا مەبەستیەتی واتاسازیە، واتاسازیش لێکدانەوەیە لە واتا[٦] یان "زانستی واتا"یە[٧] لێڵی واتاو پەیوەندی واتا بەزانستەکانی ترەوە کارێکی کردووە ڕێکەوتن لەسەر پێناسەکردنی ئاسان نەبێت. ئۆڵمان بەو

زانسته پەسنی دەکات کە گرنگی بە واتای وشە دەدات[٨]، لەلایەکی ترەوە هەندێك "ڕستە بەگرنگترین یەکەی واتای دادەنێت...بەپێی ئەمە وشە واتای سەربەخۆی نییە، واتاکەی لە ناو ڕستەدا دەردەکەوێت. یان واتای ڕستە دەوەستێتە سەر واتای ئەو وشانەی، کە ڕستە پێکدەهێنن"[٩] کاتس‌و فودەر جەختیان لەسەر واتای ڕستە دەکردەوە، چونکە واتای ڕستە دەتوانێت(لێڵی نارێزمانی بدوزێتەوە، دەستنیشانی ژمارەی لێکدانەوەکانی ڕستە بکات، نامۆیەکانی ڕستە ئاشکرا بکات، لێکدانەوەیان بۆ بکات)[١٠] سیمانتیك "خۆ خەریککردنی زانستییە بە واتای هێماکانەوە"[١١] پێناسەیەکی تری سیمانتیك ئەوەیە، کە "بریتییە لەو زانستەی لەواتای فەرهەنگیی هێما زمانییەکان و هاوڕێیەتی و پەیوەندیەکانیان لە کێڵگەی واتایی ، مۆرفۆلۆژی ، سینتاکسدا ، دەکۆڵێتەوە"[١٢]. لە ڕاستیدا ئێمە هەوڵماندا‌وە بە شێوەیەکی گشتی ڕەچاوی هەریەك لەو پێناسانە بکەین لە پراکتیکی مردندا، چونکە پێمانوایە هەریەکێك لەم پێناسانە دەتوانن لە ڕەواندنەوەی تەمومژی ئەم چەمکە هاوکاریمان بکەن.

٣/پراگماتیك:

جیاوازی سیمانتیك‌و پراگماتیك ئاسانە بە وشە، بەڵام بەپراکتیکی گرانە، دەتوانین بڵێین پراگماتیك = واتا – سیمانتیك[١٣]. هەروەك بەوەش پێناسەدەکرێت، کە بریتییە لە"واتای سیمانتیکی + دەورووبەر"[١٤] بەمجۆرەش پێناسەی پراگماتیك دەکرێت "ئەوەی دەوترێ‌و ئەوەی مەبەستە"[١٥] مەبەست ئەوەیە کە بە واتای ڕووکەشی وتنەکە ڕازینابێت بەڵکو واتای قووڵ‌و مەبەستیش دەردەخات، هەربۆیە واتای پراگماتیك کەمتر باپەندی یاساکانە و مەرج نییە کۆمەڵ لەسەری ڕێکەوتبێت، واتە دەشێت خودی بێت‌و بەپێی کەسەکان واتاکەش بگۆڕێت[١٦]. یان دەتوانین بڵێین

پراگماتیك "بریتییە لە لێکۆڵینـەوە لـەمانای قسـەکەر"[١٧]. لـە بنەرەتـدا کـە زانستی پراگماتیك دێتە ئاراوە بەهۆی ئاڵۆزیـەوە بـووە، زاناکـان تێگەیشـتن، کە ناکرێ هەموو دانەو یەکە زمانییەکان بە سـیمانتیك ڕێکخرێـت، لەبەرئـەوە پراگماتیـك بـە چەشنێ کەلێنـەکانی سـیمانتیك پڕدەکاتـەوە، یـان هاوکـاری سـیمانتیکە بـۆ زیـاتر تێگەیشـتن لـە واتـاو مەبەسـتی دەربـڕینو دانـەکان، لەبەرئـــەوە ئێمـــە ســـوودێکی زۆرمـــان لـــە پراگماتیـــك وەرگرتـــووە لـــەم لێکۆڵینەوەیەدا چونکە بۆ دەربڕینی واتاو مەبەستی مـردن پـەنا بـۆ زۆر دانـە بـراوە، تـا مەبەسـتە جیاوازەکـان بگەیـەنرێت، واتـە مرۆڤـەکان لەبەرئـەوەی هەسـتیارنو عـەقڵیان هەیـە، زۆر دانـەیان سـازکردووە تـا ئـەم مەبەسـتە بگەیەنن، دەربڕن.

### ٤/ یەکە واتاییەکان:

بـیروڕای جیـاواز بـۆ جیاکردنـەوەی یەکـەکانی واتـا هەیـە، بـەڵام بەشێوەیەکی گشـتی ئەمانـەن. "وشـە–رسـتە"و[١٨] لێکدان(ئیدیـەم، وشـەی لێکدراو و گرێ–وشەی ئـاڵۆز)– گـوتن–دەق–گوتـار–ئاخـاوتن"[١٩] هاوکـات دەوترێت، بچووکترین یەکەی واتایی ( سێمێم )ە یاخود بچـووکترین یەکـە لـە دروستەی سیمانتیکیدا نیشانەی واتاییە، بەڵام زمانەوانی دیکەش هەیە بـاس لەواتای دەنگی دەکات و پێی وایە ڕەقی و نەرمیو هێزی دەنگـەکان واتایـان هەیەو لە واتای وشەکاندا ڕەنگ دەداتەوە[٢٠] دەکرێت بواری واتایش بە یەکـە واتاییـەکان دابنـێین، بەواتایـەکی تـر هـەر یەکەیـەك واتـای هـەبێت دەبێتـە بوارێکی واتای.

### ٥/جۆرەکانی واتا:

بەو پێیەی مـرۆڤ لەڕێگـەی زمـانو واتـاوە گوزارشـت لـەخۆیو جیهـانو ئـەودیوی جیهـان دەکـات، کەواتـە، واتـا هێنـدەی پەیوەنـدی بەزمانەوەیـە

ئەوەندەش پەیوەندی بە دەرەوەی زمانەوە هەیە، جگە لەوەی مرۆڤەکان ئاستی جیاوازو کولتووررو دنیابینی جیاوازیان هەیە، هەموو ئەمانەش کاریگەریان هەیە لەسەر واتاو جۆرەکانی، جگەلەوەی (زمانەوانان کۆکنین لەسەر جۆرەکانی واتا، تەنانەت هەندێکیشیان لەگەڵ ئەوەشدا نین کە دابەشبکرێت، بەڵام زیاتر بەمەبەستی لێکۆڵینەوە دابەشکاریان کردووە)[٢١] بۆیە زۆر بەکورتی جۆرەکان دەخەینە ڕوو و ئاماژە بەو سەرچاوانە دەکەین کە جۆرەکانی واتایان بە فراوانتر باسکردووە. (بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر واتا لەزمانەوانیدا باسدەکرێت واتای سیمانتیکی، واتای پراگماتیکی) لەم پۆلێنەدا بۆ جۆرەکانی واتا پشت بەو دابەشکاریە بەستراوە کە لەم نامەی ماستەرەدا(پەیوەندییەسیمانتیکییەکان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی کوردیدا) [٢٢] هاتووە، کە واتای دابەشکردووە بەم سێ جۆرەوە(بەکارهێنان، هەست و سۆز ، کەرەستە)

یەکەم/ واتا پەیوەست بە بەکارهێنانەوە: دانە زمانییەکان... لەئەنجامی بەکارهێنانەوە واتاکانیان فراواندەبێت و واتای دووهەمیان بۆ دروست دەبێت یاخود لەئەنجامی بەکارهێنانیان لەڕستەدا ئەرك و ناوەڕۆکێکی نوێیان بۆ دروست دەبێت و بەکارهێنانی لەبارو حاڵەتێکی دیاریکراودا واتای پراگماتیکی دروستدەبێت... پەیوەست بەبەکارهێنانەوە واتا ئەم جۆرانەی هەیە :

a/ واتای فەرهەنگی: "بریتییە لە واتای ئەو وشانەی کە لەفەرهەنگی زمانێکی دیاریکراودا تۆماردەکرێن"[٢٣] واتای فەرهەنگیش بەسەر سێ جۆردا دابەشدەبێت ١/ کرۆکە واتا(بریتییە لەواتای هۆشەکی کەرەستە زمانییەکان، کە کۆمەڵ لەسەری ڕێککەوتوون). ٢/ توێکڵە واتا(ئەو واتا زیادانەیە، کە کەرەستە زمانییەکان لەئەنجامی بەکارهێنان و فراوانبوونی واتاییەوە، لەپاڵ کرۆکە واتادا وەریدەگرن)[٢٤] دەشکرێ ئەو واتایانە بن کە لە نیشانە

واتاییەکانــەوە دەکەونــەوە یــان نیشــانەیەکی واتــایی کرۆکــە واتاکــە قووڵدەکاتــەوە. ٣/ واتــای ئیـدیۆمی (کـە لـەواتای دانـەکانی ئیدیۆمەکـەوە نەهاتووە).

١. b/ واتای ڕستەیی: ئـەمیش بەسـەر سـێ جـۆردا پـۆلێن دەکرێت، ١/ ئەرکی: ئەو واتایەیە، کـە کەرەسـتە زمانییـەکان بـەهۆی ئەرکەکانیانـەوە لـە ڕستەدا وەریـدەگرن، ئـەمیش لـە هـەردوو ئاسـتەکەی زمانـدا دەبینرێت، لـە ئاستی قووڵدا ڕۆڵی بابەتییانەی کەرەستەکانە ( کارا ، کارتێکراو ، .. ) ، لـە ئاسـتی ڕووکەشیشـدا دۆخـی ڕێزمـانی کەرەسـتەکانە. ٢/ باسمەنـدیی: ئـەو واتایەیە، کە لەئەنجامی تێکدانی ڕیزبـوونی ئاسـایی کەرەسـتەکانی ڕسـتەوە پەیدا دەبێت بۆ نموونە :

**ئازاد دەرمانەکەی خوارد .** ڕستەیەکی ئاسایی

**دەرمانەکە ئازاد خواردی .** گرنگی دراوە بە دەرمانەکە .

٣/ نـاوەڕۆك : ڕسـتە جگـە لـەواتای دانـەکانی، نـاوەڕۆکێکی هەیـەو ناوەڕۆکەکــەش مەبەســتی جیاجیــا دەگەیــەنێت، ڕســتەش بــەگوێرەی ناوەڕۆکەکەی پۆلێن دەکرێت بۆ حەوت جۆر:

١. هەواڵی .

٢. پرسیاری .

٣. هەست دەربڕین .

٤. وورووژاندن .

٥. داخوازی .

٦. ڕاپەڕاندن .

٧. موجامەلەکردن .

c/ واتــای بـارو حاڵـەت: هــەموو ئـەو واتــا جیاوازانــە دەگرێتــەوە کــە کەرەسـتە زمانییـەکان لـە بـارو حاڵـەتێکی تایبەتیـدا دەیگەیـەنن و جیـاوازن

لەواتای فەرهەنگی کەرەستەکان، کە (قسەمەبەست و میتافۆڕ و واتای دەرنەبڕاو) دەگرێتەوە"[٢٥].

دووەم/ واتا پەیوەست بە هەست و سۆزەوە: مرۆڤەکان هەست و سۆزیان هەیە، زمانیش هۆکاری گەیاندنی ئەم هەست و سۆزەیە، "جا ئەم هەست و سۆزە لەڕێگەی ئاوازی ڕستەکەوە بێت، یاخود لەڕێی درکاندنی چەند دەربڕاوێکی زمانییەوە بێت.

a/ واتای ئاسایی : ئەمەش هەموو ئەو دەربڕاو و ڕستانە دەگرێتەوە، کە هەست و سۆزێکی تایبەتی تیادا نییەو تەنیا واتای سیمانتیکی کەرەستەکان دەگوازرێتەوە، ئەمەش بە زۆری لە بابەتەکانی خوێندن و لێکۆڵینەوەی زانستەکاندا دەبینرێت، وەك ( مۆرفێم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە ) هیچ هەستێکی تیادا نییە. یاخود (نەخۆشیێکی ترمان بۆ هاتووە بەناوی ئازادەوە.)

b/ واتای هەستدار : ئەمیش سێ جۆرە :

١/ دەربڕاو : بریتییە لەوەی، کە قسەکەر لەپاڵ واتای سیمانتیکی کەرەستەکاندا، دەیەوێت هەست و سۆزی خۆی لەڕێگەی هەڵبژاردنی هەندێ کەرەستەی زمانییەوە یاخود لەڕێگەی ئاوازی ڕستەکەوە بۆ بەرانبەرەکەی دەربڕێت، وەك :

( ٤ ) أ ـ بەداخەوە ئازاد نەخۆشە.

ب ـ ئازاد نەخۆشە . قورسایی لەسەر ئازادەکە بێت

٢/ دەرنەبڕاو : زۆرجار قسەکەر لەباسکردنی کەسێك یان بابەتێکدا یاخود گرنگیدان بەبابەتێکی تایبەتی و باسکردنی هەست و سۆزێکی هەیە بەرانبەر ئەو کەسە، یان ئەو بابەتە بەبێ ئەوەی بە دەربڕاوی زمانی ئاماژەی پێبکات و ئەو هەست و سۆزە دەرببڕێت، بۆ نموونە مرۆڤ کە کەسێکی خۆشبوویت بەردەوام باسی دەکات، یاخود ئەگەر بە بابەتێك ئارام بێت و پێی خۆشبێت بەردەوام باسیدەکات.

٣/واتـای ورووژانـدن : هەنـدێکجار قسـەکەر لەناخاوتنـدا، بـەبێ ئـەوەی هەست و سۆزی خـۆی دەربـبڕێـت، بـەهۆی باسـکردنی کەسـێك یـان بابـەت و شـتێکەوە لـەلای یـەکێك کـە پەیوەندییـەکی دەروونـی لەگـەڵ ئـەو بابەتـەدا هـەبێت، هەسـتی گـوێگر دەورووژێنێـت و وادەکـات گـوێگر کاردانەوەیـەکی بەرانبەر قسەکانی هەبێت، بۆ نموونە کاتێك دووکەس پەیوەندیان بـاش نییـە بچیت لای یەکێکیان هـەواڵی ئـەویتریان باسبکەیت بـەباش یـاخود بـەخراپ کاریگەری لەسەر دەبێت و کاردانەوەی بۆ قسەکانت دەبێت"(٢٦).

سێیەم/ واتا پەیوەست بەکەرەستەوە:

a/ واتای وشە: بریتییە لە چەمکێك / کۆزانیارییەك، لەبارەی شتێك یـان دیاردەیـەك، کـە لـەڕێی پەیوەندییـەکی لەخۆوەییـەوە هێمایـەکی زمـانی دەیگەیـەنێت " واتـە وشـەکان یـاخود مۆرفیمـە سـەربەخۆکان ئـەو واتایـەی دەیگەیـەنن، چـەمکێك یـاخود کۆمـەڵێك زانیارییـە لـەبارەی شـتەکان و دیاردەکان و جۆرو خاسیەتەکانیان .

ئەحمەد موختـار واتـای وشـەکانی بەسـەر چـوار جۆردا دابەشکردووە، ئێمە ئەو چوار جۆرە دەکەین بەسێ جۆرەوە بەم شێوەیە :

١. ناو : ئەمیش دوو چەشنە:

ا . ئەو ناوانەی، کە واتایەکی گشتیان هەیەو ناون بەرانبەر کۆمەڵێك یان ژمارەیەکی زۆری کەرەستە وەك ( پیاو ، مرۆڤ ، ژن ، کوڕ ،... ) .

ب. ئـەو ناوانـەی، کـە خـودین و تایبـەتن و تـەنیا کەسـێك یـان شـتێك دەگرێتەوە، وەك ( ئازاد ، نەوزاد ، سلێمانی ، هەولێر ، ... ) .

٢. هەندێك وشە واتای خاسیەت و تایبەتێتی و چۆنایەتی و چـەندایەتی دەگەیەنن، وەك : ( ئاوەڵناوەکان ، ئاوەڵکردارەکان ) .

٣. ئـەو وشـانەی، کـە واتـای ڕووداو و کـار دەگەیـەنن، وەك:(کـردن، خواردن ، ڕۆشتن ...)

b/ واتای لەهەناودابوون :

هەندێك لەكەرەستە زمانییەكان ڕاستەوخۆ خۆیان واتا ناگەیەنن تا نەچنە پاڵ مۆرفێم و كەرەستەی تر، واتە واتاهەڵگرن و كاتێك لەگەڵ وشەكان بەكاردەهێنرێن و وشەكان بەیەكەوە دەبەستنەوە واتاكانیان دەردەكەوێت، ئەوانیش ( مۆرفێمە بەندەكان ، مۆرفێمی سفر ، هێز و ئاوازە)ن .

c/ واتای ڕستە: بەو پێیەی، كە لەڕستەدا ، جگە لە واتای فەرهەنگی وشەكان، پێڕەو و ڕیزبوونەكانیش ڕۆڵیان لەڕووی واتاییەوە هەیەو واتایەكی فراوانتر دەدەن بەڕستە. كەواتە واتای ڕستە بریتییە لەو بیرەی، كە لەواتای فەرهەنگی پێكهاتەكان و پەیوەندییە سینتاكسییەكانەوە دروستدەبێت و دەبێتە (واتاو ناوەرۆك و مەبەست)، بۆ نموونە ڕستەیەكی وەك :

( ٥ ) سەدام حسێنی سەرۆكی عێراق دەستگیركرا .

واتا ( سەدام حسێنی سەرۆكی عێراق دەستگیركرا )

ناوەرۆك ( جەنگی عێراق – ئەمریكا كۆتایی پێهات )

بەگوێرەی بارە جیاوازەكان دەكرێت چەندین مەبەستیی جیاوازیشی هەبێت :

لەدیدی كوردێكەوە ( سەركردە خوێنمژەكەی دژی كورد دەستگیركرا )

لەدیدی وڵاتانی عەرەبییەوە ( سەركردەیەكی نەتەوەییان دەستگیركرا )

لە لای ئەمریكییەك ( لایەنی بەرانبەر لەشەڕدا دەستگیركرا )

بۆ كەسێكی بێلایەن و ئاسایی ( هەواڵی گیرانی كەسێكە )... تاد،

d/واتای دەق: ئەو واتایەی لە دەقێكدا دەردەبڕدرێت، واتایەكی فراوانترە و زۆرجار ڕوونتر دەبێت لەو واتایەی، كە وشەو ڕستەكان بەتەنیا دەریدەبڕن، بەتایبەتی واتای پراگماتیكی، چونكە زۆرجار ئەگەر واتای ڕستە بە ڕستەی دەقێك بەجیا لەیەكبدەینەوە، ڕەنگە بەئاسانی لەمەبەست و

واتــای پڕاگمــاتیکی ڕســتەکان تێنەگــەین، بــەڵام کاتێــك تــەواوی دەقەکــە بەیەکــەوە لێکبدەینــەوە، مەبەســت و واتــا پڕاگماتیکییەکــەی ڕوونــتر دەردەکەوێت"[٢٧].

لەلایەکی ترەوە، د.عبدولواحید موشیر دزەیی، بەم جۆرە جۆرەکانی واتای دابەشیکردووە:

١/واتای وەسفی(هۆشەکی)

٢/واتای ناوەسفی(کاریگەری-بارکراو)

جۆرەکانی واتای ناوەسفی(بارکراو) ئەمانەن (واتای ڕاگەیاندن-واتای شێواز-واتای کاریگەری(دەروونی)-واتای ڕەنگدانەوە-واتای هاوڕێیەتی-واتای بابەتی)[٢٨]

٦/ تیۆرە واتاییەکان:

تیۆرگەلێك هەن بۆ لێکدانەوەی واتا[٢٩] هەر یەکێکیش لەو تیۆرانە لایەنی باشەو خراپەی تێدایە[٣٠] ئێمە هەوڵدەدەین واتاکانی تایبەت بەمردن بخەینەروو، هەر بۆیە بەشێوەیەکی بنەڕەتی تیۆرێك ناکەینە سەرپشك، بەڵکو هەوڵدەدەین سوود لەتیۆرەکان وەربگرین، بەتایبەتیش تیۆری بەکارهێنان، لەبەرئەوە تەنیا بەناو تیۆرەکانی تر دەخەینەروو، بەڵام تیۆری بەکارهێنان فراوانتر ئاماژەی پێدەدەین.

١/تیۆری هێما(ناولێنان)

٢/ تیۆری ڕەوشتی

٣/تیۆری هۆشەکی

٤/تیۆری گێلگە واتاییەکان

٥/تیۆری لۆجیکی

٦/تیۆری پراگماتیکی

٧/تیۆری مۆر–کواین

٨/تیۆری فریگە

٩/تیۆری هۆشەکی هەستی

١٠/ سیمانتیکی لێکدەرەوەیی

١١/ سیمانتیکی بەرهەمهێنەریی

١٢/ تیۆری بەکارهێنان:[٣١]

ئەم تیۆرە لەلایەن(جۆن رۆبەرت فیرس)ەوە داهێنراوە، "ئەم تیۆرە لەسەر ئەو تێڕوانینە بەندە بۆ واتا بەو وەسفەی کە(ئەرکی بەکارهێنان)ئەنجام دەدات"[٣٢]

لەم تیۆرەدا زیاتر جەخت لەسەر (دەوروبەر) دەکرێتەوە، ئیدی ئەو دەوروبەرە دەشێ زمانی بێت، دەشێ لە دەرەوەی زمان بێت، (واتای وشەو گوتنو دەستەواژەکان بەگوێرەی دەوروبەری بەکارهاتوو واتا دەدات، وشە واتایەکی شاراوەی هەیە لەکاتی بەکارهێناندا بۆ لێکدانەوەی وشە دەبێت سەیری ئەو دەوروبەرە بکرێت، کە وشەکەی تیا گوتراوە)[٣٣] بۆیە دەتوانین بڵێین "واتای وشە بریتییە لە کۆی بەکارهێنانەکانی"[٣٤] ئەم گرنگیدانە بەبەکارهێنانو دەوروبەر لەوەوەیە کە وشەکان گۆڕانی واتاییان بەسەردا دێت یان واتا کۆنەکەی لەدەست دەدات، (بۆئەوەی واتاکانی وشەیەك بزانین دەبێ لە یاسا تەواو و پڕاوپڕەکانی بەکارهێنان ئاگاداربین، بەکارهێنانیش لە ڕستەو دەربڕاو، کردەی گفتوگۆو لەیەککەیشتندا دەبێت)[٣٥] بۆ دەستنیشانکردنی واتای وشە کلیمر چوار جۆر دەوروبەر جیادەکاتەوە.

١/دەوروبەری زمانی(پەیوندی ناوەوەی زمان– پەیوەندی دەوروبەری ئاخاوتن)

٢/دەوروبەری دەروونی(ئەمجۆرە پلەی سۆزوکاریگەری دیاری دەکات).

٣/دەوروبەری بار(ئەو بارە ڕووندەکاتەوە کە وشەکەی تیا گوتراوە (بۆ نموونە، لەکاتی پرسەدا، دەگوترێت (خوا لێی خۆشبێت) وەڵامی خاوەن پرسە لەو بارەدا (خوا لەهەمومان خۆشبێت–لەگەڵ مردووی حازریدا)دەبێت.

٤/دەوروبەری کولتووری (ئەو کولتوورەی کە وشەکەی تیا دەگوترێت ڕووندەکاتەوە)[٣٦] بۆ نموونە ئەم دەربڕاوە "بمردیتایەوە ئەو کارەت نەکردایە" کولتووری کورد دەردەخات، کە کارو ئاکاری زۆر لا بایەخدارە. بەپێی هەندێ لە توێژەرانو زمانناسان ئەم تیۆرە بۆیە گرنگە، چونکە لەچوارچێوەی زمان دەرناچێت، یان لەزانستەکانی ترەوە بۆ واتا ناچێت، بەڵام وشە لەژێر دەسەڵاتی قسەکەردایە چۆنی بوێ واتای پێدەدات، واتە چۆنی بەکاربێنێ ئەو واتایە دەداتو لە واتا ڕاستەقینەکەی دووردەکەوێتەوە[٣٧]. لەبەرئەوە ئەم تیۆرە لەسەر ئەوە وەستاوە، کە دەگوترێتو لە کوێو لە چ کاتو دۆخێکدا، لە چ دەوروبەرێکدا وتراوە. واتە سنوورەکانی ئەم تیۆرە پەیوەستە بە سنوورەکانی زانینی ئەو دۆخو دەوربەرەی قسەکەر قسەی تیا دەکات، تا باشتر بتوانیت ئەو دەوروبەرە بناسیت، یان تا باشتر بتوانیت خۆت بخەیتە ئەو دۆخەیە قسەکەرەوە باشتر دەتوانیت ڕاڤەو شیکاری دەربڕاوەکە بکەیتو لێی تێبگەیت.

## سەرچاوەکان بەشی دووەم:


١/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو رستە، چاپخانەی رۆژهەلات-هەولێر، چاپی یەکەم، سالّی ٢٠١٠،ل.١٥.

٢/پەروین عوسمان مستەفا عەللاف، واتاو وەرگێران، لێکۆلّینەوەیەکی واتاسازییە، دەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، سالّی ٢٠٠٩.ل٧٠.

٣/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، کاریگەری دەروونی لەبواری راگەیاندندا-لێکۆلّینەوەیەکی سیمانتیکی و پراگماتیکییە، دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم-هەولێر،سالّی ٢٠٠٩. ل ١٨.

٤/ د.عبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی، چەند لێکۆلّینەوەیەکی سمانتیکیو پراگماتیکییە، دەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، سالّی ٢٠٠٩، ل ٨٥.

٥/ فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیکییەکان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی کوردیدا، نامەی ماستەر بلّاونەکراوە-ل. ٤).

٦/کلۆدجێرمان، ریمۆن لۆبلان، و.د. یووسف شەریف سەعید، واتاسازی، دەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، سالّی٢٠٠٦.ل. ١.

٧/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو رستە، چاپخانەی رۆژهەلات-هەولێر، چاپی یەکەم، سالّی ٢٠١٠،ل.٤٣،

٨/سەرچاوەی پێشوو.ل.١٧.

٩/سەرچاوەی پێشوو. ١٨.

١٠/کلۆدجێرمان، ریمۆن لۆبلان، و.د. یووسف شەریف سەعید، واتاسازی، دەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، سالّی٢٠٠٦.ل ل.١٧-١٩-٢٠

١١/د. محمەدی مەحویی، زانستی هێما، هێما، واتاو واتا لێکدانەوە، بەرگی یەکەم- چاپخانەی پەیوەند-سلێمانی، چاپی یەکەم، سالّی ٢٠٠٩. ل ٣.

١٢/فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیکییەکان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی کوردیدا، نامەی ماستەر بلّاونەکراوە-ل٦.

١٣/سەرچاوەی پێشوو.١١

١٤/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، زانستی پراگماتیك، چاپخانەی پاك-هەولێر، چاپی یەکەم، سالّی، ٢٠١٠. ل ٤٩.

١٥/ئاڤێستا کەمال مەحموود، پراگماتیکی رستەی پرسیارو فەرمان لەزمانی کوردیدا، مەلّبەندی کوردۆلۆجی-سلێمانی، چاپی یەکەم، سالّی ٢٠٠٩. ل. ٣٩.

١٦/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی ، زانستی پراگماتیك، چاپخانەی پاك-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی، ٢٠١٠. ل.٤٩
١٧/فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیكییەكان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی كوردیدا، نامەی ماستەر بڵاونەكراوە-ل٦٧ .)
١٨/كلۆدجێرمان، ریمۆن لۆبلان، و.د. یووسف شەریف سەعید، واتاسازی، دەزگای موكریان-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی٢٠٠٦.ل١٦٧
١٩/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو رستە، چاپخانەی رۆژهەلات-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٠،ل ٤٥-٤٦-٤٧.
٢٠/فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیكییەكان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی كوردیدا، نامەی ماستەر بڵاونەكراوە-ل. ١٢ )
٢١/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو رستە، چاپخانەی رۆژهەلات-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٠،ل ٨٢.
٢٢/فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیكییەكان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی كوردیدا، نامەی ماستەر بڵاونەكراوە-ل.١٤)
٢٣/پەروین عوسمان مستەفا عەللاف، واتاو وەرگێران، لێكۆڵینەوەیەكی واتاسازییە، دەزگای موكریان-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٩.ل ٩٧.
٢٤/فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیكییەكان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی كوردیدا، نامەی ماستەر بڵاونەكراوە-ل.١٥)
٢٥/سەرچاوەی پێشوو.١٦
٢٦/سەرچاوەی پێشوو. ١٧
٢٧/سەرچاوەی پێشوو.١٩
٢٨/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو رستە، چاپخانەی رۆژهەلات-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٠،ل.٨٢-١٠٤.
٢٩/سەلام ناوخۆش، نەریمان ناوخۆش، زمانەوانی-بەرگی یەكەم، دووەم، سێیەم، چاپخانەی منارە-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٩. ل.٢٩١)
٣٠/فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیكییەكان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی كوردیدا، نامەی ماستەر بڵاونەكراوە-ل. ٢٢)
٣١/لەم چوار سەرچاوەیەوە وەرگیراوە(سەلام ناوخۆش، نەریمان عەبدوللا خۆشنا. زمانەوانی-٢٩١-٣١٨) (د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو رستە. ٥٤-٨١) (د.محەمەد

مەحوی، ئاوەزداریی و ڕێزمانی ناوەڕۆك–وابەستە، وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی–زانکۆی سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۰٦.– ۳–٥)( فەرهاد تۆفیق حەسەن)
۳۲/سەلام ناوخۆش، نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، زمانەوانی–بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، چاپخانەی منارە–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۰۹. ل.۲۰۳
۳۳/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو ڕستە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۱۰،ل ۷٦
۳٤/سەرچاوەی پێشوو۳٤.
۳٥/د. محەمەدی مەحویی، زانستی هێما، هێما، واتاو واتا لێکدانەوە، بەرگی یەکەم–چاپخانەی پەیوەند–سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۰۹. ل.١٥٥
۳٦/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو ڕستە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۱۰،ل.۷۲–۷۳)
۳۷/سەلام ناوخۆش، نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، زمانەوانی–بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، چاپخانەی منارە–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ۲۰۰۹. ل۳۰٦.

## بەشی سێیەم:

بەرلەوەی ئاماژە بە واتای مردن بەپێی فەرهەنگی کوردی- فارسی- عەرەبی- ئینگلیزی بدەین، بەپێویستی دەزانین فیچەرە(سیما) واتاییەکانی چەمکی (مردن) بخەینەڕوو:-

١/ ئەو فیگەرە واتاییەنەی بەپێی کۆزانیاری زمانی واتای دروستەی زمانی دەگرێتە خۆ.

٢/ئەو فیگەرانەی بەپێی کۆزانیار دنیایی لەچەمکی مردن دا بەرجەستە دەبن.

١/ فیگەرەکانی مردن بەپێی کۆزانیاری زمانی:

- ژیان
- جووڵە
- وزە
- بیرکردنەوە
+ ڕەهایی

٢/ فیچەرەکانی مردن بەپێی کۆزانیاری دنیایی:

+- مردن (مردنی مرۆڤ قۆناغی چاوەڕێیە، مردن نییە نەقڵە)
+- زیندوو(با بمرم ئەوکات دەتانبینمەوە)
+- خودی
+ - ڕەنگ(ڕەنگی مردوی لێنیشتووە)
+- کەرت(نیوە مردووی کرد)
- هەستکردن
- جیاوازیکردن (بەهەژاریو دەوڵەمەندی نییە-بەگەنج و پیری نییە)

+ دەسەڵات

+ ڕاستەقینەیە(مردن حەقە)

+بێدەنگی(دەڵێی خۆڵی مردووی بەسەردا کراوە)

+سستی(دڵمردوو–دەممردوو)

+ ترس

+دڵەڕاوکێ

+ ئازار

+خێرایی(چەند خێرا بێت پێشی مردن نادەیتەوە)

+– بە بابەتکردن

+– سەرکۆنەکردن(بمریت لەو حاڵەت باشترە)

+– ڕزگارکەرە (گەر مردن نەبوایە چیمان بکردایە– خوا من بکوژی‌و نەجاتمبدات)

ئەم سیماو خەسڵەتو ئەدگارە واتاییانەی مردن گرنگی خۆی هەیە لە تێگەیشتن‌و کەشفکردنی واتای مردندا، لەبەرئەوەی کۆی ئەم سیماو ئەدگارانە ناوەرۆکێک دروستدەکەن، کە دەتوانین ناوی بنێین ناوەرۆکی مردن، بەواتا چەمکی مردن لەو ناوەرۆکە هاتۆتە ئاراوە، چونکە تەواوی ئەو خەسڵەتانەی کە پێشتر خستمانە ڕوو، ناوەرۆکێکی بۆ مردن پێکوتین، ئەو ناوەرۆکەش هیچ نییە جگە لە چەمکی مردن، بەڵام ئەوەی ئێستا گرنگە ئەو خەسڵەتانە بەبۆشی بەجێنەهێڵین، کە دەبێت بەکارهێنانەکانی ئاماژە پێبدەین، هەروەك لە بەکارهێناندا نیشانە واتاییەکانی مردن ڕوون و ئاشکراتر دەبن خۆیان دەردەخەن، هەم ئەوەش پشتڕاست دەبێتەوە، کە ئەم سیمایانە تەواوو دروستن، چونکە گەر بەکارهێنان نەبێت چۆن دەتوانین جیاوازی بکەین لەنێوان مردن‌و مەرگ، یان پاك‌و خاوێن...لەبەرئەوە لەم بەشی سێیەمەدا بەفراوانی بەکارهێنانەکانی مردن‌و مەرگ‌و هاوواتاکانی مردن

دەخەینە ڕوو هەتاوەکو سیما واتاییەکانی مردنو ناوەرۆکی چەمکی مردن ڕوونتر بێت.

- یەکەم/ مردن لەفەرهەنگە جیاوازەکاندا:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ڕەچاوی ئەوەمانکردووە بەپێی فەرهەنگە جیاوازەکان واتای مردن بخەینەڕوو، بەم پێیە مردن/مەرگ لەفەرهەنگی، فارسی/فارسی- عەرەبی/عەرەبی- ئینگلیزی/ ئینگلیزی، هاوکات بەبەکارهێنانی چەندین فەرهەنگی کوردی/کوردی- فارسی / کوردی- کوردی/ فارسی بەرجەستەی واتاکانی مردن کراوە.

**١/ لەفەرهەنگی فارسی/فارسیدا:**

١. مرگ : توقف کامل و پای دار فعالیت های زیستی...

وەستانی تەواوەتیو هەمیشەیی چالاکییە بایۆلۆژیو ژیانییەکان.

٢. مرگ: نابودی... (روزی مرگ امپریالیسم فرا می رسد).

لەناوچوون...( ڕۆژێك مەرگی ئیمپریالیزم هەر دادێت). لە زمانی کوردیشدا بەشێوەیەکی بەرتەسك لە بڵاوکراوەکاندا یان لای دەستەبژێر، واتە وەك چۆن دەوترێت مەرگی شار، مەرگی نووسەر، مەرگی دیکتاتۆرییەت، دیموکراسییەت... واتە کۆتاییهاتنو لەناوچوونی ئەو دیاردەیە.

٣. مرگ : مشکل، ناراحتی، درد.

وەکو سووکایەتیو مەجاز بەکاردێت بە مانای گرفت، بێتاقەتی، ئازار. لەزمانی کوردیشدا بۆ ئەم مەبەستە مردن بەکاردێت(بڕوانە نموونە کوردییەکانی کانی ئەم بەشە)

٤. مرگ (تصوف): ترك قیودو علایق دنیویو توجه به عوالم معنوی.

لـه سـۆفیگەریدا: تـەرکی کـۆتو بەنـد و حـەزو ئـارەزووی دنیـایی و ڕووکردنە دنیای مەعنەوییـە. بێگومـان ئەمـەش شـێوەی گشـتی نییـە بـەڵکو لەناو کتێبو لای دەستەبژێر ئەمـە بـوونی هەیـە، وازهێنـانو فەرامۆشـکردنی ئەم دنیایە.

٥.مردن: خاموش شدن، چنانکه اتش و چراغ...

کوژانەوە، وەکو کوژانەوەی ئاگر و چرا.[١].

**٢/ لەفەرهەنگی عەرەبی/ عەرەبیدا:**

لـە زمـانی عەرەبیـدا وشـەگەلێکی زۆر بـەکاردێت (المنیـة، الحتـف، الوفاة...)، ئەمە هەندێکیانە

١) مانای الموت: پێچەوانەی ژیان.

بە مانای دژ یان پێچەوانەی ئەقڵو ئیمانیش بەکاردێت. وەك لە قورئاندا هاتووە (الانعام ١٢٢: اومن کان میتا فاحییناه وجعلنا لـه نـور یمشـی بـه فـی النـاس)_ کەسـێك کـە مردبێـتو ئێمـە زینـدوومان کردبێتـەوەو نورێکمـان پێدابێت، واتە لێـرەدا مردوو/مـردن بـەمانای بـێ بڕوایـی بـەکارهاتووە... لـە (الروم، ٥٢: فانك لا تسمع الموتی) واتـە تـۆ نـاتوانی کارێـك بکـەیت مـردووان بتبیسـتن، ئاشـکرایە مەبەسـت لێـی مرۆڤـانی دڵـڕەقو بـێ بـاوەڕە. لـەزمانی کوردیشدا زۆرکات بەکاردێت کەسێك کە بێ بڕوا بێت، یـان خراپەیـەك بکـات، خوا ئیمانی سەلامەت بکات، واتە خوا ئیمانی بپارێزێت، ئیمانی نەمرێت، یـان ئیمـانی هەمیشـە زینـدوو بـەهێز بێـت. هـەروەها لـەئایینی ئیسـلامدا مرۆڤـی موسڵمان نامرێت، واتە کە دەشیکەنە گۆڕەوە ئـەو ئاگـای لـە زیندووەکانـە، بۆیە زۆرکات کە کەسـە زینـدووەکان لـە گۆڕسـتان بـۆ مردووەکـان دەگـرین، پێیـان دەوترێـت ئـازاری مردووەکـە مـەدەن، چـونکە بـەو گریانـەت ئـازاری دەدەیت.

هەروەها مانای ئەوەش دەدات کە پێچەوانەی سروشت/فیترەت بێت و لاوازی بکات، وەك خەم و ترس. وەك لە قورئاندا هاتووە (ابراهیم، ١٧: ویاتیە الموت من کل مکان وما هو بمیت).

بە مانای بارودۆخی قورس و نالەباریش دێت، وەك هەژاریی و بێدەسەلاتی و پیریی و گوناهکردن، کە بێگومان لەزمانی کوردیشدا بۆ هەمان مەبەست بەکاردێت، لەبرسا مردن، نالەو نرکە و ئازارو هاواری وای مردم... (بڕوانە نموونە کوردییەکانی ئەم بەشە)

٢) مانای چەند وشەیەك کە لە مانای وشەی مردنەوە نزیکن:

٣) الموبق: شوێنی بەندکردن، کات یان ژوان، بەربەستی نێوان دوو شت. لە قورئانیشدا هاتووە( الکهف ٥٢: و جعلنا بینهم موبقا). لێرەدا مانای تیابەرە(لەناوبەرە)، واتە پەیوەندییان لە دنیادا بووە هۆی لەناوبردنیان. دیارە مرۆڤ کە دێتە دنیاوە مردنیش لەگەڵ خۆی دێنێت. هەروەك کورد دەڵێت. دنیا هەر مردنە.

٤) الموتغە: مانای لەناوبەر یان تیابەر.

٥) الموتمە: واتە بازنە یان خولگە، وەك شتێك کە بخولێتەوە و کۆتایی بێت. واتە زنجیرە بەندی هەروەك لە زمانی کوردیدا دەوترێت (لەگەنجییەوە بۆ پیری لە پیرییەوە بۆ مردن).

٦) الموثق: کەسێك گرێبەستەکان بە شێوەی ڕەسمی بقەبڵێنێت، یان تۆماریان بکات. واتە دروستکەری بەڵگەنامەکان، بە مانای بەڵێنیش دێت.

٧) الموجح: ڕێگەیەکی فراوان، پان و پۆڕ.

مانای جلێکی تەسك و ئەستووریش دەدات. مرۆڤی کورد لەکاتی تەنگە نەفەسیدا دەڵێت وای مردم، یان کاتێك بێزارو ناڕەحەت دەبێت، تەسکی جێگاکەی یان جل و بەرگەکەی بێت. (کەسێك لەناو ئۆتۆمبێل کەوتووەتە نێوان دوو کەسی قەڵەوەوە، جێگەیان تەسکە زۆر بێزارە دەڵێت مردم تا

گەیشتینە جێ... واتە وشەی مردن بەکاردێنێت، چونکە مردنیش بۆ مرۆڤ ئازاراوییە، تەنگەنەفەسییە.[٢].

### ٣/ لەفەرهەنگی ئینگلیزی/ ئینگلیزیدا:

١. Dead: n. adj. adv مەرگ، مردن

a. Not alive: واتا: نازیندوو، چیدی ناژی، زیندوو نییە.

b. Idea، Belief، Plan ، واتا چیدی باوەڕی بەو شتە نییە، باوەڕنەمان بە ئیدیۆلۆگییەک، پلانێک...لە زمانی کوردیشدا لەهەندێ دۆخدا ئەم واتایەی دەبینرێت لە کەسێک دەپرسن فلان لە کوێیە دەڵێت مرد، ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت بەنسبەت ئەمەوە مردبێت، واتە من ئیدی نایناسم باوەڕم پێی نەما، یان بۆ نموونە ئایدۆلۆژیاکان، ئێستا کەمتر باسی شوعییەت و مارکسییەت دەکرێت، لەهەندێ گفتوگۆدا دەڵێن شوعییەت مرد، مارکسییەت مرد...

c. Not used شتێک ببێ بەڕابوردوو، چیدی بەکارنەیە، چیدی باو نەبێ.

لەزمانی کوردیدا زیاتر بێکەڵکبوون و بەسەرچوون بەکاردێت، چونکە هەر تەواوبوون دەگرێتەوە لەو شوێنەدا کە شتێک کاتی بەسەر دەچێت، یان ئۆتۆمبێلێک یان هەر ئامێرێکی تر مۆدێلی بەسەر چوو بۆ (مرانن)و فڕێدان و سووتاندن بەکاردێت. دەشێ بەهۆی بایەخدانێکی زۆر بەکەسی مردوو ئەم واتایە لەزمانی کوردیدا نەگەیەنێت، یان دەشێ زۆر بەکاڵی و لەناوچەیەکی تەسکدا.

d. Finished تەواوبوون، چیدی ناتوانرێ بەکاربێ. لەزمانی کوردیدا تەواوبوون بۆ کەسی مردوو بەکاردێت، یان دەشێ تەواوبوون، بەکارنەهاتن بۆ چەندین شت بەکاربرێت(چەسپەکە مردووە— پاتریەکە مردووە...)

e. Machine ئامێرێک، ماشینێک، کە چیدی کارناکا و ناتوانرێ بەکاربێ. لەزمانی کوردیدا (پاتریەکەی مردووە).

f. Place شوێنێکی زۆر بێ دەنگ و بێ چالاکی، بۆ نموونە: شارێك (شارێکی مردووە). بێگومان لەئاستێکی گشتیو تایبەتیدا بەکاردێت، واتە دەشێ بەشێوەیەکی تایبەتی(لای ڕۆشنبیران وەك ڕەخنەگرتن یان هەڵسەنگاندن زۆر بەکاربێت) بەڵام دەکرێ لای خەڵك بەشێوازی بازاڕیانە وەك تانەدان، یان بەئاگاهێنانەوە بەکاربێت.

g. Business شوێنێکی بێ چالاکی ئاڵوگۆڕی بازرگانی. ئەم واتایە هاوشێوەی (f)یە، بەکارهێنانەکەیان لەیەك نزیکە.

h. Tired ماندووبوون و شەکەتبوونێکی زۆر (بڕوانە نموونە کوردییەکانی ئەم بەشە).

i. Without feeling بێ هەست، ناتوانێ هەست بکا (بڕوانە نموونەکانی ئەم بەشە).

j. In sport لە وەرزشدا، لە دەرەوەی گۆڕەپانی یاری. p ٣٩٠. دەشێ لە کوردیدا بەمجۆرە واتای نەبێت، بەڵام دەشێ ئەمەش بگرێتەوە، کاتێك کە یارییەکە تەواو(مەرجیش نییە) دەبێت، یاریکەرێك بە یاریکەرێکی تر دەڵێت بە پەستیو توورەییەوە. ئەوە مردبووی نەتدەتوانی پاسێکم بەیتێ یان نەتدەتوانی بیکەیت بەگۆڵدا. هاوکات دەشێ بینەرەکان لەدەرەوەی گۆڕەپان لە هەڵچوونی گەمەکەدا ئەمە بڵێن بەرانبەر بە یاریکەرێکی دیاریکراو(مردووە ناتوانێت بیکات بەگۆڵ).

٢. Death: n کۆتایی ژیان. کۆتایی هەمیشەیی شتێك... هۆکاری مردن، مەرگ. ئەو هێزە (دەسەڵاتە)ی، کە ژیان تێکدەدا.p ٣٩٢ (بڕوانە نموونەکانی ئەم بەشە)

٣. Die: v. n وەستانی ژیان، وەستانی زیندوویەتی. وەستان و کۆتایی هاتنی لێرەبوونی شتێك...p ٤٢٢ (بڕوانە نموونەکانی ئەم بەشە)

٤. Mortal: n. adj بمر: شتێك، كە ناتوانێ بۆ هەمیشە بژی و بە زیندوویی بمێنێتەوە، بەڵكو دەبێت بمرێ. جگەلەوەی بەمانای مەرگی بەكۆمەڵیش دێت، كە بەهۆی جەنگ یان دیاردە سروشتیەكانی وەك بومەلەرزە، تۆفاو ڕوودەدات. بەمانای بكوژیش واتە(گیان سەندن) دێت[٣].
(بڕوانە نموونەكانی ئەم بەشە)

دووەم/ هاوواتاكانی مردن:

١/ هاوواتا چییە؟ بریتییە لە دوو وشە یان زیاتر كە یەك واتا ببەخشن، لەبری یەكدی بەكاربێن[٤]. لەسەر بنەمای ئەو پێناسەیە دەمانەوێت هاوواتا كانی مردن بخەینەڕوو یان بەپێی دەورووبەرە جیاوازەكان ئەو دەربڕاوانەی بۆ "مردن" بەكاردەهێنرێت كە نزیكی واتاییان هەیە. لەبەرئەوەی هاوواتای تەواو نییە(گەر هەشبێت دەگمەنە، ئەوا دەڵێین بەپێی نزیكی واتاكانیان یان هاوبەشییەك هەیە، كە ئەمەش زیاتر دەورووبەرە جیاوازەكان هۆكارە بۆ دەرخستنی ئەم هاوواتایانە[٥]، هەرچەند ئەوەش وەك پرسیار دێتەپێش، كە ئایا دەتوانین ناوی هاوواتای لێبنێین كە فەرهەنگ بۆ پەسنو ڕوونكردنەوەو بەكاریدەهێنێت؟[٦] بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین، بەهۆی پێویستیو یاخود زۆر دووبارە نەبوونەوەی هەمان وشە بۆ هەمان مەبەست زۆركات نووسەرانو لێكۆڵەران وشەی دی لەزاری تر یان بەهۆی دروستكردنی وشەیەكی ترەوە، دەشێ بەهۆی ئەوەی ئێستا پێی دەوترێت پاشاگەردانی هۆكار بێت. هاوكات لەو وشانەدا كە بۆ مردن بەكاردێن نەرمیو ڕەقی، توندی هەیە، واتە لایەنداری تیایە، دەشێ ڕقت لەكەسێ بێت بڵێیت تۆپی(مرد). هاوكات بەپێی ئاینو دیالێكتە جیاوازەكان، یان بەپێی سیاسەتو لایەنی كۆمەڵایەتی و سەپاندنی زمان(لەلایەن ڕژێمێكی دیكتاتۆری) خێزانە زمانی هۆكاربێت بۆ هاوواتا. زۆر هۆكار هەن بۆ هاوواتا، یان بۆ ئەوەی وشەی تر

بەکاربێت بۆ ئەو دیاردەیە، خۆ دەشێ حاڵەتی زۆر لاوازو پێشبینی نەکراو هەبن هاوواتایان دروستکردبێت، وشەی (بەروار) بووە هۆی دروستبوونی هاوواتا، کە لە هەڵەیەکی بچوکەوە ئەو وشەیە بۆ ئەو مەبەستە دروسبوو.

بەلاّم زۆر گرنگە ئەوە بڵێین کە جیاوازی مەرگو مردن ئاسان نییە، بەلاّم مەرگ کەمتر یاسابەند دەکرێت، وەك لە مردن، ئەم نمونانە بەراورد بکەن بە مەرگ(نەمری–بمری–مردی– مردووەکە– نیوە مردوو–رەنگی مردوو–دەمی مردوو– مردوومریّ–...) هاوکات مەرگ زیاتر وەك "چەمك"و "نوخبەویە"و (ئەمە ڕەهانییە– چونکە مەرگم پێش مەرگت کەویّ –جوانە مەرگ...) هیچ پەیوەندی دەستەبژێرەوە نییە، بەلاّم مەرگەسات–مەرگی نووسەر– پێشمەرگە– هاوکات لەنوسینی شیعرو ناوی کتێبەکاندا (دەرکەوتەی دڵخۆازی مەرگ– ڕارەوەی مەرگ – داهێنانو مەرگ – چێژی مەرگدۆستی...)[٧]. لە لایەکی دییەوە گەر ورد سەرنج بدەین، هەست دەکەین مەرگ زیاتر خۆویستییە، واتە خۆت مەیلی مەرگ دەکەیت، بەلاّم مردن خۆسەپێنەرە. هەروەك مردن زیاتر بەکاردێت لەو دۆخانەی مرۆڤ تێی دەکەوێت یان بۆ گوزارشتکردن لەحاڵی مرۆڤ، یان بۆ شتەکانی چواردەوری بەکاریدێنێت.(زیاتر لەژیانی ڕۆژانە)دڵمردوو–دەممردوو– لەبرسامردن– پاتری مردوو– دایك مردوو...).

هاوکات لەڕووی کەتیگۆرییەوە مەرگ ناوە مردن چاوگ یان کرداری ناوییە، لەبەرئەوە گەردان دەکرێت بۆ "مرد– مر– بمر– نەمر...) قەد لە مۆرفۆلۆژیدا ئەو لاگرانەی دەچنەسەر ڕەگی (مرد) بۆ بەرهەمهێنانی وشەی نویّ لەقەدی (مر) بەبرشترە. بەلاّم مەرگ بەبەراورد بە (مردن) لەبواری مۆرفۆلۆژیدا کەمتر بەرهەمدارە، بەڵکو وەك لەسەرەوە باسمکرد پتر دەستەواژەو زاراوەی لێ سازکراوە. هەربۆیە مردن بەهۆی فراوانی بەکارهێنانییەوە لەژیانی ڕۆژانەدا، بووە ناونیشانی باسەکەمانو جەختمان

لەسەری کرد. لەم هاوواتایانەشدا ئێمە دەرکمان پێکردووە، ڕەچاوی شێوەو جۆرەکانی هاوواتامان نەکردووە، بەڵکو تەنیا وەك خستنەروویەك، ئەم وشانەمان خستۆتە بەردیدە، کە دەشێ بۆ لێکۆڵینەوەی تر سوودی لێببینرێت.

- مردن/ مەرگ

هاوکات مردن دژی ژیانە، یان بەرانبەر مردن، ژیان هەیە، بەرانبەر زیندوونەمان، زیندوو هەیە، وەك چۆن ژیانکردن یان لەژیاندابوون و زیندووبوون، نەرێکردنی مردنە، بەهەمانشێوە (نا)کردنی ئەوانە (لەژیاندانەبوون-زیندوونەبوون) مردنە. بەلام بەشێوەی بەکارهێنانی زیاتر ئەمانەی خوارەوە بەکاردێن.

- کۆچی دواییکردن، ماڵئاواییکردن- گیان دەرچوون- گیان تیانەمان- گیان سپاردن(گیانی سپارد)- گیان لەدەستدان (لەرووداوێکی هاتوچۆدا ئەوەندە کەس گیانیان لەدەستدا) - گیانسەندن- ڕۆح دەرچوون- ڕۆح تیانەمان- رەحمەتی-خوالێخۆشبوو- شادرەوان- انا للە وانا الیە راجیعون[٨] (ئەم دەربڕاوانەش بۆ کەسی مردوو بەکاردێن کەدەمرێت بەپێی ئاستی ڕۆشنبیرو ئایینی و کەسەکەو دەوروبەرەکە ئەم وشانە بەکاردێن) .

- ڕۆشت(لێرەدا ڕۆشت بە هاوواتای مردن دادەنرێت، هاوکات "ڕۆڵەڕۆ- براڕۆ..." ڕەگی "ڕۆ" لە "ڕۆشتن"ەوە هاتووە. نم. ئەو کوڕە جوانەم لێ ڕۆشت. یان ڕۆشتن بەدەست خۆمەو هاتنەوە بەدەست خۆم نییە. دەشێ ڕۆشتنێکی یەکجارەکی بێت و نەگەڕێمەوە. وەك نزاکردن دەوترێت. بڕۆیت و نەگەڕێیتەوە. نەگەڕانەوە نزای مردنە. لەم وشەو دەربڕاوانە دەردەکەوێت، کە پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان سەفەر(ڕۆشتن)و مردندا هەیە.

- کۆتاییهاتن (کۆتاییهات): هەمووما‌ن کۆتاییمانپێدێت. لەهەندێ دەوروبەردا بەمجۆرە گوزارشت لەمردن دەکرێت، بەلام دەشێ وەك

ناتەبابیەکیش لەم دەربڕاوە بڕوانین بەرانبەر بە مردن، واتە کاتێك لە جیاتی مردن کۆتاییهاتن بەکاردێت، تا چەند مەبەستمانە کۆتاییهاتنە لەژیان، چونکە مردن بە پێی ئاین کۆتاییهاتنی تەواوەتی نییە، بەڵکو زۆرکات مردن وەك سەرەتای ژیان دادەنرێت، واتە مردن سەرەتای گەشتێکە بۆ ژیانێکی ئەبەدی نەك تەواوبوون و کۆتاییهاتن بێت، چونکە تەواوبوون‌و کۆتاییهاتن دەبێ لەچوارچێوەی ئەم ژیانەی دنیادا بێت نەك کۆتایی‌و تەواوبوونێکی یەکجارەکی‌و تەواوەتی. هاوکات دەشێ مەبەست لێی بە کەماڵ گەیشتن بێت، واتە وەك لای سۆفییەکان هەیە، مردن و کۆتاییهاتن بەکەماڵ گەیشتە. "وتەی (کۆتایی) بەر لەهەر شت مانای تەواوبوون‌و کەماڵبوون دەگەیەنێت"[٩]

– تەواوبوون(رۆژی تەواوبوو)– بە کەماڵ گەیشتن:

– فەوتان(فەوتی کرد–تیاچون)

– پسان ( دەشێ پسان لە پچڕانی پەتەوە هاتبێت، کاتێك پەتێك دەپسێت‌و بەجۆرێك بێ کەڵك دەبێت، مردنیش دەشێ پسان بەکاربێت لەو کاتەدا کە زۆر ماندوو شەکەتین. هاوکات دەشێ مەبەستیش ئەوەبێت کە بێهۆشبووم. دەششێ پسانی نێوان جەستەو ڕۆح بێت کە مردنیش جیابوونەوەی ڕۆح لەجەستەیە.

– وەفاتکردن: لەبنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبییەو خراوەتە ژێر دەسەڵاتی فۆنەتیکی کوردییەوە. نم. فلانیش وەفاتیکرد.

چاولێکنان(پەیوەندی مردن‌و چاوداخستن) کاتێك دەمرین چاومان دادەخرێت یان زیندووەکان چاومان دادەخەن. جگەلەوەی چاولێکنان وەك پشودان بەکاردێت، مردنیش وەك پشویەکی درێژ وایە.

– وەستان.دڵوەستان– وەستانی ژیان(گەشتی ژیان لەشوێنێکدا هەر دەوەستێ)

– هەڵنەسانەوە–کەوتن(ئەو کەوتنەی کەوت هەڵنەسایەوە) پاڵنەگەڕێ (هەڵنەسێیتەوە)،دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت. لێرەدا کەوت بەمانای وەستان دێت.

– لێبوونەوە(داماوە لەسەعات ئەوەندەدا لێبووەوە) دەشێ لێبوونەوە، مەبەست ئەوە بێت کە لە بوون بووەوە، واتە یان ئەوەی شتێك لە شتێك ئەبێتەوە، ئەم کەسەش کە دەمرێت، لە ژیان دەبێتەوە، یان لەم دنیایە دەبێتەوە، یان لەجەستەی دەبێتەوە. چونکە پێشگری (لێ) واتە لە ئەو بوونەوە(لە ژیان بوونەوە)

– بردنەوە(خوا خۆی دروستیکردووین هەر خۆشی دەمانباتەوە– خوا بردیەوە بۆلای خۆی، خوا خۆشیویست هەر زوو بردیەوە بۆ لای خۆی. لەکوێوە هاتووین هەر دەڕۆینەوە بۆ ئەوێ. واتە ئێمە لای خواوە هاتووین دەبێ بگەڕێینەوە بۆ لای ئەو. یان لە نەبوونەوە هاتووینە بوون جارێکی تر دەبێ بچینەوە نەبوون.

– نەمان (دنیا بۆ فلان نەما– لێرە نەمان).لەم دنیایە نامێنین یان لە ژیان نامێنین، یان لە جەستەیە نامێنین، ئەوە جەستەیە نامێنێت. کە منیش مردم وەك وایە هەموو شتێك مردبێت(دنیا بۆ فلان نەما) دنیا خۆی هەر ماوە بەلآم کە ئەم مرد ئیدی تەواوبوونی دنیایە لەدنیای ئەمدا، چونکە زیندوویەتی دنیا ئەم داویەتیە دنیا. دەشێ ئەم دەربڕاوە جیاوازانەی مردن هۆکاری دەرەکی هەبێ، واتە لەدەرەوەی زمانەوە، بۆنموونە نەمان، دەشێ وشەیەکی سیاسی بێت وەك چۆن وشەی ئاینو دەربڕاوی ئایینی هەیە بۆ مردن. یا کوردستان یان نەمان. نەمان لێرەدا بە کۆیە، واتە هەموومان بۆ کوردستان، گەر کوردستان داگیرکرێت، ئەوا بوونمان داگیرکراوەو لێزەوتکراوە، بۆیە نەمانمان دەوێت، نامانەوێت ببین، واتە نامانەوێت بە کۆیلەیەتی بژین، هەموو خۆمان بەکوشت دەدەین بۆ رزگاری کوردستان.

– لەناوبردن– ڕەنگە زیاتر واتای کوشتن بدات. نم. کەس نەیزانی لەبەرچی لەناویان برد. دیارە بۆ کوشتن‌و تیرۆرکردن وشەو چەمکی زۆر هەن (شەهید– خۆکوشتن– کوشتار– کۆکوژی–کۆمەڵکوژی– ئەنفال‌و جینۆساید– کوژانەوە–کوشتووبڕ– کوشتە–ساردکردنەوە(هەم واتای کوشتیان. هەم واتای ئارام کردنەوە.– هەتیوکەوتن– گولەی وێڵ– ملۆزم(نازانم گولەی وێڵبوو دای لەکوڕەکەم یان چیبوو)– لەخاچدان– زیندە بەچاڵکردن– دیلێتکردن (ئێستا بەهۆی تەکنەلۆژیاوە وشەی نوێ دادەهێنرێت، ئەمەش مانای بتسرمەوە، ئەیسرمەوە– لەژیانی خۆمدا ئەتسرمەوە/ وائەزانم مردوویت. بەڵام دەشێ وەك گاڵتەو پێکەنین بگوترێت...) هەروەك وشەی کوشتن سوودمان لە ڕەگەکەی وەرگرتووە، بۆ زۆر شت بەکاریدێنین(رادیۆ کوژانەوە– پانکەکوژانەوە...)واتە بۆ وەستان‌و لەکارخستن‌و بێدەنگردنی شتەکانیش بەکارمان هێناوە، چونکە خاسیەتی مردنی تیایە کاتێك (سەلاجەیەك دەکوژێنیتەوە، ئیدی لە چالاکی دەخەیت، ڕادیۆیەك دەکوژێنیتەوە واتە لەدەنگخستنی، کە دەنگداری ڕادیۆکە نیشانەی زیندوویەتی‌و کارکردنی ڕادیۆکەیە، گەر کوژانتەوە واتە ئەی مرێنیت، بەڵام مردنێکە بەدەستی خۆت وە بۆ ئەو کاتە دواتر دەتوانیت بیخەیتەوە ئیش(زیندووی کەیتەوە). هەروەك لە زمانی ئەدەبیشدا کاتێ کەسێك دەمرێت دەوترێت(مۆمی تەمەنی کوژایەوە). بەراوردی بکە لەگەڵ(کارەبا کوژایەوە) یان ئاوبڕان–نانبڕین، بەراوردی بکە لەگەڵ(خوا بتبڕێت– ناوجەرگم بڕا– جەرگبڕین– سەربڕین...)

– لەناوچوون– ڕەنگە هێما بێت بۆ لەناوچوونی جەستە.(تیاچوون– چوون) لەدەستچوون– – لەدەستدان(ئەو شێرەمان لەدەستدا– ئەو کورە جوانەمان لەدەستدا). گەڕانەوە (گەرایەوە بۆ مەنزڵی خۆی).

- توناكردن(توناكردن لەناوبردنی گیان- ڕەوان- ئاوی ئامون‌و تونی باباچی- تەفروتوناكردن)

- خنكان(لەتینواخنكان-لەئاوا خنكان) هەناسەنەدان- لەهەناسەكەوتن. مرۆڤ دەبێت هەناسە بدات چون هەناسە نەدات ناژی، ئەوەی كە مرۆڤ دەژی بە هەناسەدانە، هەر كات وەستا ئیدی ژیانی ئەو مرۆڤەش دەوەستێت.

- ڕەقبوونەوە(لەسەرمادا ڕەقبوونەوە)

- تەقین ( بۆ مرۆڤ بەكاردێت، لە دۆخێكی تایبەتیدا كە گەرمایەكی زۆر هەبێت‌و زۆر بێزارت بكات، یان لەداخ‌و خەفەتە خۆگری نەمێنێ. نموونە. لەگەرمادا تەقیم- لەداخا بتەقی)

- سووتان(لەگەرمادا سووتان-خۆسووتاندن-دڵسووتان-سك سووتان)

- وشكبوون(زیاتر بۆ مردنی ڕووەك بەكاردێت، بەڵام بۆ مرۆڤیش دەوترێ دەڵێی كارەبات لێدراوە بۆ وا وشكبوویت، بەڵام بۆ مردنی ڕووەك بەكاردێت.)

- مرداربوونەوە( بۆ ئەو ئاژەڵانەی كە گۆشتیان دەخورێ- هەروەك مرۆڤی كوردیش بەكاریدێنێت).

- تۆپین (بۆ ئەو ئاژەڵانە بەكاردێت كە گۆشتیان ناخورێ، هاوكات بەتایبەت بۆ سەگ بەكاردەبرێت و زیاتر نەفرەتكردنێكی تیایە، هۆكاری ئەم جیاكارییەش بۆ مردنی مرۆڤ لەگەڵ بوونەوەرەكانی تر دەشێ هۆكاری زۆری هەبێت، لەوانە ڕێكەوتنی كۆمەڵایەتی خەڵك لەسەر ئەو جیاكارییە(١٠)، هەروەك لایەنی ئایینیش ڕۆڵی بنچینەیی بینیوە، جگەلەوەی بایەخدانێكی زۆر بەمردن لای مرۆڤی كورد دەشێ هۆكارێكی تر بێت، هاوكات دەشێ خودی شتەكانیش ڕۆڵیان بینیبێت.

- قرِكردن(دوژمنـــان كـــاتێ بيانـــەوێت بڵـــێن لـــەناومانبردن دەڵـــێ قرِمانتێكردن) يان خۆشمان كە شتێ بێزارمان بكات دەڵێين (قرِی تێكەوێت- نەمێنێت). هەروەك بۆ باڵندەش بەكاردێت بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشيەوە ژمارەيەكی زۆر مرداردەبنەوە.

**خەوتن‌و مردن:**

خـەوتن‌و مـردن پەيوەنـدی تونـديان هەيـە بەيەكـەوە زۆركـات خـەوتن بەبرای مردن يان بەمردنی چكۆلە، يان مردنێكی كـاتی دانـراوە، لەبەرئـەوەی خەوتن ساتی ئارامیە، ساتی پشوودانە، ساتی ئەوەیە كە ئاگايی‌و هەستەكان پشـوودەدەن، مـردن ئارامیـە گەورەكەیـە، پشـوودانی ئەبەدیـە، كۆتايهاتنـە بەهەموو شتێك، مرۆڤ وەك چۆن نـاتوانێ نـەمرێ ئـاواش نـاتوانێ نەخـەوێت. بەلأم بۆچی زۆركات مرۆڤ ئاواتـەخوازە لـەكاتی خـەودا بمرێـت؟ مـن پێموايـە رِەنگە هۆكارەكەی ئەوە بێت مرۆڤ لەمردن دەترسـێ، پێيوايـە مـردن ئـازاری هەيـە بـۆی، هەرچـەند ئەمـە پيشـەی مرۆڤـی نارەسـەنە چـونكە بێئـەوەی ئەزموونی مردنی كردبێ لەخۆوە ئەمەی بەمردن بەخشيوە، بەهـەرحاڵ ئـەوە رِوونە كە مردن‌و ترس‌و ئازاری هەیە، ديارە سەرچاوەی تـرس‌و ئازارەكـانيش لە هەستەكانەوە دێن، بەلأم كـاتێ دەخـەوين، بـەجۆرێ هەسـتەكان دەمـرن، واتە ئيدی ترس‌و ئازار بوونی نييە، ئەوەی مردنی ناشرينكردووە بەشێكی بۆ ئەوە دەگەرِێتەوە كە ئێمە ناوێرين رِووبەرِووی بينـەوەو لێـی دەترسـين، لـە ئازارەكەی، لـەو ئاگاييـە دەترسـين كـە بەرانبـەر بـەمردن بووەسـتين‌و بـەلأم نەتوانين رِووبەرِووی بينەوە، واتە جەلادێك هێرشكاتە سەرت تۆش بەئاگابيت بەلأم دەسەلأتت نەبێت بەرگری بكەيت‌و بەری لێبگريت، دۆخێكـی ناخۆشـەو ئابروبەرەو هـەرگيز پێتخۆشـنييە بكەويتـە ئـەو دۆخـەوە بـەلأم گـەر لـەكاتی خەوتندا بێت پاساوت هەیە، كەمتر تانە لەخۆت دەدەيت، بۆيە مردن لـەكاتی

خەوتندا جۆرە پاساوێکە بۆ ڕزگاربوون لەو ترس و ئازارەی مردن، کە بێئەوەی بزانین مردن چییەو بێ ئەزموونکردنی لەم حاڵەتەدا دەژین، بێدەسەڵاتیمان لەمردن بەدرێژایی مێژوو بووەتە حاڵەتێك بۆ کەمکردنەوەی خۆمان، ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی مرۆڤ هەوڵیداوە هەیبێت مردن شکاندویەتی، لەبەرئەوە مردن لەکاتی خەوتندا ئەو کەلێنەمان بۆ پڕدەکاتەوە.

٢/ ڕیشەی وشەی (مردن) لە کوێوە هاتووە:

مرۆڤ دەمرێت، بەواتا لەوکاتەوەی مرۆڤ هەیە مردنیش هەیە، لەبەرئەوەی مرۆڤ و مردن دوانەیەکی لێکدانەبڕاون، ناتوانیت مرۆڤ بیت و نەمریت. لەگەڵ لەدایکبووندا مرۆڤ مردنی خۆی هەڵدەگرێت. لێرەدا دوو ڕیشە باسدەکەین بۆ مردن کە بڕوام وایە مردن لەو دوو ڕیشەیەدایە. هاوکات ڕیشەی دووەم لەڕووی لۆژیکیەوە لام پەسەندترە، بەڵام ڕیشەی یەکەم لەڕووی بەڵگەی زمانەوە دکتۆر فاروق بەڵگەکاری بۆ کردووە، کە زیاتر بەڵگە لۆژیکییەکەم لا پەسەندە، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی بەرەهای ڕیشەی یەکەم ڕەتبکەینەوە.

یەکەم: "مرۆڤ کە لەبنچینەدا، فۆرمێکی دیالێکتی سەرووی زمانی کوردییەو ئەمڕۆ لەزمانی نووسینی دیالێکتی خوارووا، بەشێوەیەکی بەرفراوان، بەکاردەهێنرێت...بەڵام لەقسەکردنی ڕۆژانەدا و بۆ هەمان واتا، ئەمانە زیاتر دەبیسترێن(ئینسان، کەس، زەلام، خەلق، یا خەڵك، نەفەر، مەردووم، شەخس، بنیادەم و... تاد.)"[11] بەڵام گەر بگەڕێینەوە بۆ بنچی وشەی مرۆڤ لە زمانە هیندۆئەورووپایەکان دەبینین {marta < mr-ta} و ئاوێستا (mareta) فارسی کۆن (martiya) پەهلەوی (mard) ، (mart)، (martum) (mardom) گریکی(mortos) لاتینی (morotalis) ئینگلیزی (mortal)، هاوکات لە فەرەنسی (mort)ە کە لە لاتینییەوە هاتووە (mors)،

لــه عبريشــيدا دەکاتــه MOUTh) وه لــه فارســـی نــویێ (مــرد، مــردم)، تاجیکی(مرد، مردم)[١٢]. گـەر سـەرنجی فـۆرمی هەریـەك لـەو وشـانە بـدەیت دەبینیت لێکنزیکییـەکی زۆر بەدیدەکرێت، بەشێوەیەکی گشـتی بـۆ وشـەی مرۆڤ لەزۆربەی زمانەکانی باکوورو رۆژئاوای ئەوروپادا خۆیـان بەسـتووەتەوە بـە زەویو خاکـەوە وشـەی (homo)ی لاتـینی سەرچـاوەکەی(hamus)ە کـە زەوییە. لەکاتێکدا زمانـە خزمـەکانی خـوارووی رۆژهـەلاتی ئـەوروپا، ئێـرانو هندیدا، شێوەی مردوو، کراوە بەدەربڕی وشەی مرۆڤ، وەك گرێکی (brotos)، ئەرمەنی(mard)، فارسی کۆن(martiya) هندی کۆن(martya) کە دەچـێتەوە سەر ڕەگی (mr) واتە مردن، واتە وشەکانی مرۆڤ–مەرد–مەردوم...ریشەکانی بۆ وشەی مردنو ڕەگی(مەر) دەگەڕێتەوە. لە ڕەگی(mar k) ئاوێسـتایش کـە واتاکـەی (کوشـتن)بووه، (مـرگ)ی فارسـی لێکەوتووەتـەوە، بـەڕای داعـی لئسلام، ئەم وشە فارسیانە یەك ڕەگیان هەیە(مرد، مرگ، مـردن، مـردم).[١٣] ئـەو وشـانەی کـە لـەم ڕەگـەوە هـاتووە هاوبەشـیان نیشـانەی تایبـەتیو سەرنجڕاکێشیان لەناوچونو کۆتایی هاتنو فەوتانە. دکتۆر فاروق دەڵێت چی وایکردووە لەمرۆڤ کە چەمکی مردن لەعەقڵو هۆشیدا ببێت بەبناغەو نیشـانە کاتێك کە ناو لە زیـرەکترینو وریـاترین گیانلەبـەری سـەر زەوی کـە خۆیـەتی نراوە؟ لە وەڵامدانەوەیدا پشت بە ئایینی ئیسلامی پیرۆز(قورئان) دەبەستێت و ئەم ئایەتە بەبەڵگە دێنێتەوە کە دەفەرموێت(کل نفـس ذائقـة المـوت) واتـە هـەموو کەسـێك، دەبێـت مـردن چـێژ بکـات(١٤). لـەوەڵامی دکتـۆر فاروقـدا دەڵێین، ئاشکرایە پێش هاتنی ئیسلام ئەم وشەیە هـەبووە، واتـە لـە ئیسـلام کـۆنترە. ئەمـە لەلایـەك لەلایـەکی تـریش گـەر بمانـەوێ بەگریمانـە وەڵامـی ڕیشەکە بدەینەوە، دەڵێین مـرۆڤ لـە مـردن دانـەبڕاوە. دەتـوانین بڵـێین (مـن مرۆڤم کەواتە مـن دەمـرم). یـان (مـن دەمـرم کەواتـە مـن مـرۆڤم)[١٥]. بـەڵام پرسیارێکی لۆجیکیش سەر هەڵدەدات، مردن پـێش مـرۆڤ هـەبووە یـان مـرۆڤ

پێش مردن؟ گەر وەڵامێکی لۆژیکی بدەینەوە دەبێ بڵێین مرۆڤ هەبووە مردنیش بۆ مرۆڤ، واتە تا مرۆڤ نەبێت مردن نابێت. من هەبم دەبێ بمرم، بەلام کە نەبووم ئیدی مردن بەشێك نییە لە بوونی من. بەلام بەپێی ئەو ریشەیە بێت کە دکتۆر فاروق لە کتێبی لەدایکبوونی وشەدا باسیدەکات، دەبێت پێش مرۆڤ مردن هەبووبێت، چونکە وشەی مرۆڤ بۆ مردن دەگەڕێتەوە.

یەکێکی تر لە بۆچوونەکان کە ریشەی مردن دەستنیشان دەکات، پەیوەستی دەکاتەوە بە مرۆڤەوە بەلام جیاکاری دەکات، بەشێوەیەکی تر.

مرۆڤ دابەشدەبێت بۆ (نێر – مێ). دەشتوانین بڵێین (پیاو– ژن)

گەر لەزمانی فارسی بڕوانین وشەی(مەرد)ی بۆ پیاو بەکارهێناوە، کە خۆشمان دەڵێین(مەردی خوابە) واتە لەزمانی کوردیشدا مەرد بەکاردەهێنین. بۆیە دەتوانین بەفارسی بڵێین(مرد– زن) واتە(پیاو–ژن) بۆچوونێك هەیە دەڵێت ریشەی ژیانو مردن لە (مرد– زن)ەوە هاتووە. چونکەن مەرد (پیاو) لە (مردن)ەوە هاتووە و نازێت و لە ژن زیاتر پەیوەندی لەگەڵ مردندا هەیە. لەدەرەوەی ماڵە و لەدووی پڕکردنەوەی خواستەکانی ماڵەوەیە، زیاتر بەژداری جەنگەکان دەکات، وەك دەوترێت (بەرخی نێر بۆ سەربڕین باشە). بۆیە مەرگ و مەرد هاوڕیشەن، بۆ مرد دەگەڕێتەوە. ژن لە (زن)ی فارسییەوە هاتووە و ئەویش لە (زادن–زایین)ەوە هاتووە و زیندەگییش(ژیان) هاوڕیشەیە لەگەڵ وشەی (زن–ژن)دا. چونکە ژن سەرچاوەی ژیانە، بەهۆی ژنەوەیە کە ژیان بەردەوام دەبێت، ڕاستە هاوبەشی پیاوو ژن بەردەوامی ژیانن، بەلام دەشێ وەك گریمانە بڵێین مرۆڤی کۆن نەیتوانیوە بەوجۆرەی ئێستا لەدایکبوونی مرۆڤ دیارییکات، ئەوەی بینیوە کە لە ژنەوەیە بۆیە ژنی بەسەرچاوەی ژیان داناوە، (مەرد)یش کە بەردەوام لە ریزی پێشەوەدابووە بۆ جەنگو مردن، بە مردن داناوە[١٦].

سێیەم/ لێکدانەوەی مردن/مەرگ لە فەرهەنگەکاندا:

گەشتێکی فراوانم کرد بەناو فەرهەنگە کوردییەکاندا، زۆرینەی ئەو دەربڕاوانەی کە بۆ مردن دەگەڕێنەوە هێناومە، هەوڵمدا تەنیا فەرهەنگێك نەکەمە سەرچاوە، چونکە فەرهەنگی کوردی/کوردی مان، هێشتا لەو ئاستەدا نییە، هەروەك لەپێناو زیاتر شیکردنەوەی وشەکانی ناو فەرهەنگدا بەپێی دەرفەتو هەبوونی زانیاری، شیکارم بۆیانکردووە، دەبێ وەك سەرەتایەك ئەوە بڵێم وشەی (مردن) لە ناو زاری بادینانیدا (مرن)ە، واتە (د)ی نییە، هاوکات هەر لەم بەشەدا زۆرینەی ئەو وشەو ئیدیەمو پەندی پێشینانو دەقو گفتوگۆیانەم هێناوە کە واتای مردن دەدەن، واتە گەشتێکی فراوانم کردووە بۆ دەرخستنی واتای مردن، لە زمانی کوردیدا.

١/ مردن لە فەرهەنگی "هەمبانە بۆرینە"دا:

- مرا: کوژرا-گیانی لێسەندرا.[١٧]. واتای یەکەم(کوژرا)، مەبەست ئەوەیە کە کەسێك هەستاوە بە کردەی کوشتن، هەروەك سنووری نێوان مردنو کوشتن جیانەکراوەتەوە. بەڵام لە واتای دووەمیشدا کە گیانی لێسەندرایە(واتە یەکێك گیانی لێسەندووە، یەکێك هەستاوە بەکردەی کوشتن، ئەوەی گیانی لێ سەند لە هەردوو واتاکەدا نادیارە(واتە بکەر نادیارە)، تەنیا وەك کردارێك واتەکەی هاتووە دەشێت لە ڕستەدا یان بەکارهێنانیدا ئەوە ڕوونبێتەوە. نم. لەو شەڕەی دوێنێدا فلانیش کوژرا. هاوکات دەشێ بەتێپەڕبوون بەسەر ڕووداوی کوشتنەکەدا ببێت بە(مرا-مردن).

- مران: بەکوشت چوون-خەبەردان لە بەکوشت چوونی بەکۆمەڵ (لەشەڕدا مران)[١٨]

لە واتای یەکەمدا (بە کوشت چوون)دا، ئاماژەدانە بە ڕووداوێك کە چەند کەسێکی تیا کوژراوە، واتە لێرەشدا سنووری مردن-کوشتن جیانەکراوەتەوە. چونکە واتای دووەم پێماندەڵێت کە ئەمە لە کاتێکدا دەگوترێت کە ڕووداوێ(شەڕ) لە ئارادا بێت. یاخود دەشێ وەك هەواڵ بگوترێت، لەو شەڕەی دوێنێ شەودا ئەوەندە کەس کوژران.

- مرد: گیانی دەرچو - مڕ، تێر، تەسەلە[١٩].

لێرەدا هەستدەکەین سنوور دانراوە لەنێوان کوشتن- مردن، چونکە نەوتراوە گیانی لێسەندرا. بەڵکو(گیان دەرچوون)، پرۆسەیەکە کە گیان یان ئەو مرۆڤە خۆی کەمتر لەژێر پاڵەپەستۆیەکی دەرەکیدا گیانی دەردەچێت. یان هێزێك نییە لەدەرەوە مردنی بەسەردا بسەپێنێت. هەروەك بڕوا بەوە هەیە کە گیان بوونی هەیە، وە مردن بریتییە لە نەمانی گیان لە جەستە(گیان دەردەچێت لە جەستە). سەبارەت بە واتای دووەم، ئێمە وای بۆ دەچین، خاسیەتی هاوبەش هەبێت لە مڕبووونداو لە مردنیشدا، کەسێك کە مڕبووە ئیدی ناتوانێت بجولێت دەڵێت(ئەوەنەم خواردوە ناتوانم بجولێم- خۆم بۆ ڕاستناکرێتەوە)، واتە مڕبوون بەجۆرێك لە جووڵەکەوتنە. پێموایە ئەم خاڵە هاوبەشە وایکردووە کە ئەمە بۆ مڕبوونیش بەکاربێت، چونکە دواجار چ مردن-مڕبوون، هەر لە مرۆڤدا ڕودەدات، بەڵام وەك گێڕانەوەیەك وشەی مرد بەکاردێت، کاتێك چەند هاوڕێیەك(خێزانێك) بینەری درامایەکن یەکێك لە ڕۆڵگێڕەکانی ئەو درامایە دەمرێت یەکێك لەو هاوڕێیانە بۆ ئەوەی باسی دراماکە بهێنێتە پێشەوە یان بۆ ئەوەی کە هاوڕێیەکی ئەو هەڵقەیەی نەبینیوە کە ئەو ئەکتەرە تیایدا مردووە.

دەڵێت فلانیش مرد.

وەلامی هاوڕێکەی دەشێ ئەوەبلێت (نەبابە چۆن! نابێت بمرێت ئەو ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت...) هاوکات لەم دەربڕاوەدا ئاواز ڕۆڵ دەبینێت

بەجۆرێك كە دەشىَ هەم پرسيار بێت(مرد؟) دەشىَ سەرسوڕمان بێت. هەروەك هاوڕێكەى دەشىَ وەك هەواڵ بيڵىَ يان وەك وروژاندن.

هەر لەو فيلمو درامايانەدا زۆركات كە بينەرى بووين كاتێك يەكێك لە ڕۆڵگێڕە خۆشەويستەكانى(لەناو كارەكەدا) مردووە بۆى گرياوين منداڵێك لەناو ئێمەدا وتويەتى

(بۆ دەگرى خۆ ئەوە مردنى گاڵتينەيە).

مردنى گاڵتينەش هەيە، مردنێك هەيە بۆ تەمسيلكردنە. بەلاّم گەر ئەوەى دەمرێت ڕقمان لێيبووبێت و تومانە شوكر مرد. يان ڕەگەزى مىَ دەڵێ(بەگوناه نەبێت تۆپى– تۆپانديان=كوشتيان). ئەمە تووڕەبوونێكى زۆرى تيا دەبينرێت، هاوكات مرۆڤى كورد هەوڵيداوە جياكارى بۆ مردنى خۆى و گيانلەبەرانى تر بكات، بەجۆرێك پيرۆزييەكى بەخۆ بەخشيوە. هەروەك دەشىَ بەكاريگەرى كولتوورو ئايينى ئەم جياكاريە كرابێت، بەلاّم لە هەندىَ حاڵەتدانەبێت(وەك تۆپينى سەگ)، جگەلەوەى تۆپين بۆ سەگ بەكاردەهێنرێت بەس بۆ مرۆڤيش بەكاردێت كاتێك پێتخۆشبێت ئەو كەسە بمرێت واتە ڕقت لەو كەسە بێت، يان كەسەكە خۆى كەسێكى باشنەبێت. جگەلەوەى تۆپين بۆ خەوتنيش بەكاردێت زۆركات دايك بە منداڵەكەى دەڵێ دەبرۆ بتۆپە بەيانى خەبەرت نابێتەوە.

– مردگ: گيان تيا نەماو.[٢٠]

لێرەدا گيان بنەماى ژيانە، كاتێك گيان لە لەشدا نەما ئيدى ژيانى ئەو كەسەش تەواو دەبێت. لەلايەكى ترەوە زۆركات دەوترێت (پاترييەكە وزەى تيا نەما). يان دەوترێت (پاترييەكەم مردووە) كاتێك ئۆتۆمبێل كار ناكات يەكێك لە هۆكارەكانى بۆ مردنى پاترييەكەى دەگێڕنەوە. لەو دوو دەربڕاوەدا. وزە بۆ پاترييەكە بريتييە لە گيان(گيانى تيانەما بۆيە كار ناكات). هەروەك وزەش بۆ مرۆڤ پێويستى ژيانە، جگە لەوەى ڕوويەكى ترمان

بۆ دەردەخات لەوەی کە مردن تەنیا بۆ مرۆڤو گیانلەبەران بەکارنایەت بەڵکو بۆ شتیتریش بەکاردێت، هاوکات دەشێت پێش مردن گیان تیا نەمانیش ببینرێت، بەوەی کە توانام نەما. هەربۆیە گیان بە هۆکاری زیندوویییەتیو چالاکی دادەنرێت، ئەوەی گرنگی پێدراوە گیانە نەك جەستە، چونکە گیان جەستە هەڵدەسوڕێنێت، هەرکات گیان لاواز بوو یان تەواو بوو ئیدی جەستە ناتوانێت کارەکانی بکات.

- مردم: گیانم دەرچو[٢١].

پێموایە ئەمە پێش مردن کەوتووە، واتە کەسەکە خۆی لە ژیاندایەو باسی مردنی خۆی دەکات، کە ئەمە نا لۆژیکیە. هاوکات دەبێ ئەوە ورد بکەمەوە کاتێك مردن تەواوبوونو لێرەنەمانو وەستانی هەستەکان بێت، ئیدی چۆن دەشێ قسەبکرێت، گوزارشت لەخۆبکرێت؟ لەڕووی کاتەوە (مردم-گیانم دەرچو) ڕابردووە، بەڵام وتنی ئەمە بۆ خۆی کاتی ئێستایە بەڵام کاریگەری کارەکانی پێشترە لەسەر ئێستا. بەس گەر دەورووبەرێکی بۆ بدۆزینەوە دەڵێین شیاوە بڵێیت مردمو زیندووشبیت، لەڕووی واتاییەوە بۆ مردنی (من) دەبێت گیانم دەرچوبێت، بەکاربهێنرێت. بەڵام ئەم واتایە دەمانخاتە گرفتەوە، چونکە ناکرێت کە سێك هەم مردبێت وە زیندووشبێت. بەڵام یەکێك لەو دەورووبەرانە کە شیاوە ئەو دەربڕاوە تیایدا، دەشێ کەسێك زۆر ماندو هیلاكو شەکەت بێت لە کار، ئەمە دەربڕێت، ئێستا خۆم هێند ماندوم زۆر ئاساییە بڵێم (مردم هێندە کارمکرد). بەڵام ئەوەش زۆر گرنگە بزانین ئەمە خاسیەتێکی مردنە کە ماندوێتیو شەکەتییە، شتێکی تر کە زۆر گرنگە دەشێت ئەمجۆرە مردنە هەم لایەنی جەستەی(دەرەکی) مەبەست بێت هەم لایەنی دەروونی(ناوەکی). واتە دەشێت کرێکارێك لەکار زۆر ماندوبووبێت بڵێت: گیانم دەرچوو(مردم) ئەوەندەم بلۆك بردە سەرەوە. هەم ئەوەی من وتم کە زیاتر ماندوبوونێکی هزریو دەروونیو ناوەکییە.

مەبەستەکەش زیاتر بۆ ئەوەیە کەسی بەرانبەر هەستی بجوولێت. بەشێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین وەك چۆن ژیانی مادیو مەعنەوی هەیە مردنی مادی و مەعنەویش هەیە، واتە دەشێت هەردو جۆری مردنەکە تەنیا ڕەمز بێت بۆ ماندوبوونو شەکەتبوونی جەستە یان ڕۆح، نەك مردن بەمانای گیان تیانەمان.

من پێموایە هەرکات وشەی مردن بەکاردێت بێگومان بەکارهێنانەکەی خاسیەتێکی هاوبەشە وایکردووە لەو دەوروبەرەدا بەکاربێت. بۆ نموونە کەسێك لە کۆبوونەوەیەك دێتە دەرەوە یان لە شێوینێك کە ئەم کەسە نامۆ بووە لەو شوێنە.

دەڵێ مردم تا لەو شوێنە(کۆبوونەوەیە نەجاتم بوو). لێرەدا جگەلەوەی ناڕەحەتی دەروونی بۆ دروستبووە، وە ئەمە ئازاری داوە، کە ئەمانە خاسیەتەکانی مردنن(مردن بۆ مرۆڤ نەك مردن خۆی)، بەڵام خاسیەتی جەوهەری ئەو کەسە لەو کۆبوونەوەیە هەستی بە نامۆیی کردووە، چووەتە شوێنێك دۆخێکی وەرگرتوە کە نامۆ بێت، هاوکات نا ئازاد بێت، کە مردنیش ئێمە پێی نامۆین و ئازاد نین لەبەرانبەر مردندا، لەبەرئەوە گواستنەوەی ئەم وێنەیە لەوەی نامۆیین بەمردن هاوکات شوێنەکەش نامۆیی دروستکەربووە بۆمان. هاوکات مردن لەهەندێ حاڵەتدا ڕزگاربوونە(نەجاتبوونە) یاخود زۆرکات لەمردن گەڕانەوە هەیە(نەجاتبوون لەمردن)کەسەکەش ئەو دۆخە بە دۆخی مردنی خۆی دەزانێت، واتە گەر زیاتر بمایەتەوە ئەمرد بەڵام کە دەرچووە لەو دۆخە واتە لە مردن ڕزگاری بووە. نامۆبوونو نائازادبوونمان لەو شوێنانە وادەکات وشەی مردن بەکاربێنین، وەك چۆن کرێکارەکە لەکارکردنێکی زۆر دەبێتەوە دەڵێ مردم یان پسام ئەوەندەم کارکرد، وەك چۆن مردن ئازاراویە (کە مردن ئازاراویە گرفت هەڵگرە لەشوێنی خۆیدا

باسمانکردووه). ئاوهاش کاری کرێکارەکە ئازاراوی بووه بۆیە وشەی مردن یان پسانی بەکارهێنا.

- ئەمڕۆ لەو یارییە هەرمردم .
- مردی دەبخۆ دەردبێت نەموو مەچۆ.

گفتوگۆی دایکو کوڕە، کوڕەکەی چووه بۆ یاریکردن(کاتێك دێتەوه دەڵێ مردم...) ئەویش دەڵێ مردی (ڕۆڵی ئاوازەکە) نەموت مەچۆ. ئاوازەکەی پێمان دەڵێت کە دایکی وەك تانەیەك، یان وەك ئەوەی بە خەیاڵما نایە(هەستنەجووڵان)چونکە لاساریت کردووه، نەك وەك پرسیار. هاوکات دەشێ کوڕەکەی بۆ کارکردن چوبێت واتە ئەوەی کوڕەکەی بۆی چووه دایکی پێی ناخۆشنەبووه. بۆیە دایکی لەوەڵامی (مردم)ی کوڕەکەیدا دەشێ یان بەکردار وەڵامی بداتەوە، یان بە لەوانەیە بڵێت دەی بەساقە ئاگات لە خۆت بێت زۆر خۆت ماندوو مەکە. واتە دەربڕاوی کوڕەکە لە شەکەتیو ماندوویەتیە. هەروەك دەشێ دایکی کوڕەکە مردنی(شەکەتی) کوڕەکەی بۆ کەسێك بگێڕێتەوەو بڵێ فلانی کوڕم دور لە گیانی مردووە بەو کارەوە. دوور لە گیانی واتە مردن بریتییە لە مردنی گیان یان مردنەکەی جەستەییە، نەوەك گیان دەرچوون بێت، کە ئەمەش گرنگە بپرسین ئایا گیان دەمرێت یان جەستە دەمرێت؟، واتە ماندوویەتی کوڕەکەی زیاتر جەستەییە، نەك گیان. دایکەکەش جۆرە نزایەك دەکات کە گیانی بەدووربێت لە بەلا، واتە ئەوەی بەلایە بۆ مرۆڤ مردنی جەستە نییە (بەشێوەیەکی بنەڕەتی) بەڵکو مردنی گیانە.

- مردن: گیان لەلەشدا نەماو-گیانیان دەرچو[٢٢]

لەواتای یەکەمدا ڕەچاوی خودی مردن خۆیکراوه، کە بریتییە لە نەمانی گیان لە لەشدا. بەڵام لە واتای دووەمدا ڕەچاوی لایەنی سینتاکس کراوه، بەوەی کە مردن بۆ ئەوانە، واتە ئەوان مردن(ئەوان گیانیان دەرچوو)، بەڵام

واتـای گیـان لەلەشـدا نەماو(ئـەو گیـانی لەلەشـدا نـەماوە). بۆیـە (نـەمان- دەرچوون) بەواتای جیاوازیانەوە بەڵام هەمان گوزارشت لـەخۆدەگرن، نـەمان بریتییە لەوەی کە کۆتاییهات، بەڵام تاچەند تەواوبوونە بەوەی کە لەڕوانگەی ئایینییەوە گیان ئەمێنیّ(نەمرە)، بەڵام دەشیّ نەمان بێت لەم ژیانەدا. بـەڵام دەرچوون دەشیّ مەبەست چون بێت بۆ شوێنیّ تر، واتە گیـان لێـرە دەڕوات بۆ شوێنی تر، کەئەمە زیاتر لەواتای ئایینییەوە نزیکە.

- مردنوسـووتان: بـــرێتی لـــە کۆشــــش کردنوتەقـــەلای زۆر دان(مردموسوتام دەگەڵم نەهات)[٢٣]

ئـەم دەربـڕاوە، ئـەوە دەردەخـات کـە ئـەم زۆر هەوڵیـداوە، تـا ئاسـتی مردن، سووتان. بەڵام ساردوسڕیو ئینکـاری ئـەویش نیشـاندەدات. هـەروەك ئەوەشمان پێدەڵێت، کە مردن وەك ڕادەو سنوور سەیرکراوە، واتە تا ئاستی مردن ڕۆشتوە. دەبـیّ ئـەوەش بڵێین کەئـەم دەربـڕاوە زیـاتر ڕەگـەزی مـیّ بەکاریدێنیّ، جگە لەوەی ئەمە لە دۆخێکدا دەوترێت کە گێڕانەوەیە، واتە بـۆ کەسێك دەگێڕێتەوە کە ئەو کەسە هەواڵی ئەو کەسە دەپرسێت.

نم. بـۆ فـلان نـەهات؟ ڕۆڵـە چـی لێبکـەم زۆرم پێـوت مـردمو سـووتام نەهات.

یان ماندو شەکەت بووم ئەوەنـدەم پێگـوت هـەر نەهات.(شـەکەتبوون).

بەڵام ئەم دەربڕاوە وەك واتـای سـیمانتیکی ناتوانرێـت، واتاکـەی وەك خـۆی وەرگیرێت، چونکە مـردنو سـووتان، واتـای نـەمان دەدات، بـەڵام لێـرە وەك خولـّقو ڕێـز نیشـاندان بـەکارهێنراوە بەرانبـەر بـەو کەسـەی نـەهاتووە، خـۆ دەششـــیّ وەك ڕێـــز نەبێت(چـــونکە دەوروبـــەری وتراوەکـــە ئەمـــە تـــەواو دەردەخات) بەڵام واتای پراگماتیکی دەربڕاوەکە پێمان دەڵێت مەبەست لـەم دەربڕاوە چییە.

- مردوو: مردگ. هەرشتێ لەتین و تاو کەوتبێ (قسلّی مردو، گێچی مردو، ئاگری دامردوو)[٢٤]

لێرەدا مردن تەنیا بۆ مرۆڤ بەکار نەهاتووە، بەڵکو بۆ جیاوازتر لە مرۆڤیش بەکارهاتووە. وە ئەوە بە (مردوو) دانراوە کە تین و تاوو زیندوویێتی نەمێنێ. بەواتایەکی تر – تین وتاو= مردوو. نم. شاری مردوو.(شاری بێ جووڵەو وەستاو).

یان لە ئیدیەمدا: دڵ مردوو– دەم مردوو

بەواتا مردوو دەشێ بۆ زۆر دۆخ بەکاربهێنرێت، بەوەی هەرکات ئەو چالاکی و تواناو گڕو تینە نەمێنێت کە مرۆڤ یان شتێك هەیەتی وەك مردوو لێی دەڕوانرێت، چونکە ئەو شتە یان مرۆڤە بەسروشتی خۆی چالاك و پڕ جووڵەو وزەیە... گەر لەسروشتی خۆی لایدا ئەوەی تیا نەما ئەوکات وەك مردوو مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

- مردووت مرێ: قسەی سەرکۆنەکردنە[٢٥].

ئەمە ئیدیەمێکە. لێرەدا مەبەست لە(تۆ)یە. هەروەك یەکێك لەو شتانەی کە دەوترێت لەسەر ئیدیەم ئەوەیە کە لەواتای خۆیەوە وەرناگیرێت[٢٦]. ئەوە ئاشکرایە کە مردووەکان پیرۆزیان پێدراوە، تا ئەو ڕادەیەی سوێندیان پێدەخورێت(بەگۆڕی مردووم– بەگۆڕی شەهیدان). بەڵام ئەم کەسەی ئەمە دەڵێ نایەوێت وەك تکا کردن داوای لێبکات بەڵکو وەك سەرکۆنەکردن و تانە لێدان دەیڵێت، یان دەتوانین بیرکردنەوەی کورد بەرانبەر بە مردن، کە زیاتر لەچوارچێوەیە ئایینی ئیسلامە، کەسێك دەمرێت، لەوێوە سەرەتای ژیانی دەستپێدەکات، بەس ئەم کەسە دەیەوێت ئەو ژیانە سەرەتایەی، کە بۆ مردووەکان هەیە( بۆ ئەو کەسەی کە ئەم قسەی پێدەڵێت) ڕەچاونەکات. هەروەك بۆ زانیاری دەڵێین کە گوندێك لە کوردستان هەیە بە ناوی(مرێ) مرێ:گوندێکی کوردستانە[٢٧].

سەبارەت بە سوێندخواردن بە مردوو، یان گۆڕەکەی، گرنگە ئیستێ بکەین. ئەم سوێندخواردنە ڕیشەیەکی کۆنی هەیە، بەوەی مردوو پیرۆز کراوە. جگە لەمەش تەنان لە قورئانیشدا سوێند بە مەرگ خوراوە. بەلام بۆ سوێند خواردن؟ بەهای کەسی مردوو لەبەردیدە گیراوە، کە لێرەدا کەسی بەرانبەر باوەر دەکات(هاندەرە). بیرخستنەوەیەکی مردنیشە(کەسی مردووش). هەرچەند سوێندخواردن بە مردوو لە ئایینی ئیسلامدا بە شیرك دانراوە، بەلام لە قورئانیشدا سوێندخواردن هەیە! گەر خوێندنەوەیەکی عیرفانیش بۆ ئەو سوێندخواردنە بکەین لە قورئاندا ڕەنگە هەر ئەوەبێت، کە ڕۆحی خوا لە هەموو کەسێکدا هەیە.

نم. بەس بخۆ مردوومرێ ئەمریت.(داخوازیە، لەشێوەی سەرکۆنەکردن).

وەك لە فەرهەنگدا هاتووە(مردوو مرێ) بەلام (مردوو نەمرێ)ش، هەیە کە ئەم دەربڕاوە هەمان سەرکۆنەکردنی تیایە، بەلام بەشێوەیەکی نەرمترە(تانەیەکە کە بریندارکردنی کەمتر تیایە). گەر لە واتای سیمانتیکی ئەم دەربڕاوە بڕوانین، نەشیاوە چونکە کەسێك کە مرد ئیدی ناکرێ نەمرێ(واتە هەم بمرێو هەم نەمرێ)، تەنیا لەحاڵەتی ئەوەدا نەبێت کە ئەو کەسە لای دۆستو کەسانی تر بە زیندووی بهێڵرێتەوە لە ڕێگەی ئەوشتانەی کە بەجێی هێشتووە دەشێ ئەو شتانە بەرجەستە بن یان نا بەرجەستە. یان دەشێ ئەو کەسە کەسێکی ناوداربێت وەك (بارزانی نەمر- شێخ مەحمودی نەمر). بەواتا ئەو دەوروبەرەی ئەم ئیدیەمەی تیا بەکاردەهێنرێت هەلگری خوێندنەوەو مەبەستی جیاوازە، بەپێی دەوربەرەکە واتاو مەبەستەکەی دەگۆڕێت.

- مردوو مراو: تازیەبار-قسەیەکی لۆمەوتانەیە(ئەم مردوو مراوە بۆ کاری چاك ناکات)[٢٨]

واتای یەکەمی ئەوەیە کە کەسێك کەسێکی لێڕۆشتوە(لێ مردووە)، بۆی خەفەتبارە(تازیەبار)ە. دەشێ وەك کەمبوونەوەی زیندووکانی ئەو خێزانو بنەماڵەیە وەریگرین کە لۆمەیەك بێت کەسێك لە دەرەوەیان پێیان بڵێن. یان دەشێ وەك ناسینەوە بوترێت، ئەوەی ئەو مردووی مراوە(بەکەسێك دەوترێت).

نم. مردوومراوە ئەوەندەی وت سەرم دایە ژان.

بەواتا مردوومراو واتایەکی تازیەبار دەگرێتەوە، واتایەکیش وەك تانەو لۆمەکردن، هەرچەند بەکارهێنانەکەی مەبەستەکەش دەگۆڕێت. هەروەك بە(ئەو) دەگوترێت.

- مەرگە(ناوچەیەکە لە کوردستان-جێ لەوەڕ- گەورە دینداری یەزیدی)

- مەرگەهە(شوێنێکی پیرۆزە لەگەلی لالەش‌و قوبلەی یەزیدیەکانە)

- مەرگەموش(دەرمانێکە مشکی پێدەکوژن) . مەرگە ماسی (ژارماسی)[٢٩]

لێرەدا مەرگ بۆ ئەو زیندەوەرانەیە کە جیاوازن لە مرۆڤ، پێدانی مەرگە، نەك خۆیان بمرن. واتە کوشتنە نەك مردن، لەبەرئەوەی لەڕێگەی دەرمانێکەوە مەرگیان پێدەدرێت.

٢/مردن لە فەرهەنگی "شێخانی" دا:

- مردەڵە:کزو کەنەفت- مردولە[٣٠]

ئەم دەربڕاوەش لەلایەك دەشێ وەك دەرخەری بەساڵاچوویی، کەسەکە کە چووەتە تەمەنەوە، هەست دەکرێت لەمردن نزیکبۆتەوە، کەسی بەتەمەنیش بچووکدەبێتەوە، کزی نیشانەی کوژانەوەو بەرەو تەواوبوون چوونە، کەنەفتیش هەمان نیشانەی هەیە، کە هەردوو حاڵەتەکە(کزی-

کەنەفت) خۆش نین، چونکە مرۆڤی کوردی موسڵمان هەر لەسەرەتاوە لە نزاکانیدا دەڵێ. خوا کەفتەکاری سەر جێی نەکات.

مردەڵە وەك بچوکبوونەوە وایە، کە کەنەفتیش لەسەر جێدا بچوکبوونەوەی تیا دەردەکەوێت لە کەسی کەنەفتکاردا. هەروەك لەناوچەی گەرمیانیش بەکاردەهێنرێت کە مەرج نییە بۆ کەسی بەساڵاچوو بێت، دەشێ بۆ گەنج بێت، کەسێك کە بێهێزو لاوازو توانای نەمابێت، وەکو مردووی لێهاتبێت لە لاوازیدا[٣١] پێیدەوترێت مردەڵە.

- مەرگ: مردن
- مەرگوجێ:لەمان و نەماندا–بێ سەروشوێن[٣٢].

واتای یەکەمی، خراپی دۆخی کەسەکە دەردەخات، کە لەسەر جێیە، یان لەسەر جێی مردنە، دەتوانین بڵێین جۆرێکە لە سەرەمەرگ، تەنیا ئەوەیە زیندووە دەنا ناتوانێ بجووڵێت. واتا دۆخێکی چاوەڕوانیو پڕ نیگەرانی(بۆ ئەو کەسانەی لەچاوەڕوانین) دەردەخات کە کەسێ گیانی دەردەچێتو دەمرێت. بەڵام واتای دووەمی(بێ سەروشوێن). ئەم کەسە هەواڵی نازانرێت، بێ هەواڵی وەك دەگوترێت (کەس نازانێ ماوە یان مردووە). یان دەتوانین ئەوەشی لێبخوێنینەوە کە ئەم کەسە چووە بۆ جەنگ(شەڕ) بەڵام هەواڵی لێی نییە، واتە لە شوێنێکە ئەو شوێنەش پەیوەندی بە مەرگەوە نزیکە. لەو شوێنەیە کە مردنی لێیە.

- مەرگوژی:لەبەینی مانونەماندا–ناوی کانییەکە ئاوی وشکەو لەپڕ ئاودەدا[٣٣].

واتای یەکەمی ئەو دۆخە پڕ مەترسیە نیشاندەدات کە کەسی نا تەندروستی تێدایە، واتە ئەمەلی مانەوەو نەمانی نادیارە. (نەمان) جۆرێك لە هاوواتای مردنە. بەڵام ئەوەی کە ناوی کانییەکی وشك بێتو لەپڕ ئاوبدات. ئاماژەیە بەوەی کە کەسێك کە کەسوکارەکەی بەتەمای زیندوومانی نەمێنن،

واته بێ ئەمەل بوونێتن لەوەی کە زیندووە، بەڵام لەپڕێکدا باشببێت(کەسمان بەتەمای نەمابووین بەس شوکر لە پڕا باشبوو). یان دەشێ ئامـاژەی ئەوەشی تیا ببینین کە کەسێك دیار نەماوەو لەپڕ دەردەکەوێتە. کورد بەهۆی ڕژێمی بەعسەوە زۆر کەسی لێ ڕۆشت، کە تیایەتی پرسەشیان بۆ داناوە بەڵام لەپڕێکدا دەزانیت دێتەوە یان هەواڵدێت کە زیندووە. واتە کەسێك کە بەبڕوای کەسوکارەکەی مردووە، بەڵام زیندووبێتو لەپڕ دەرکەوێت.

- مردی:مری:مردوو:مەردەو: گیان لێ تۆریاگ- لەکارکەوتنی چیمەنتۆ-بریتییە لە بێدەسەڵاتی لەکردەوەوکار[٢٤].

لێرەدا سێ واتا دەستنیشانکراوە، واتای یەکەم بۆ مرۆڤە، واتای دووەم بۆ شتە(چیمەنتۆ) نم. خێرا چیمەنتۆکە بێنە مرد. واتای سێیەم پێش مردنە، کاتێك مرۆڤ لاواز دەبێتو ناتوانێت بجوڵێتو کاربکات، ئەو بزاوتو گەرموگوڕیەی لە مرۆڤی زیندوودا هەیە هەرکات نەمێنێت وەك مردوو سەیری دەکرێت.

- مەرگ: شەیتان- ئەهریمەن- ئیبلیس[٢٥]

دانانی مەرگ بەو واتایەی لە فەرهەنگدا هاتووە، دەشێت بەوە بخوێنرێتەوە، کە یەکەم کەس کە بووە هۆی مردنی مرۆڤ، (ئیبلیس- شەیتان-ئەهریمەن)بووە، چونکە ئەوبوو گوناهی یەکەمی بە مرۆڤ کرد، ئەو گوناهەش سزای مردنی(دیارە ئەوە بە یەکەم مردن دادەنرێت کە مرۆڤ لە بەهەشتەوە نێردرایە سەر زەوی). هەروەك دەشێ بڵێین شەیتانیش سەرچاوەی خراپەیە، مرۆڤیش مردن بە خراپترین ڕووداو دادەنێت، جگە لەحاڵەتی ڕیزپەڕ(ئەو مرۆڤانەی کە نەخۆشییەکی گرانیان هەیە بە نموونە. یان کەسێك کە ژیانی نا ئاساییە. نم. خوایە من بکوژیو نەجاتم بدەیت.

وەکەسی تایبەت(سۆفییەکان بەنموونە). خۆ دەشبێ لەهەندێ ئاییندا کە ئەوانە خوای خراپەن‌و مردنیش وەك خوا دانرابێت، خوایەکە کە خراپە، چونکە لەنێوان مردن‌و خوادا پەیوەندییەکی پتەو هەیە.

### ٣/ مردن لەفەرهەنگی "هەرمان"دا:

- پێشمەرگە: ناوێکی لێکدراوە(پێش+ مەرگ+ئە) چەکداری هێزەکانی ڕزگاریخواز، پارتیزان.

(ئەم وشەیە لەسەردەمی کۆماری مەهاباد لەجیات سەرباز هەڵبـژێردراو برەوی سەند).[٣٦].

پێشمەرگە، ناوێکە بۆ ئەو کەسانەی کە چەکدارن(هەروەك دەشێ وشەی چەك بەمانای قەڵەمیش بێت(چەکی من قەڵەمە))، واتا خەباتکردن‌و کۆششکردن بۆ ژیانێکی باش‌و ئازاد، یاخود وەك بەرگریکردن. واتاکەی ئەوەیە کە پێشی مەرگ کەوتوە، یان ئامادەیە بۆ مەرگ، ترسی نییە لە مەرگ. ئەو کەسەی کە پێشمەرگەیە ئامادەیە لە پێناو ئەو ئامانجەی خۆیدا بمرێت. هەروەك پێشمەرگە لەبەرانبەر دوژمندا دەوەستێت ئامادەنییە سەر نەوی بکا بۆ دوژمن، مەرگی پێ باشترە لەوەی ئازاد نەبێت‌و کۆیلە بێت یان ڕەزیل، مردنی سەربەرزانە هەڵدەبژێرێت نەك ڕەزیلانە. یان وا پێناسەی دەکەن "گەورەترین‌و جەوهەریترین پێناسەی پێشمەرگە ئەوەیە کە مرۆڤێکە خۆپەرست نییە"[٣٧] واتە خەباتەکەی‌و کۆششەکەی تەنیا بۆ خۆی نییە، زۆرکات خەبات دەکات بۆ نەوەکانی پاشخۆی یان بۆ میللەتەکەی، واتە خۆ کردنە قوربانی بۆ ئەوانیتر، بێگوێدانە بەرژەوەندی، بەڵام تاچەند ئەم واتایەی لەئێستادا گۆڕاوە ئەوە شتێکی ترە، دەشێ ئێستا واتاکەی گۆڕابێت واتە دیدی جیاواز هەبێت بۆ پێشمەرگە. پێشمەرگە پێناسەو واتای جیاوازی هەیە، کە خۆی ناوێکە، بەڵام وەك میتافۆر وایە وەك سەردار عەزیز دەڵێت پێشمەرگە "مەرگی تێپەڕاندووە. ڕووداوێکی وەها مەحاڵە. بۆیە پێشمەرگە

میتافۆره. میتافۆرێك بۆ ژیانێك كه مـهرگی تێپهڕاندووه. بـهڵام مـهرگ تـهنها مهجازیانه تێئهپهڕێنرێت"[٣٨] لهبهرئهوهی مرۆڤ ناتوانێت مـهرگ تێپـهڕێنێت، واته جۆرێكیشه له وره، جۆرێكه لهنهبهزیو دلێری كه سڵ نهكردن له مـهرگ كه كۆتا ڕووداوه كه مرۆڤ ئهزموونی دهكات.

٤/مردن له فهرههنگی "ڕێژنه"دا:.

- شامهرگ:مردن لهبهرخۆشیو شادی(لهخۆشیانا شامهرگ بوو)[٣٩].

وهك چـۆن مـرۆڤ زۆركـات لـه دڵخۆشـیدا دهگـری، ئـهواش لـه شـادیدا دهمرێت، یان ئهو مرۆڤه بهرگهی ئهو خۆشییهی نهگرتووه، خۆشییهكه هێنـد گهوره بووه كـه نـهیتوانیوه بهرگـه بگرێـت. یـان بڵێین ئهمـهی كـه مرۆڤهكـه لهخۆشـیدا دهمرێـت هۆكارهكـهی بـۆ ئـهوه دهگهڕێتـهوه كـه ئـهو مرۆڤـه مرازی(ئامانجی ژیانی)هاتۆته دی. دایكێك دهڵێت

نم. خوا دهكا ئهو منالانـهم دهچنه ماڵوحـاڵی خۆیـان ئـهوكات بشـمرم قهیناكا یان ئۆخهی دهكهم.

یان باشترین مردنی بۆ بوو، چونكه ئێمهی مرۆڤ زۆر بایهخ به چۆنییهتی مردن دهدهین، نامانهوێ مردنی سهرجێ بمرین، یان بهدهستی دوژمن بمرین. مردنی سهربهرزانهش جۆرێكه له شا مهرگ. (بهسنییه بهسهر بهرزی دهمرم– كوڕهكهم بهسهر بهرزی مرد ئهوه بایی هـهموو شـتێكه)، شـوێنو كـاتیش بـۆ مـردن زۆر گرنگـه لای كـوردی موسـڵمان، لـهرۆژێكی پـیرۆزدا مـرد، واتـه ئاواتخواسـتن ههیـه بـۆ كـاتێكی پـیرۆز تیایـدا بمریـت، ئهمـهش لـه ئـایینی ئیسلامهوه سهرچاوهی گرتووه، وهك چۆن مردن لهشوێنی پیرۆزیـش گرنگـی خۆی ههیه، بۆ نموونه لـهناو مزگهوتـدا یـان لـه مهككـهو مهدینـه بمریت(ئـهو شوێنه پیرۆزهی بوو بهنسیب). هاوكات دهشێ لهڕووی زانسـتی پزیشـكییهوه لێكدانهوهی ورد بۆ ئهم دۆخه بكرێت كه مرۆڤ چـی لێدێت، وادهمرێـت، واتـه ههناسهی تهنگ دهبێت یان دڵی هێند خۆشه كه بهرگهی ناگرێت.

- مردماو:مای:واتە نەمردی[٤٠].

ئەم دەربڕاوە زیاتر لە گفتوگۆدا لەدایکدەبێت، دوو ئاشنا کاتێك یەکتر دەبینین هەندێکات بۆ گاڵتەو پێکەنین، یەکیان ئەوە بەئەویتر دەڵێت. یان دەمێکە ناسیاوێکت نەبینیوە دەڵێیت ئەوە ماوی، وەڵا وامزانی لەم شارەدا نەماوی، لەکاتێکدا ئاوازەکە پرسیارییە بەڵام پرسیاریکیشە گەر وەك پرسیار و وەك واتای سیمانتیکی وەریگرین لەم دۆخەدا بێ واتا دەبێت چونکە کەسەکە دەبینێت کە ماوە بەڵام وەك گاڵتەپێکردن یان تانەدانێك بەوەی کە بۆ سەردانمان ناکەیت. یان گەر دۆستی نزیکت بێت دەڵێیت وامزانی مردوویت. بەڵام لە دەوروبەرێکیتردا ئەم وتنە دەوترێت، کاتێك کەسێك ڕووداوێك یان حاڵەتێك لێی ڕوبدابێت کە مەترسیدار بووبێت، واتە ڕووداوەکە هێند گران بووە کە ئەو کەسە دەبینێت سەلامەتە پێی دەڵێت. هەرباشە کە نەمردی (ماوی).

واتە سەیرە کە ماوی، سوپاسگوزاربە کە ماوی چونکە ئەو دۆخەی کە تۆی تیابووی بڕوانەکراوبوو بژیت. لەدەوروبەرێکی تردا ئەمە دەوترێت بەم شێوەیە.

- ئەوە ماوی؟
- جا ئەوە کەی مانە.(ئەم گفتوگۆیە ئاواز ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت).

وەك دیارە ئەمە ئاوازێکی زۆر ڕۆڵ دەبینێت، ئاوازی کەسەکە دەریدەخات کە بە ڕواڵەتی تێنەکەویت کە دۆخی کەسەکە باشە، واتە ئاوازەکە وا دەریدەخات کە گوزارشت لە حاڵی تەواوی خۆی بکات(جا ئیتر ئەو کەسە بە مەبەست بێت یان هەر بەڕاستی ئازاری هەیە). ئەم کەسە دەڵێت ئەم نەمردنەی من هێند دڵخۆشکەر نییە چونکە حاڵم زۆر خراپە، واتە سوپاسگوزار نییە کە زیندووەو نەمردووە، چونکە ڕەنگە مردنەکەی بۆ باشبوایە یەکجار بوو نەجاتی دەبوو.

- دەم مردووله: منداڵێك یان بەرخ و كاژیلەیەكی كە ناتوانیّ و هێزی مژینی دایكی نییە—كەسێك كە زۆر شەرمنە و نازانیّ قسەبكا.[٤١]

لە سلێمانی بەم كەسە دەوترێت (دەم مردوو) كە ئیدیەمێكە. واتە كاتێك یەكێك لە ئامرازی هەستەكانمان كە قسەكردنە لاواز بێت، وەك مردوو تەماشای دەكرێت، چونكە دەبێت بەجووڵە و چالاك بێت، هەركات ئەم چالاكیەی نەما وەك مردوو وایە، ئەمەش خاسیەتێكی مردنە، سستی هۆكارێكە بۆ لەدایكبوونی ئەم دەربڕاوە. هاوكات دەشیّ نەتوانینی خواردنیش بگرێتەوە، واتە دەشیّ شەرم ڕێگر بێت یان نەتوانین(دڵنەبردن) بۆ خواردن كە خواردن دانرابێت، نەتوانێت بیخوات. كەسەكە بڵێت. نم. دڵم نایبات. وەڵامی كەسی بەرانبەر دەشیّ دەربڕاوەكەی سەرەوە بێت. كەسانێك كە ئەم دەربڕاوە دەردەبڕن ڕەنگە مەبەستیان بێت كەسی دەممردوو بەشخوراو نەبێت، یان كەمێك بەهەڵپە بێت.

- ڕەگی گون مردن:لەپیاوەتی كەوتن—وشكاو هاتن(ڕەگی گونی مردووە داوای ژنیش دەكا)[٤٢]

ئەم دەربڕاوە مەبەست لێی توانا و هێزە، كاتێك یەكێك لە ئەندامەكانی جەستەمان ئەو توانایەی نەما وەك مردوو لێی دەڕوانین، واتە بەشێكە لە مردن، نەك تەواوی مردن. هاوكات دەشیّ بیچوێنین بەگوڵ كاتێك كە ئاوی لێدەبڕێت و وشك دەبێتەوە و دەمرێت.یان نەمانی ئەو ئاوەی كە بۆ پیتاندن پێویستە و سەرچاوەی ژیانبەخشینە.

- گۆرەهو: مردووی بیّ گۆڕوبزربوو، مردووی بێسەروشوێن(مردووە و خوا دەزانیّ لەكویّ گۆرەهو بووە)[٤٣]

شوێنی مردووەكان گۆڕەكانن، كاتێك مرۆڤ كە دەمریّ دەبرێت بۆ گۆڕستان، بەڵام لەهەندیّ دۆخدا دەشیّ ئەو مرۆڤە گۆڕەكەی دیار نەبێت، یان وەك ڕقێك زۆرجار دەوترێت گۆڕ بەگۆڕ. كە ئەمە لەبوونی ڕقەوەیە

بەرانبەر بەکەسێك. بەڵام مردووی بێسەرو شوێن، بەواتای ئەوە نایەت هێندەی دەرخەری حاڵەتێکە کە واقعێك وایکردووە ئەو مردووە گۆڕەکەی نادیاربێت. هاوکات دەشێ دەرخەری ئەو بارو دۆخە بێبەزەیی‌و دڵڕەقانەیە بێت کە دوژمن بەرانبەر بەکەس‌و نەتەوەیەکی دەکات. میللەتی کوردیش دەشێ بەیەکێك لەو نموونە زیندووانە بهێنینەوە کە ڕژێمی بەعس ئەم ئاسەوارەی زۆر بۆ جێهێشتوین کە هێند زەقە شایەنی سەلماندن‌و بەڵگە هێنانەوە ناکات.

- مەرگەسەری:چەرمەسەری، دەردەسەری، کوێرەوەری[٤٤].

مرۆڤ هەوڵدەدات لە ئازارو نەهامەتییەکان خۆی بپارێزێت، چونکە خۆشی ژیان لەوکاتەدا دەردەکەوێت، بەڵام کاتێك ئەمە پێچەوانە دەبێتەوە ئیدی ژیان دەبێتە دۆزەخ‌و زۆر مرۆڤ بەرگەی ناگرێت، وەك دەوترێت. کە ئەو هەموو ڕۆژێکی مردنە. ئەو نەهامەتییە ڕیتمی ئاسایی ژیان تێکدەدات بۆیە وەك مەرگ وایە بۆ مرۆڤ، هەندێ مرۆڤ لەو حاڵەتەدا پەنا بۆ مردن(خۆکوشتن)دەبات، کە خۆکوشتن بە چارەسەر دەزانێت. بۆ تیمارکردنی ئەو برینەی ژیان مەرگ هەڵدەبژێرن، واتە ژیانێکی پڕ لە عەزاب هاوتای عەزابی مەرگە. بەڵام مەرگ ئازاری مەرگیش ئازارێکی دروستکراوە، کێ دەڵێ ئازاری هەیە، تا ئێستا کەسێك هەبوو مردن ئەزموون بکات‌و وابڵێت؟ یان تەنیا بینینی ئەوانیترە لەسەرە مەرگدا . یان دەتوانین بڵێین ژیانی چەرمەسەری ژیانە لەناو مەرگدا، واتە ژیانێکی دۆزەخاویە.

مردن لە فەرهەنگی "فارسی / کوردی"دا:

- مادر مردە/ صفت: دایك مردوو[٤٥].

لە زمانی کوردیدا وەك تانەیەك ئەمە دەوترێت کاتێك باوکێك لە منداڵەکەی تووڕە دەبێت دەڵێت دایك مردوو. یان دایکێك لە دەوروبەرێکدا ئەوە دەردەبڕێت کاتێك هەرای(بۆ دایك هەرایە، بەس بۆ منداڵەکانی

خۆشییە) منداڵەکانی بێزاری کردبێت دەڵێت. ئەوە دایکتان مردووە ئەو هەرایەتان لە چییە. لێرەدا پرسیار هەیە، بەڵام چاوەڕوانی وەڵام ناکرێت، جگە لەوەی دەیەوێت تووڕەی خۆی دەرخاتو ئەوان بێدەنگ بکات، یان وەك تانەیەك لەوان، چونکە دایك شیرینە. وەك دەوترێت منداڵ بە مردنی دایك هەتیو دەبێت نەك باوك. یاخود دەشێ وەك ناسینەوە بەکاربێت.

- مرحوم: صفت. ۱. خوالێخۆشبوو، ڕەحمەتی. ۲. بەرەحمەت چوو.[٤٦]

بەپێی دەورویەرە جیاوازەکان گوزارشتکردن لە مردوو دەگۆڕێت. خوالێخۆشبوو، پاش مردنی کەسێك دەوترێت بەکەسوکاری مردووەکە، یان هەندێکات بۆ گێڕانەوەی وتەیەکی کەسە مردووەکە. نم. خوالێخۆشبوو هەموو جارێ ئەیوت...هاوکات وەك پەسنیش بەکاردێت.

هەروەك لە واتای فۆرمی وشەکە بڕیاردانێکی تێدایە کە ئەم کەسەی کە مردووە خوا لێی خۆشبووە، واتە وەك ڕابردوو دەربڕاوە، لەکاتێکدا لێخۆشبوون لەدەسەڵاتی مرۆڤەکاندا نییە. بەڵام لەکاتی پرسەدا ئەو کەسانەی کە سەرەخۆشی دەکەن دەڵێن(خوا لێی خۆشبێت). یاخود دەشێ ئەو واتایەش بدات کە مرۆڤ دەمرێت ئیدی لە گوناهوتاوان دەردەچێت، چونکە ژیانکردن یەکسانە بە گوناهکردن مرۆڤی موسڵمان دەبێت خوا لێی خۆشبێت. ڕەحمەتیش هەر بۆ کەسی مردوو بەکاردێك. نم، ڕەحمەوبوی باوکت هەموو جارێ دەیوت. یان ڕەحمەتی زۆری حەز لە...

- مردن:مصدر لازم.مردن:۱/ گیان دان -۲. (کنایی)،وفات کردن/یافتن. کوژانەوە، دامرکان[٤٧]

تکا لە خوێنەر دەکەم بۆ زیاتر واتای "دانی مەرگ" بگەڕێتەوە بۆ بەشی دووەم لەکتێبی فەلسەفەی فینۆمینۆلۆژی یان پاتۆچکە[٤٨]. لێرەدا واتای مردن خۆی وەك کردار هەیە، جگەلەوەی گیاندان دەشێ مردن نەبێت

بەڵکو گیانەڵا بێت، واتە لەنێوان مردنو ژیاندایە، بەڵام گیاندان واتە گیانی دا، بەڵام گیانی بەکێدا؟ چونکە دان دەشێ مەبەست لە پێدان بێت، واتە شتێك دەدەیت (دەبەخشیت) جا لێرەدا گیاندانمان هەیە (کە گیانەڵایە) گیاندان، وەك مردن هەیە، هاوکات پێدانی گیانیش هەیە، کە بەخشینە من گیانی خۆم بە تۆ دەبەخشم، گیانی خۆمت پێدەدەم. بەڵام واتای سەرەکی مردنە گیانی دەرچوو. هاوکات وەفات کردن بەربڵاوە ڕەنگە سەرچاوەکەشی بگەڕێتەوە بۆ ئایینی ئیسلام، وەك وەفاتی پێغەمبەر(د.خ).

هەروەك بۆ واتای وێژەیش بەکاردێت وەك .مۆمی تەمەنی کوژایەوە.

کوژانەوەی مۆمی تەمەن، گوزارشتێکی ئەدەبییە، بەوەی کە ئەو مرۆڤە چوێنراوە بە مۆم، تەمەنی مرۆڤەکەش ڕووناکییەکەیەتی، واتە بوونی مۆم بە ڕووناکییەکەیەوە زیندووە هەرکات ئەو ڕووناکییە نەما ئیدی کۆتایی بەمۆمەکەش دێت، واتە هەرکات ئەو مرۆڤە (مۆمەکە) تەمەنی (ڕووناکی)نەماو تەواو بوو ئیدی کۆتایی بە خۆشی دێت، مردنی مرۆڤ وەستانی ڕووناکییەو نەمانی کاتە بەگوێرەی ئەو مرۆڤەوە. دامرکانیش، دەشێ مەبەست لەوە بێت شتێك لە جووڵە دەکەوێت، یان ئەوەی کەسێك دەسوتێ یان خەرکبووە بسوتێت دەڵێن خەریکبوو کڵوکۆی دامرکێ. دەشێ واتا وێژەییەکەی ئەوە بێت کەسێك دەسوتێ لەتاو کەسێکی تر(یان مەعشقوکەی).

- مردە: (صفت):مردوو، ژین لێبڕاو[٤٦].

لێرەدا وەك ئاوەڵناو هاتووە، لە ڕووبەرێکی زۆر بچووکدا، کە واتای پراگماتیکی دەتوانێت لێکدانەوە بکات. بەکەسێك دەوترێت مردوو.

مەبەستی ئەم دەربڕینە بە کەسەکە ئەوەیە کە زۆر گێلو حۆلە، وریا نییە، بێئاگایە، کە یەکێك لە خاسیەتەکانی مردنیش لە ئاگایی خستنە. هاوکات دەشێ لەدۆخی تریشدا بگوترێت کاتێك مەلایەکی ئایینی یان کەسێك

کە باسی مردوو دەکات، ڕەنگە وەك ئامۆژگاری بۆ زیندووەکان باسی مردوو بکات، بڵێیت (لەرۆژانی جەژندا سەردانی مردوو خراپەیە).

ژین لێبڕاویش، ژیان نەمان دەگرێتەوە، ئەو کەسە لەدەرەوەی ژیانە. ژیانیش پێچەوانەی مردنە. واتە یان ئەژیت یان ئەمریت نا توانیت لەیەککاتدا هەم بژیتو هەم مردبیت، مەگەر لەدۆخی تایبەتدا نەبێت کە سەرەمەرگ یەکێکە لەوانەی کە لەنێوان ژیانو مردندایە. یاخود دەوترێت (ئەمە کەی ژیانە منی تیام خوا هەزار ژیانی وا ببڕێت) هاوکات (سەرە) واتە ڕیزگرتن. سەرەی مەرگیەتی.

- مردەباد(دعا): بمرێ، نەمێنێ[٥٠].

لێرەدا نزاکردن هەیە بۆ مردن، حەزدەکەیت کەسێك نەمێنێ لەم ژیان چونکە بوونی ئەو مەترسی لەسەر ژیانی تۆ هەیە بۆیە نزادەکرێت کە بمرێت. نم. خوایە ڕزگارم کەیت لەم بەلآیە.

یان دەشێ زۆر بەپێچەوانەوە بێت کەسێك مانی ئازاراوی بێت بە مردن نەجاتی بێت (واتە مردن بۆی باشبێت) نزا دەکەیت خوایە زوو نەجاتی بدەیت، لەو دۆخەی کەتیایەتی. نم. خوایە زوو نەجاتی بدەیت لەو عەزابە.

چونکە کەسەکە لەگیانەلآدایە، کە گیانەلآش ئازاراوییە. گەر لە نزاکردن بێینە دەرەوە دەشتوانین لەو دۆخەدا کە سەرکردەیەك لەجەنگدا کەسێکی مەبەستە کە وەك دیل دەستی کەوێت. دەڵێت. نامەوێ بمرێ .

(نا)ی نامەوێکە دەبێتە نەرێکردنی (بمرێ)کە، واتە پێچەوانەکردنەوەی بمرێ.

جەمال خەمبار لە شیعرێکیدا دەڵێ (بمرێ ئەو دەستانەی کە چەترەکەیان لێستاندم ...) بەواتا کەسەکە نەمردووە بەس خواست هەیە بۆ مردنی.

- مردە پرستی (اسم): مردووپەرستی، ڕێزلێنانی لەرادەبەدەر بۆ مردووانو شانازی پێ کردنیان[٥١].

دەکرێت ڕیشەی مردووپەرستی ببەینەوە بۆ دێرین، کە مرۆڤەکان مردوویان پەرستووە، بەڵام ئەمە تا چەند پەیوەندی بەو بیرکردنەوە کۆنەوە هەیە، ئەوە جێگەی پرسیارە؟ بەڵام مەبەستەکە لێرەدا بایەخدانە بەمردووەکانو بەجۆرێك فەرامۆشکردنی زیندووەکانە، کە ئەمەش ناڕەزایی لای زۆرێك لەخەڵکان دروستدەکات، بەتایبەت خەڵکانی تێگەیشتوو و هەندێك ڕۆشنبیر ئەمە بە کولتوور دادەنێن، بڕوانە کتێبی "چێژی مەرگدۆستی"[٥٢]. وتن لەسەر ئەمە زۆری دەوێت کە ناکرێت لێرەدا، بەڵام ئەوەی کە ناوی شوێنو یاریو گەڕەكو باخچەو... بەناوی مردووەکانەوەن جۆرێکە لە مردووپەرستن، یادکردنەوەو چلەی ماتەمینی، ڕێوڕەسمگەلێك بۆ مردووەکان ڕێزدانانێکە بۆ مردووەکان، پەرستن واتە پیرۆزکردنی مردووەکان. واتە پیرۆزکردنی مردووەکان تارادەی لەیادکردنی زیندووەکان، واتە بایەخدان بە مردوو بەچەشنێك لەسەر حسابی زیندووەکان.

٥/ مردن لە فەرهەنگی "وشە گوڵینەکانی ئاویەر":

- ماڵ و میرات: سامانو دارایی بەجێ ماو لە مردوو[٥٣].

مرۆڤێك کە دەمرێت دەشێت لەپاشخۆی شتگەلێکی لێ بەجێ بمێنێ، ئەو شتانە ناوی لێدەنرێت ماڵو میرات، کە بەپێی ئایینو یاسا هەوڵدەدرێت ئەو ماڵو میراتە بەشبکرێت بەسەر کەسە نزیکەکانی مردووەکەدا، یاخود دەشێ لەوەسیەتدا ماڵو میرات دابەشکرێت، واتە ئەو کەسەی وەسیەت دەکات پاشخۆی لەوەسیەتەکەیدا ماڵو میراتەکەشی دابەش دەکات (دیاری دەکات). کە خۆمان پێی دەڵێین (میراتی). بەڵام ئەم وشەیە زۆرکات وەك نزاو تانەدانو ڕەقگیریەك بەرانبەر بەکەسە زیندووەکان دەوترێت.

نم. بەمیراتی کەویت. دیارە زیاتر ڕەکەزی مێ ئەمە دەردەبڕێت، کە شتێککرابێت بەحەزو، ویستی ئەم کەسە نەبووبێت. واتاکەشی ئەوەیە کە خێری لێنەبینێت ئەو شتەی کە وەریگرتووە، یان نەگاتە ئەوەی کە ئەوشتەی پێ ببینرێت (بمرێت). دەشێ لە ئاستێکی گەورەتردا میرات بخوێنینەوە بەوەی کە دەسەلاتدارێك یان پاشایەك دەسەلاتەکەی بەجێدەهێلێت بۆ نەوەکانی پاشخۆی، واتە مانەوەی دەسەلات بەمیرات، کەئەمەش لە ئێستادا بە نادیموکراسیترین حالەت دادەنرێت، چونکە دەسەلات گرتنە دەست دەبێت بە هەلبژاردن بێت، بەلام بەمیرات مانەوە لەدەرەوەی هەلبژاردنە. هەروەك ئەم دەربڕاوانەشمان هەن کە تایبەتن بە میرات. (میراتگر– وارس...).

– مران:بەکوشتدان، کوژران بەگشتی، کوژران.[٥٤]

لێرەشدا سنووری مردنو کوشتن تێکەلکراوە. وەك باسکردنێك لەکۆڕ و دانیشتنێکدا کەباسی کۆمەلێك بکەن کە چون بۆ شەڕ دەوترێت. نم. هەمویان مران (کوژران)، کەسیان لێدەرنەچوو (کەپێشتر ئاماژەمان پێدا).

– مرانن:مراندن، کوشتن[٥٥].

دەشێ بەدەر لەواتای کوشتن، واتای لەچالاکی خستنیش بگەیەنێت. هاوکات بەدەر لە مرۆڤ بۆ شتیتریش (مرانن) بەکاردێت وەك دەوترێت . سەیارە مرانن.

کاتێك ئۆتۆمبێلێك مۆدێلی نزم بێت، بتەوێت بیگۆڕیت بە ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل بەرز دەبێت مۆدێل نزمەکەی بۆ بمرێنیت، کە ئەمە هەندێجار وەك یاسایەك لە وەزەراتی هاتووچۆ بڕیاری لەسەردەدرێت.

– مردن:گیان لەلەش دەرچوون، مەرگ[٥٦]

بەپێی بیروباوەڕەکان جیاوازی هەیە لەوەی مرۆڤ بۆ دوو بەش دابەش بکرێت، ئەمە کێشەیەکی فەلسەفیە، بەلام بەشێوە ڕۆشتوەکەی مرۆڤ لە

گیـان (ڕۆح) و جەسـتە (لـەش) پێکهـاتووە، ئـەوەی زیندوویـەتی مرۆڤـی هەڵگرتوە ڕۆحە، کاتێك ڕۆح لەجەستە نەما ئیدی جەستە دەمرێت. چونکە بـاوەڕی ئـاییی ئێمـە وایـە کـە ڕۆح نامرێـت، بـەڵکو جەسـتە دەمرێـت. لـە واتاکەش وردبینـەوە هێزێـك هەیـە ئـەو ڕۆحـە لـە جەستە دەردەکـات. واتـە هێزێك هەیە دێت ئەو گیانە لەو لەشە دەردەکات، یاخود ئەوە گیان خۆیـەتی (هێزی خۆیەتی دەردەچێت لە لـەش) دەشـێ ئـەو هێـزە بـەپێی بیروبـاوەڕی جیـاواز بگۆڕێـت، دەشـێ خـوا بێـت، دەشـێ پیربـوون بێـت، نەخۆشـی بێت...دەشێ ئاڵوگۆڕ بێت (کراسگۆڕین).

٦/مردن لە فەرهەنگی "کاروان"دا:

- مردەخور: مردووخۆر[٥٧]

ئـەو ئاژەڵانـەی لەسـەر لەشـی مـردوو دەژیـن، واتـە ناوەکـە واتاکـەی لەخۆیـدا هـەڵگرتووە، خـواردنی مـردووە، لەلایـەن هەنـدێ ئاژەڵـەوە، بـۆ زانیاریش هەندێ ناوچە (مرۆڤخەڵێك) هەیە کە گۆشتی مرۆڤ دەخۆن[٥٨].

مردە سوزاندن: مردوسووتاندن[٥٩].

سووتاندنی مردوو لەلای هەندێ لە دینەکان پێویستبووە، وەك چۆن لە ئـاییی ئیسـلامدا ڕێـوڕەسمی سـپاردنی مـردوو بـەخاك (گۆڕسـتان) ئەرکـە، بەهەمانشـێوە بـۆ ئـەوانیش سـووتاندنی مـردوو ئەرکـە (مـردن لـە ئاییـندا). هـەروەك چـۆن لـەبیرو ئایدیاگـەلێك لـەبارەی بەخاکسـپاردنەوە هەیـە، بەهەمانشێوە ئایدیاگەلێکیش لەبارەی باشی یان پێویستی سووتاندنی مردوو هەیە.

مردە شوستن: مردووشتن[٦٠].

شـۆردنو پاککردنـەوەی کەسـی مـردووە، کەسـێك کـە دەمرێـت پـێش ئەوەی بە خاکی بسـپێرن دەیشـۆرن، مەبەسـتی شـۆردنیش زیـاتر ئایینییـە،

هاوکات بۆ ئەوەیە تا بە پاکی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا. واتە مردووشتن کردارێکە، بکەرێك یان زیاتری هەیە کە پێی دەوترێت مردووشۆر، ئەم بکەرە، دەکرێت وەك پیشەیەکیش لێی بڕوانین. شۆردنی مردووش نیشانەی بەهادانانە بۆ کەسی مردوو (بۆ مرۆڤ) چونکە کە مرد ئیدی دەستی لێبەرنادرێت بەڵکو وەك زیندوو چۆن پێویستە پاك بێت کە دەچێت بۆ شوێنێك یان سەفەرێك، ئەو مردووەش پێویستە بەپاکی بڕوات بۆ ئەو شوێنە نوێیە، کە گۆڕو گۆڕستانە.

مرگ خدایی: مردنی خوایی.[٦١]

مردن لەو ڕووداوانەیە کە مێژووی مرۆڤایەتی قەرزارێتی، چونکە ئەم مردنە چەند تۆقێنەرو سامهێنەرو ئازاراوی و ترس هێنەر بێت، دواجار ئەوە مردنە چووەتە ناو هەموو پنتێکی کارەکانمانەوە، لەئەدەب و هونەرو فیلمو ...چونکە هێزو نهێنی... ئەم مردنە وایکردووە بتوانرێت سەرسامامان بکات، واتە زۆرکات لەبەردەممان کەسێك دەمرێت پێی کاریگەر نابین (هێند) وەلێ کاتێك کارەکتەرێك یان کەسێتیەك دەمرێت زیاتر کاریگەر دەبین. ئەمە جگە توانای ئەو کەسە دەردەخات کە چۆن توانیویەتی کاریکاتە سەر وەرگر، هاوکات ئەوەی زۆر ئەم کاریگەریەی دروستکردووە چۆنییەتیەکەیە، واتە مردنەکە چۆنبووە، دۆخی مردنەکە، تەمەنی مردووەکە...بەشێوەیەکی گشتی بایەخدان بە چۆنییەتی مردن (دەشتوانین بڵێین خۆکوشتن) گرنگی خۆی هەیە، کەسانی هۆشمەند زۆرکات خۆیان چۆنییەتی مردنی خۆیان دەستنیشاندەکەن (صادق هیدایەت)، چونکە چۆنییەتی مردنی لا گرنگە، بەڵام خۆکوشتن جیاوازی زۆرە لەگەڵ مردن، ڕاستە مردن حەتمیە بەڵام خۆکوشتن جۆرێك لە بڕیاردانە لەسەر مردنی خۆت، دەشکرێت بڵێین پێشخستنی وادەی مردنە. (خۆکوشتن وەك کامۆ دەڵێ بابەتێکی فەلسەفییە زیاتر لەوەی بابەتێکی سایکۆلۆژیو سۆسیۆلۆژی بێت، هەربۆیە زۆری دەوێت

قسەی لەسەر بکەین)[٦٢] هاوکات ئەوەش گرنگە کە ئاماژەی پێبکەین کە لە ئێستادا کەسگەلێك هەن مردنەکەشیان دەتوانین بڵێین پۆزاویە، یان بەجۆرێك مردنەکەشیان بۆ مەبەستێکی سەیرە، هەوڵدان بۆ مردن بەشێوازێك کە پێشتر ئەو شێوازی مردنە نەبوبێت، ئەم مردنە بۆ ناوبانگە واتە مردنێك ببێتە مانشێتو سەردێری بڵاوکراوەکان. ئەم مردنە لەپێناو ناو (بوون بەناو) بەدەستهێناندایە، ئەمری لەوەدا دەبینێتەوە، لەکاتێکدا خۆی دەمرێت ئیدی نازانم ئەو ناوبانگەی بۆ چییە؟ هەروەك لە کتێبی "ئەزموون"ی شێرکۆ بێکەسدا یەکێك لە دۆستەکانی (شێرکۆ بێکەس) ئاواتی ئەوە دەخوازێت بمرێتو شێرکۆ شیعری بۆ بنووسێت. بۆ ئەوەی زۆر لەباسەکە دوورنەکەومەوە دەڵێم، مردنی خوایی شێوازێکی مردنە کە بەگشتی مردنێکی باشە، چونکە خەڵکی ئەم مردنەیان پێخۆشە، بەڵام مردنێك کە لەسەر جێ بێت ئەمە ناخۆشە، چونکە ئەمجۆرە مردنە زیاتر هەست بە بێدەسەڵاتی خۆت دەکەیت، تێدەگەیت پێویستت بە چواردەورەکەتە. ئەم مردنە کە لەم دێرە شیعرەدا هاتووە خۆشی هێنەرە.(بەشم چونکە مردنی ناو جێ نییە- شادم کە تا دواهەناسەش بە پێوەم).

خاڵێکی گرنگ لە "مردنی خوایی"دا ئەوەیە کە ئەمە پێمان دەڵێت مردنی خوایی واتە مردنیش هەیە خوایی نییە، واتە مردنێك هەیە لەلایەن کەسانی ترەوە یان شتگەلێکەوە دەدرێت بۆ نموونە چەك یەکێك لەو هۆکارانەی مردن بەخشە، یان پێدانی مردن کە دێریدا باسی دەکات تەنانەت ناسنامەش دیاریدەکات، من کە کوردم دەبێت بمرم (واتە بەعس بەهۆی کوردبوونمەوە مردنم دەداتێ یان جولەکە مردنی دەدرێتێ بەهۆی جوبوونییەوە. خۆکوشتن حاڵەتی زۆرە دەشێ هەڵهاتن بێت لە کلتورێك، واتە کەسی خۆکوژ کۆزانیاری هەیە بەرانبەر بەو ژینگەیەی تیایدا دەژی، دەزانێت کولتوورەکە ڕێگە بەم کەسە نادات ژیانێکی ئاسایی بژی، لەبەرئەوەی

هەڵەیەکی کردووە، کە ئەو هەڵەیە ژیانی دەخاتە مەترسیەوە. لێرەدا کەسێك کە خۆی دەکوژێت یان دەسوتێنێت، کۆزانیاری کولتووری هەیە، دەزانێت هەموو ڕۆژێکی مردنە بۆیە خۆی لەناو دەبات (نەجاتدان). بەڵام خۆکوشتن هەیە هەڵهاتن نییە لە کلتورێکی دیاریکراو بەڵکو لەئاستێکی بەرزدایە ئەو کەسە لە ژیان هەڵدێ، ئەم کەسانە کەسانی بلیمەتو زانان، چونکە دنیابینیان هەیە، ئەوان لەکۆی ژیان هەڵدێن، خۆکوژی هەڵهاتوو لە کولتوورە لۆکاڵیەکە گەر ئەو کولتوورە بێبەزەیە نەبێت (خۆی ناکوژێت) بەڵام ئەم زاناو خاوەن جیهاندیدە بوونی ژیان هۆکاری خۆکوشتنییەتی، یان بوونی بوون هۆکارە. هاوکات جۆرێکی تری خۆ کوشتن بریتییە لە نەبەردیو ئازایەتی (وای پێدەگوترێت) کاتێك دوژمن دەیەوێت بتکوژێت ئەو خۆی دەکوژێت نایەوێت بەدەستی دوژمن بکوژرێت. خۆکوشتن شێوەی زۆرە پێویستی بەباسی تایبەت هەیە ناکرێت لێرەدا بەقووڵی باسییکەین، چونکە خۆکوشتن، مردنێکی خۆویستانەی بە ئاگایە، هاوکات دەشێ بێئاگایانەش بێت، جگەلەوەی هەندێکات ناچارانەشە (چونکە بەرگە نەگرتن هەیە بۆ کولتوور یان بوون – دوژمن).

- مرگ زود رس: مردنی ناوەخت (زوو)(٦٣)

مەرگی ناوەخت (مەرگی ناوادە). پەیوەندی مردنو کات پەیوەندیەکی بەهێزیان هەیە، واتە خاڵی یەکەم مردن لەکاتێکدا ڕوودەدات، مردن زەمەنی بوونمان دەوەستێنێت، واتە من کە دەمرم ئیدی کاتیش لەگەڵم بۆ من دەمرێت، هەرچەند هەندێ هەوڵدەدرێت لەلایەن هەندێك لە مردووەکانەوە کە زەمەن قۆرغی خۆیان بکەن، واتە پاش مردنیش خۆیان دنیا بەڕێوە بەرن، یان دەسەڵاتیان بەسەر زیندووەکانەوە بەرز بێت (وەسیەت یەکێکە لەو شتانە). مردنی ناوەخت. وەك میوانی ناوەخت وایە، چون میوانی ناوەخت هاتنەکەی خۆشی هێنەر نییە، واتە ئەم مردنە خۆشحاڵمان ناکات بگرە

لەبێدەسەڵاتیمانە دەنا دەرمان دەکرد. چونکە مرۆڤی کورد پەیوەندی پیری‌و مردنی توند بەیەکەوە بەستوە.نم. (لەگەنجی بۆ پیری لە پیری بۆ مردن) ئەم دابەشکردنی تەمەنە هەرچەند بێباکیەکی زۆری تیا دەبینرێت بەرانبەر بە ژیان ، بەڵام پێشماندەڵێت کە مردن دەبێت لە پیریدا بێت، واتە گەر ئەو مردنە لەپیریدا نەبێت دڵگرانی زیاترە و زیاتر باس دەکرێت، پرسیار دەکرێت بەچی مردووە، چونکە ئامادەیی مردن لە پیریدایە نەك لە گەنجی.

مردنی ناوەختیش مردنێکی کتوپڕو خۆ سەپێنەرە، چەند ئێمە دڵگران بین بەمە بەڵام هاوکات لاوازین، وەك دێریداش دەڵێ مردن ئەرکی خۆی بەجێدەهێنێ، وەك بەرپرسیاریەتیەك ئەو کارە دەکات کە پێویستە بیکات، بەڵام ئێمە دەمانەوێت مردن ئەو کارە نەکات. هاوکات دەبێ ئەوەش بڵێم لە ئاییندا چیرۆکی موسا ئەوەی پێگوتوین کە کەس نازانێ خێر لە چیدایە واتە گەر ئەو مردنە ناوەختە دەشێ مانەوەی ئەو کەسە گرفتاویتر بێت، واتە خوا خۆی باشتر دەزانێت چیدەکات. بەڵام ئەوەی گرنگە کات‌و مردنە کە لەزۆرباردا گرنگی کات‌و مردن دەبینرێت. چونکە کات هۆکارێکە بۆ جیاکردنەوەی زیندوو لەمردوو، دەگوترێت کەی مردوە واتە تا ئەوکاتە زیندوو بووە پاش ئەوکاتە مردوە، هاوکات مرۆڤ کە دێتە بوون لەگەڵ خۆیدا کات دێنێت، واتە بوون‌و کات دوانەیەکی لێکدانەبڕاون، تا ئەوکاتەی من هەبم لەناو کاتدام، کە مردم ئیدی دەچمە دەرەوەی کات.

- مرگ گبی: مردنی پزیشکی[٦٤]

مردنی پزیشکیش تایبەتمەندی خۆی هەیە (کە لەبەشی مردن لەزانستدا خستومانەتەڕوو)

- مرگ مغزی: مردنی مێشکی.[٦٥]

مردنی مێشکیش دەشێ وەك مردن لەزانستدا بیخوێنینەوە. دەشێ وەك وەستان و لەکارکەوتنی مێشك ببینرێت. واتە ئەوکاتەی مێشك ناتوانێت

چـالاکیەکانی خـۆی ئەنجامبـدا، چـونکە ئـەوە مێشـکە کـە جوڵێنـەری ئەندامەکانی جەستەیە، وەك بڵێیت مێشك ڕۆحە (وەك چواندن).

٧/ واتای مردن/مەرگ لە پەندو ئیدیەمو وتنە ڕۆژانەییو گفتوگۆکاندا:

- مردن لە کونەلوتم نزیکترە:

ئەم پەندە یان دەربڕاوە، لەکۆنـدا بـۆ گوزارشـتکردن لـە مـردن یـان بـۆ ئاسایی وەرگرتنی مردن وتویانە، دیارە زیاتر بەتەمەنەکان ئەمـەیان گوتـووە (وە تائێستاش دەگوترێت)، واتە مـردن زۆر لێمـان نزیکـە کـە بـەهیچ جـۆرێ نـاتوانین لێـی هـەڵێین، یـان وەك ئـەوەی تانـەدان، یـان وەك نادیـاری کـاتی مەرگ، یان وەك ئاشنایەتی لەگەڵ مەرگ، کە لەکونە لوتم نزیکتر بێت دەبێت زۆر ئاشنام بێت، هەروەها ئەم دەربڕاوە دەشێ والێکی بدەینـەوە کـە مـردن وەك بەشێك لە خود دانراوە چون لەکونەلوتم نزیکترە، واتە بەشێکە لـەخۆم، وەك تاڵـە مووکـانی جەسـتەم، پێمـەوە نوسـاوە، دانـەبڕاوە، کەئەمـەش فەلسـەفەی هایدیگـەر بـۆ مـردن هـەمان ڕامانـە کـەمردن دانابڕێـت لـەخود. لەلایەکی تر دەشێ پیرەژنێك یان پیرەمێردێك بیڵێت کە نزیکی مردن بۆتـەوە (من خـۆم لـێم بیسـتوون)، یـاخود دەشـێ بگوترێـت (لـە دەمـاری گـوێم لـێم نـزیکترە مـردن) کـە ئەمـەش زیـاتر هـەمان مەبەسـت دەگرێتـەوە وەك بڵێـی گوێلێبوونی مردن بگرێتەوە. هاوکات پێمانوایـە ڕیشـەی ئـەم دەربـڕاوە یـان پەندە (لەکونـە لـوتم نـزیکترە) بـۆ ئینجیـل دەگەڕێتـەوە چـونکە لـە (کتـێبی پـیرۆز- لەڕێگـەی کونەلوتـەوە ژیـان بەبـەری ئادەمـدا کـراوە)[٦٦] واتـە سەرچـاوەی ژیـان کونـەلوت بـووە، هەربۆیـە دەشـێ ئـەم دەربـڕاوە لـەوێوە سەرچاوەی گرتبێت.

- بۆ کوێ دەچین هەموو هەر دەمرین:

کەسێك پرسیار دەکات لە گشتێك کە خۆشی جیاناکاتـەوە وەك بەشـێك لەو گشتە (ئێمە)، پرسیارەکەشی بۆ ئەوەنییە کە چاوەڕێی وەڵام بکـات (بـۆ

کوێ دەچین)، پاش پرسیارەکەی خۆشی وەڵام دەداتەوە، کە چوون بەرەو مردنە. ئەم دەربڕاوە بەپێی دەوروبەرەکە واتاکەی دەگۆڕێت. دەشێ وەك ئامۆژگاری ئەمە بڵێ. یان دەشێت وەك دڵدانەوەو ئاسانکردنی خەمی کەسوکاری مردوویەك بێت (بۆ کوێ دەچین عاقیبەتی هەمومان هەر مردنە-هەمومان مردنیێ قەرزارین). خۆ دەشبێت وەك تانە یان وەك دەردە دلێ یان بە ئاگاهێنانەوەی (جووڵانی ویژدان) بەرانبەر بێت. کاتێك ئەم کەسەی ئەم دەربڕاوە دەردەبڕێت لاریەك (خراپیەك) لە کەسی بەرانبەردا دەبینێت، یان هەستدەکات، مامەڵەی ناجۆریان لەگەڵ کردووە (قۆڵیان بڕیوە). نم. بۆ کوێی ئەبات، وا ئەزانیێ کە نامرێت. بۆ کوێ دەچین(بۆ کوێی ئەبەین)هەموو هەر ئەمرین.

لێرەدا شوێن دەشێ مەبەست گۆڕبێت، یان دەشێ هیچ شوێنێ نەبێت، یان ڕۆژی مەحشەر(حساب)بێت، کە ئەوشتەی بە ڕێگەی باش پەیدای نەکەیت دەبێتە مایەی زیان بۆ کەسەکە، بۆیە ئەم کەسە ڕاستە دلگرانە بەرانبەر بەو غەدرەی کە لێی کراوە، بەلام برێك لە بێباکیشی تیا دەردەکەوێت، لەوەی کە دڵنیایە کە ئەو کەسە سوود لەو بەنموونە(پارە)یە وەرناگرێت. هەروەك لەو دەربڕاوەدا وەك بڵێی کەسێك نەبێت نەزانێت کە مردن هەیە، واتە هەمووومان دەزانین کە مردن هەیە، ئیتر بۆ خۆمان گێل بکەین، تۆ خۆت گێل کردووە لەمردن، نازانیت کە دەمریت.

- مردن لە دەرگای هەمووومان دەدات:

(واتە کەسێك دێت ناوی مردنە/مەرگە. جا مۆڵەتی بدەیت یان نا ئەو هەر دێت و تەنیا بۆ لای یەکێکتان نایەتو بۆلای ئەویتر نەیەت بەڵکو بۆلای هەر یەکێکتان دێت. لەدەرگادانیش بۆ مۆڵەتدان نییە(ئەو چاوەڕێی ئێوە ناکات مۆڵەتی بدەنێ) بەڵکو بۆ ئەوەیە کە کەسێك نییە لە ئێمە مردن ڕووی تێنەکات، ئەوە مردن خۆیەتی بڕیار دەدات (یان مردنیش بڕیاری پێکراوە).

لەم دەربڕاوەدا ئەوەش هەڵدەهێنجین کە ئەجەلت هات دەبێ هەر بمریت ئیتر با لەناو شەڕدا نەبیتو لە ماڵەوە بیت. یان هەریەکێك ماڵێکی هەیە (ماڵی ژیان) ڕۆژێ دێ کە مردن بێتە ناو ئەم ماڵەوەو بیڕووخێنێ (بتبات). واتە کەسێك نییە لە دەرگای ژیانی نەدرێت لەلایەن مردنەوە. هاوکات بۆ ئاگادارکردنەوەیەکی زانراویشە. چونکە زانراوە کە مردن هەیە بەڵام بەجۆرێکی ناڕۆشن دەوترێت یان ناڕاستەوخۆ، بێگومان وتنی ناڕاستەوخۆش مەبەستدا بەپێی دەوروبەرو کەسی بەکارهێنەر دەگۆڕێت.

- مردن وەك هەواڵ پێدان: لەخێزانێکدا کوڕی ئەو خێزانە هەواڵێك دەڵێت.

نم. فلانیش مرد.

لێرەدا هەست دەربڕین بەدیناکرێت جگە لە پێدانی هەواڵێك. کاتێك دایکەکە دەڵێت.

کە پێیان وتم قرچە چووە ناو دڵمەوە.

ئەمە هەواڵی نییە، بەڵکو هەواڵ پێدراوە، ئەم دایکە هەستی خۆی دەردەبڕێت بۆ ئەو کەسەی کە هەواڵەکەی بۆ دەگێڕێتەوە(چۆنییەتی هەستی خۆی دەگێڕێتەوە پەیوەست بە مردنی کەسەکە). بەڵام (هەستدەربڕین) بەپێی نزیکی(دۆستایەتی) لە کەسی مردووەکەوە کاریگەریەکان دەگۆڕێت یاخود بەپێی باشو چاکی و تەمەنی کەسەکە. لە کوڕەکەدا ئەو هەستە نەجولا بەلام لای دایکی هەستێکی زۆر جوولا. بەڵام گەر کوڕەکە بیگوتایە (بەداخەوە-گەنجیشبوو) ئەوکات هەستدەربڕینی کوڕەکەش دەردەکەوت.

- چەند خێرا بیت پێشی مردن نادەیتەوە:

ئەمە پەندێکی پێشینانە، ڕوو لە کەسێك دەکرێت کە خێرایەو هەڵپەی هەیە، هەڵپەکردن بۆ هەموو شتێك. واتە دەستگرتنێکی زۆر بەژیانەوە تا ڕادەیەك لەبیرکردنی مردن هەروەك بەم کەسەش دەوترێت (مردن هەیە).

مـردن هەیـە. پێدانی هـەواڵ نییـە بـەڵکو ئاگادارکردنەوەیـە، یـان تانەدانـە. خێرایی ئەو کەسە بۆ بەدەستهێنان تەنانـەت ئـەم بەدەسـتهێنانە دەشـێ بـە ڕێگەی خراپ بێت. واتـە هـەموو ڕێگەیـەك دەگرێتـە بـەر بـۆ دەوڵەمەنـدبوون (بەنموونە). ئەم پەندە بەپێی کەسەکە کە بەرانبەرەکەی دەیلێت و بەپێی مەبەستەکەش دەگۆڕێت واتاکەی. واتە دەشێت مەبەسـتی دڵسـۆزی بێـت بـۆ کەسی بەرانبەرو ئاگاداری بکاتەوە لەوەی کە ئەوەی ئەو دەیکـات باشنییە. هەروەك دەشێت وەك تانەدان بێـت خۆشـی بـە کەسـی بەرانبـەر نایـەت یـان کەسی بەرانبەری بۆ ناگیرێت و پەلەی کەسی بەرانبەر زیانە بـۆ ئـەم بۆیـە لـە ڕقدا ئەمەی پێدەڵێت. دەشێ وەك ئامۆژگاریش بگوترێـت کـە کەسـی دڵسـۆز بـەم مەبەسـتە دەیکـات. هاوکـات دەبـێ ئـەوەش بڵـێین واتـایی سـیمانتیکی پەندەکە پێمان دەڵێت کەسێك هەیە خێرایە لەویش خێراتر هەیە کـە مردنـە، واتە تۆ کە خێرایت بەڵام وەك مردن خێرا نیت. واتای پێشبڕکێ نییە لـەنێوان دو کەسدا. جگەلەوەی نەگوتراوەکەی پێماندەڵێت مـردن لـە مـرۆڤ خێراتـرە. هاوکات ئەمە خاسیەتێکی مردنیش دەردەخات کـە خێراییە(نـەمانزانی چـۆن مـرد– ژیـان کورتـە). هەرچـەند ڕەنگـە مەبەسـتی سـەرەکی ئـەم دەربـڕاوە خێرایی نەبێت یان ئەوە نـەبێت کـە مـردن خێرایـە، بـەڵام مردنـی ناوەخـت و کورتی ژیان و جوانە مەرگ... دەرخەری خێرایی مردنە، بەڵام تا چـەند ئەمـە خاسیەتی خودی مردنە یان ئەوە مرۆڤە کە ئەمە دەداتە پاڵ مردن؟

- مەگەر من مردووم:

لە گفتوگۆیەکدا ئەم دەربڕاوە لەدایکدەبێت، کاتێك کەسێك بەکەسـێکی تـر دەڵێـت، دەشـێ هـەم دڵسـۆزی دەرخـات هـەم تووڕەبـوونی کەسـەکە لەبەرانبەر (واتا پێچەوانە). بەپێی دەووبەرەکـە واتاکـەی دەگۆڕێـت دەشـێ لەدەوروبەرێکدا ئەمـە بگوترێـت بەکەسێك کـە کەسـەکە مکوڕ (سـور) بێـت لەسەر ئەوەی کارێك بکات، ئەو کارەی کە دەیەوێت بیکات ، کەسی بەرانبەر

خۆشحاڵ نییە بەو کارەو نایەوێت ئەوکارە بکات، بۆیە پێی دەڵێت تا من مابم تۆ ناتوانیت ئەوکارە بکەیت، مەگەر بەسەر لاشەی مندا بڕۆیت، ئەمە ڕەگەزی نێرو مێش بەکاریدێنێت. هاوکات دەشێ وەك دڵسۆزی بێت، کاتێك دوو دۆست پێکەوەن، دۆستێکیان شتێك بەکەسی سێیەم دەڵێت دۆستەکە ئەمەی پێدەڵێت، واتە بۆ بەمن ناڵێیت خۆ من نەمردووم، واتە تامن بمێنم نابێت داوا لەکەسێکی تر بکەیت، بەواتایەکی تر دەیەوێت بڵێت مەردایەتیم لە دەست دێت، بەم واتایە زیاتر دەربڕاوەکە ڕەگەزی نێر دەریدەبڕێت. هاوکات دەشێ زیندووبوونی کەسەکە دەردەخات، کە من هێشتا دەسەلاتو توانام ماوە، واتە جۆرە ئاگادارکردنەوەیەکی مەبەستداری تیایە، ئەگەر ئێوە پێتانوایە من مردووم ئەوا بەهەڵەدا چوون من نەمردووەم.

- فلانیش نەجاتی بوو:

ئەم دەربڕاوە هەواڵێك دەدات. (ئەم دەربڕاوە دەشێ هەواڵی لەدایکبوون بێت- دەشێ هەواڵی مردن بێت، بەلام ئەوەی یەکلایی دەکاتەوە دەربڕاوی پاش ئەوە، کە پێمان دەڵێت مردنە، چونکە کەسێك هەبووە نەخۆشبووەو زەلیلی سەرجێ بووە، مردنی باشتربووە لەو حاڵەی کە تیایدا بووە، بۆیە مردن بۆ ئەو کەسە ڕزگارکردنییەتی لەو حاڵە. مرۆڤی موسڵمان بەردەوام دەپاڕێتەوەو نزا دەکات لەو خوایەی کە خاوەن دەسەلاتی مردنە، واتە خوا کە دەسەلاتی هەیە بەسەر مرۆڤو مردنیشدا، ئەوە ئەوە بڕیار دەدات کێ چۆنو کەیو لەکوێ... بمرێت بۆیە نزای ئەوە دەکەن موسوڵمانان(خوایە زەلیلی سەرجێمان نەکەی-خوایە کەنەفتمان نەکەی). واتە باش نەجاتی بوو زۆرکات بەوەدا دەزانین کە کەسەکە مردووە ئەم دەربڕاوە دێت.

- داماوە دەمێکە کەفتەکارە(زەلیلی سەر جێیە):

هاوکات ئەم دەربڕاوە دەشێ هەواڵی لەدایکبوونی منداڵێك بێت، کاتێك دایکێك لەسەر وەختی منداڵبووندایە، منداڵەکەی دەبێت، دەوترێت نەجاتی بوو، واتە منداڵەکەی بوو، هۆکاری وشەی نەجاتبوونیش ئەوەیە کە

بەسەلامەتی منداڵەکەی بوو، یان ئەوەی کە بوونی ئەو منداڵە بۆ دایکەکە ئازاراوی‌و مەترسیدار بووە، کاتێک منداڵەکە لە دایک دەبێت ئازارو مەترسیەکە نامێنێت.

- لەبارچوونی منداڵ (مردنی منداڵ لەسکی دایکدا): لێرەدا ڕزگابوون نییە، واتە کاتێک دەوترێت شوکر بەسەلامەتی منداڵەکەی بوو. واتە منداڵەکەو دایکەکە ساغن، هیچیان لێنەهاتووە. بەڵام لەبارچوون، واتە منداڵێك هەیە هێشتا نەهاتۆتە ئەم دنیایەوە مردووە، واتە لەناو سکی دایکدا دەمرێت، بەواتایەکی تر ژیانی لەناو سکی دایکیدا کۆتایی دێت، نەك لەم دنیایە. پێش هاتنی دەمرێت. بەڵام لەبارچوون واتا ئەم منداڵە بارە بەسەر دایکدا، یاخود بارێکە بۆ دایك دەبێت ئەو بارە داگرێت، بۆ ئەوەی نەجاتی بێت، بەڵام ئەم بارە پێش داگرتنی تووشی گرفت دەبێت، ئەم بارە دەشێ بە بێ وەرگەڕان بگاتە شوێنی خۆی دەشێ وەرگەڕێ، وەرگەرانی واتە ناسەرکەوتووی‌و تیاچوونی منداڵەکە (چوون) هێمایە بۆ لەناوچوون.

- خوا عافوتکات (خوا عافوی کات)- بۆ کەسی زیندوو مردووش بەکاردێت:

ئەم دەربڕاوە زیاتر دەربڕاوێکی ئاینییە. لەدیدی ئاینەوە مرۆڤەکان تاوانبارو گوناهبارن پێویستیان بە لێخۆشبوونە، واتە لە ئایندا مرۆڤی بڕوادار قەرزاری خوایە، پێویستی بەبەزەیی خوایە بۆ لێخۆشبوون، چونکە ژیانکردن هۆکار بووە بۆ ئەوەی لەم ژیانەدا خراپە بکەین، بۆ لێخۆشبوونیش لەم خراپەیە دەبێت خوا لێمانخۆشبێت. کاتێك کەسێك دەمرێت بەتایبەت کەسی ئیماندار نزا بۆ کەسی مردوو دەکات کە خوا لێی خۆشبێت، یان خوا عافویکات لە گوناهەکانی. هاوکات دەشێ وەك وەڵامدانەوەش لەم دەربڕاوە بڕوانین لە پرسەدا کەسانێك کە دەچن بۆ سەرەخۆشیکردن لە کەسوکاری مردووەکە دەڵێن خوا عافوبکاو خوالێی خۆشبێت. لەلایەکی ترەوە ئەم دەربڕاوە تەنیا بۆ کەسانی مردوو بەکارنایەت بەڵکو بۆ کەسانی زیندووش

بەکاردێت، بەتایبەت لە ناو مزگەوت و شوێنە دینییەکاندا، یان لەناو کەسانی بڕوادارردا، کاتێك چاکەیەك بەرانبەر کەسێکی بڕواداردەکرێت کەسی بڕوادار دەڵێت.خوا عافوتکات.

- خنکان:

مردن شێوازی زۆرە، یەکێك لەشێوازو چۆنییەتیەکانی مردن، (خنکان)ە، واتە ئاو دەبێتە هۆکاری مردنی مرۆڤ. ئایا ئەمە دەسەڵاتی ئاوە یان ئەوە ئاوە بووەتە هۆکاری ئەم مردنە؟ هەروەك دەشێت ئاو ببێتە هۆکارێك بۆ خۆ لەناوبردن. واتە خۆخنکاندن. کەسێك بەهەر هۆکارێك بێت دەیەوێت خۆی لەناوبەرێت، بۆ ئەمە ڕێگەیەك هەڵدەبژێرێت کە دەشێ یەکێك لەو ڕێگەیانە خۆخنکاندن بێت. یان دەشێت بێ ئەوەی خۆی بیەوێت کەسەکە لەناو ئاودا بخنکێت.

- ئاوەکەی دووکان تا ئێستا ... کەسی تیا خنکاوە.

هاوکات دەبێ ئەوەش بڵێین بەهۆی ئاوەوە کە ئەو خاسیەتەی هەیە هۆکارە یان دەسەڵاتی هەیە کە مرۆڤ لەناوبەرێت ئەمە وایکردووە کە ئێمە لەحاڵەتی زۆر ئاساییدا خنکان بەکاربێنین. واتە چەند ئاو لەناوبەرە هێندەش ژیان بەخشە وەك تالیس کەیەکەم فەیلەسووفە ئاوی بەسەرچاوەی ژیان(بوون) داناوە(٦٧). هەربۆیە مرۆڤی کورد کە دەیەوێت ئاو بخوات وە ئەو ساتە لەبەردەستی نەبێت یان بیەوێت خێرا ئاوی بدەنێ دەڵێت:

خنکام خێرا تۆزێ ئاوم بدەنێ.

کە ئەمە نە خنکاوە بەس دەیەوێت خێرا ئەوەی بۆ بکرێت و گەر ئاوی نەدرێتێ دەشێ بخنکێت، واتە داوایەکی ناچارانە دەکات، کە وا لەکەسی بەرانبەر دەکات دستوبرد بکات.

- خوایە بە ئیمانەوە بمانژێنەو بەئیمانەوە بمان مرێنە.

داوایەکە/نزایەکە، مرۆڤ دەیکات لەخوا، چونکە خوا خاوەنی دەسەڵاتی ڕەهایە، ئەو ژیانو مردنی ئێمەی بەدەستە، چونکە داوا لە خواکراوە کە

بمانـژێنیٚ (بەئیمانـەوە)، ئـەوە خوایـە کـە دەتوانێـت وا بـژین کـە پێویسـتـە بـەوجۆرە بـژین (لـەرووی ئاینییـەوە جۆرێـك ژیـانکردن پێویسـتـە)، لێـرەدا هەست دەکەین مرۆڤ خۆی بێتوانایە، ناتونێت زاڵبێت بەسەر دەروونو ژیـانی خۆیدا بۆیە داوا لە خوا دەکات کە بەو جۆرە بژی کە خوا پێـی خۆشـە، واتـە ئەو ژیانەی کە ئەم مرۆڤە دەژی بەدەست خوایە، بۆیە داواش لەخاوەنەکـەی دەکات بەوجۆرە بیژێنە کە خۆی پێی خۆشـە. واتـە خوایـە ژیانێـك بـژیم کـە ئیمانی تیا بێت، تا ئەوەی کە مردیشم ئەم ئیمانـەم هـەر هەبێت(واتـە خوایـە ئیمان بکەیتە بەشێك لە وجودم لێم دانەبڕێت نەلە ژیان نەلە مردن). هاوکـات دەشیٚ داوای یارمەتیکردن بێت لەخوا کە خوا یارمەتی بدات بـەمجۆرە بـژیو بمریٚ. ئەم داواکردنە مرۆڤی موسڵمان زۆرکات دەیکات، بۆ ئەوەی لـەو ژیانـە ئەبەدیەی پاش ئەم ژیانـە کاتیـە، لـە بەهەشـتدا بێـت، یـان بەهەشـت ببێتـە شوێنی(واتا ئـەم نزایـە بـۆ ڕازیکردنـی خوایـە لەموسـڵمانان– لەکاتێکدا لـەم نزایـەدا موسـڵمان خـۆی بێدەسـەڵات کـردووە، یـان دەسـەڵاتی هەیـە بـەڵام داواکاری لەخوا هەیە یارمەتی بدات بەو جۆرە بژیو بمریٚ کە ژیـانی دوارۆژی باشبێت، واتە نزاکـە هـەم بـۆ ئـەم ژیانەیـەو هـەم بـۆ ژیانەکـەی تـرە، بـەڵام ژیانەکەی تر گرنگترە، هەروەك لەناو ئەم ژیانەدا مردنو ژیـانکردن ڕوئـەداتو هۆکارە بۆ ئەوەی ژیانی ئەو دنیا چۆندەبێت، بەڵام ڕووناکیەکە زیـاتر لەسـەر ژیانەکەی ترە).

- مردنو وەسیەت:

مرۆڤ پێش مردن وەسیەت دەکات، کردنی وەسیەتیش لە ئاییندا ئەرکە، ئـەم کردەیـە کـە پـێش مـردن دەکرێـت دەشـیٚ لـە مرۆڤێکـی ئاسـاییەوە بـۆ سەرکردەو پەیامبەرێك ببینرێت، کە زیاتر مەبەستیش لە وەسـیەت داواکاریـە لە کەسانێك کە ڕادەسپێرێن ئـەو داوایانـەی کەسـەکە جێبـەجیٚ بکـەن، واتـە مرۆڤی وەسیەتکەر پێش مردنی داواکانی دەدا بەکەسـانێك کـە دەتـوانن ئـەو

داوایانەیان بۆ جێبەجێ بکات. دەشێ وەسیەت بۆ ئەوە بکرێت کە پاش خۆی کەسێك نەیەتە پرسەی کەسە مردووەکەوە، واتە پێش مردنی جێدەستی خۆی جێدەهێڵێ بۆ پاش مردنی، دەشێ وەسیەت بێت بۆ دانەوەی قەرز. وەسیەتکردن جۆری زۆرە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت. هەروەك دەشگوترێت "کەس بە وەسیەت نەمردووە" واتە من کە وەسیەت دەکەم مەرج نییە بمرم، چون من ئێستا زیندووم بەڵام دەزانم کە هەر دەمرم، بۆیە پێش ئەوەی بمرم ئەم ڕاسپاردانەو داوایانەم هەیە، واتە ئەم مرۆڤە ترسی هەیە لەوەی کە چەند کارێك ماوە لە ژیاندا بیکات، دەترسێ مەرگ بوار نەدات خۆی ئەو کارانە بکات، بۆیە گرنگی داواکانی هۆکارە بۆ ئەوەی وەسیەت بکات، تا گەر خۆشی مرد کەسانێك هەبن پاش خۆی ئەو کارانە بکات کە ئەم پێویستبووە بیکات.

هەروەك دەشێ ئەو دەربڕاوە" کەس بە وەسیەت نەمردووە" کە کەسی هێناوە بۆ گوزارشت کردن لە وەسیەتی خۆی، واتە ئەو کەسانەی کە وەسیەت دەکەن بەم کردنە نەمردوون، ئەمەش زیاتر بۆ دڵڕاگرتنی کەسانی دەوروبەریەتی(کەسوکاری)، چونکە وشەی وەسیەت دەشێ چەند ئازاراوی بێت بۆ کەسی وەسیەتکەر هێندەش گران بێت بۆ کەسوکار، لەنێوان کەسانی وەسیەتکەردا جیاوازی هەیە کە تاچەند بەناچارانە وەسیەت دەکات یان تاچەند بە دڵەوە وەسیەت دەکات. وەسیەت ڕاسپاردەیە بۆ کەسانی ڕاسپێراو، واتە کەسێك هەیە ڕاسپاردەی هەیە، ڕاسپێراویش هەیە، بەڵام گرنگە ئەوە لەبەرچاوبگرین لەزۆرینەی کاتتدا وەسیەتکەر تاکەکەسێکە، بەڵام جێبەجێکار زیاتر لەکەسێکە، هەروەك دەشێ جێبەجێکار دیار بێت، دەشێ نادیار بێت، یان کۆمەڵگەیەك، مرۆڤەکان بەگشتی بن، وەك وەسیەتی سیاسیەك یان فەیلەسووفێك، شاعیرێك. هاوکات وەسیەت لەزۆرباردا چونکە دوا داوای کەسی مردووە گرنگی خۆی هەیە، جێبەجێکردنی ئەرکێکە لەسەر

زیندووان، زیندووەکان لەم کاتەدا دەبنە جێبەجێکاری داوای مردووەکان، واتە بەرنامەو پلانی مردووەکان جێبەجێ دەکەن، بەچەشنێك مردووەکان حکومی زیندووەکان دەکەن، وەسیەت دەشێ هەم هۆکارێك بێت بۆ ئاشتی یان شەڕ یان ئاوەدانی یان کاولکاری...واتە وەسیەت ڕووی زۆرە لێکەوتەشی زۆرە هەر وەسیەتێك بۆ خۆی خاوەنی ئەو خاسیەتانەیە. (٦٨).

- نامرێتو نەجاتمان بێت لەدەستی:

بەکەسێك دەوترێت لەبەرئەوەی مانەوەی ئەو یان زیندووبوونی ئەو مەترسی هەیە بۆ سەر ژیانی ئێمە- ئەوە مردنی ئەوە کە ڕزگارمان دەبێت. دەستی ئەو هێمایە بۆ دەسەلاتی ئەو، واتە تا ئەو دەسەلاتی هەبێت(زیندووبێت) ژیانی ئێمە خراپ دەبێت، چونکە ئەو سەرچاوەی ئازارە بۆ ئێمە. بەجۆرێکی تر ئارەزوو ویست هەیە بۆ مردنی کەسەکە، دەشێ ئەو کەسە کەسێکی ئاسایی بێت، دەشێ کەسێکی خاوەن دەسەلات بێت(دیکتاتۆرێك بێت). دەشێ هۆکاری تر هەبێت بۆ ئەم ویستە(هۆکاری دەروونی، کۆمەلایەتی، ئابووری، سیاسی...).

- تەمەن بوار بدات ئەوە دەکەم(خوا حەزکات ئەوە دەکەم- نەمرم دەبێ بڕۆم ئەوێ ببینم)لەمدیو مردنەوە:

مردن کۆتایی هاتنە بە ژیان، کۆتایهاتنیش بەژیان واتە وەستانی چالاکی. لەگەڵ مردندا ئیدی توانامان نامێنێت ئەو شتانە بکەین کە حەزمان دەکرد بیکەین، واتە مردن ڕێگری دەکات لەهەموو خەونو ئاواتو بەرنامەیەك کە مرۆڤ دایدەنێت، بەردەوام مرۆڤ کە ویستویەتی شتێبکات لە ئاییندەدا بیری لەوە کردۆتەوە گەر تەمەن بوار بدات یان گەر مردن بهێڵێت، واتە مردن ئەو دەسەلاتەیە کە دەتوانێت کۆتایی بەهەموو پرۆژەو ئاوات و ویستەکان بهێنێت. مرۆڤ بێدەسەلاتە لەبەرانبەر دەسەلاتی مردن. جگەلەوە کاتیش کراوەتە خاوەن دەسەلات چونکە مردن وەستانی کاتە بۆ کەسی مردوو. بۆیە

زۆرکات وەسیەت کراوەتە هۆکارێك بۆ ئەوەی ئەو خەون و ئاواتەی کەمرۆڤ هەیەتی پاش خۆی لەلایەن کەسانی دیەوە بۆی جێبەجێبکرێت. بۆیە وشەی (ئەگەر) بەهای خۆی هەیە، چونکە ئەگەری مانو نەمان لەبەردەم هەموو مرۆڤێکدایە، ناتوانین پرۆژەیەکمان هەبێت بۆ ئاییندەوبیر لە ئەگەر مردن نەکەینەوە، چونکە مردن تاکە شتێکە کە دەسەلاتی هێند هەیە کە دێت و خۆی دەسەپێنێت، واتە ئەوە ئەوە کە بیّ پرس و بیّ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە تۆ بەنیازی چیت، خۆی دەسەپێنێت، تۆش بێدەسەلاتی ناتوانی بەری پیّ بگریت. مردن ئەو هێزەیە کە ناتوانرێت بەری پیّ بگیرێت.

مرۆڤ هەمیشە دەیەوێت مردن ئەوکاتە بێت کە خۆی دەیەوێت نەك ئەوەی کە مردن خۆی دەیەوێت، هەرچەند مردن بێباکە لەوەی کە ئێمە ئەمانەوێت یان نا بەلام ئێمەش بەردەوام کۆلنادەینو ئاواتو خۆزگەمان هەیە بۆ ئاییندەی خۆمان دایکێك ئاواتی ئەوەیە (ئەو مندالانەم بچونایە سەر مالوحالی خۆیان ئەوکات بشمردمایە قەیناکە- ئۆخەیمە کرد). لەبەرئەوەی دایك هەمیشە مندالەکانی بەگرنگترین پاشماوەی خۆی دەزانێت بۆیە ژیانی خۆی بۆ تەرخان دەکات. رۆژی چەندجار خۆی دەکات بەقوربانو بەساقەی مندالەکانی.

- مردن خۆی نهێنی ئامێزە، هاوکات نهێنی پارێزو، نهێنی ئاشکراکەریشە:

- مردن- نهێنی(مەگەر گلّ لێم ببیستیّ- گلّ ئامازەیە بۆ مردن مەگەر بەمردن- لەگەلّ مردندا نهێنییەکانیش دەچنە ژێر خاك- هاورێیەتی گلکردن).

بەلگەنەویستە، کە مردن، رووداوێکە ناروونە، دیارنییە، کەی دەمریت. واتە بلانشۆ گوتەنی، رێکەوتە. مردن یەکێکە لەو ئەزموونانەی لەنێو رێکەوتدایە، واتە هەرکاتیّ بێت دەشیّ بەری بکەوین، بەرمان بکەوێت... رێکەوت واتە چاوەڕواننەکراو، بەلام مردن رێکەوتێکی تەواو چاوەڕواننەکراو

نییە. بەڵکو ڕێکەوتێکە دڵنیای لەم ژیانەدا هەر ڕێکەوتی دەکەیت بەڵام کەی؟؟؟

ئەم ڕێکەوتە جیاوازە لەو ڕێکەوتەی کە کەسێك دەبینی بە ڕێکەوت. ئەم ڕێکەوتە ناچارانەیە دەبێت هەر ڕێکەوتی بکەیت لەکات و شوێنێکی نادیارو چۆنیەتیەکی نادیاردا... مەرگ وەك پێشوتر باسمکردووە، ئەزموون دەکرێ بەڵام ئایا هەر ئەزموونێ نابێت توانای باسکردن و گوزارشتکردن برەخسێنێ؟ بەڵام ئەزموونی مردن ئەم هاوکێشەیە نایگرێتەوە، بەوەدەچێ بڕۆینە ناو میتافیزیکەوە گەر بڵێین پێدەچێ ئەم مردنە مردن نەبێ(بە مانا ئایینییەکە) بۆیە ناتوانین باسیبکەین. ئەمەی کە مەرگ ناکرێ بگێڕێتەوە وا لە مۆریس بلانشۆ دەکات بێژێت. ناکرێ مردن ئەزموون بکرێ. ڕێکەوتی مەرگ وادەکات بێتوانا بین لە پێشبینیکردنی مەرگ. بلانشۆ زۆر بەوردی کاری لەسەر ئەو ئەزموونانە کردووە کە ڕێکەوتین، دەڵێت جۆرێکی تایبەتی ئەزموونە کە تێیدا سیستمی هزری باو دووچاری لەرزین دەبێ، واتە چیتر ناتوانین بەو سیستمە هزریانەی کە ئەزموونەکانی پێ ڕاڤە دەکەین، مەرگ و ئەزموونە ڕێکەوتیەکان ڕاڤە بکەین. واتە ئێمە دەمرین بێ ئەوەی هیچ کاریگەریەك جێ بهێڵین، بلانشۆ دەڵێ گەر ڕێکەوت لەبەرچاو نەگرین مەرگ روونادات. ڕێکەوتیش هیچ نییە جگە لە نهێنی، واتە مەرگ نهێنییەکی پەتیە. هەر ئەمەش وادەکات مەرگ لە لۆژیکی هۆکارو ئەنجام دەربچێت.

سەبارەت بە ئەو دەربڕاوانەی سەرەوە، چەند شتێکەمان پێدەڵێن. مرۆڤ کاتێك بیەوێت متمانەی خۆی بۆ بەرانبەر دەربخات مردن دەهێنێتە ناو قسەکانییەوە، چونکە مردن کۆتایی بە هەموو شتێك دەهێنێت، واتە تا من زیندووم خۆم دەپارێزم، کە ئەمانەتەکەت (قسەکەت-کردەکەت...) بپارێزم، کە مردیشم ئیتر کۆتایی بەهەموو شتێك دێت، من دەستبەرداری ئەم ژیانە دەبم دەچمە ناو گڵ، دەبمە دۆستی گڵ مەگەر بۆ ئەوانی باسبکەم(مەگەر گڵ لێم ببیستێ). واتای سیمانتیکی پێماندەڵێت گڵ گوێی هەیە یان مرۆڤیش

قسه بۆ گڵ دەكات، یاخود دەشێ بڵێین مامەڵەكردنێكی بوونەوەرانەیە لەگەڵ گڵ وەك ئەوەی گڵ ببیستێت، وەك لە شیعرێكی حافزدا كە قسە لەگەڵ گڵ دەكات و پێی دەڵێت بۆ هێند بۆنت خۆشە، گڵ وەڵام دەداتەوە، كە زەمانێك هاوڕێیەتی گوڵی كردووە. بەڵام واتا پراگماتیكیەكەی ئەو واتایەی سەرەوەیە. هاوكات دەبێ ئەوەش بڵێم مرۆڤ كاتێك لەمردن نزیك دەبێتەوە یان هەستدەكات دەمرێت، هەوڵدەدات هەموو شتێك باسكات، ئەو نهێنیانەی لە ژیانیدا شاردویەتیەوە ئاشكرای كات تا هەست بە ئارامی بكات، یان ویژدانی ئارام بێت، چونكە ئەو نهێنییە ڕەنگە پێویست بێت بۆ مرۆڤەكانی كە دەژین، ئەمەش زۆربەی كات لە فیلم و ئەدەبو ...وەرمانگرتووە، هەرچەند گرانە ئەو دەوروبەرە وەربگیرێت، كە پێش مردن نهێنی تیا ئاشكرا دەكرێت. بەڵام ئەمەش پێماندەڵێت، كە مرۆڤ نایەوێت لەگەڵ مردنیشدا نهێنییەكانیش بمرێنێت، ئیدی بۆ ئاسوودەكردنی خۆی بێت یان بۆ پێویستی بێت، یان بۆ بێباكی بێت، كە ئیتر من دەمرم ئەم نهێنییە چی لێدەكەوێتەوە گرنگ نییە. واتە مردن دەشێ هەم نهێنیپارێز بێت هەم نهێنی ئاشكراكەر بێت چونكە دوا دەرفەتە، كە دەدرێت بەمرۆڤ، بۆیە هەندێ مرۆڤ هەوڵدەدەن ئەو دوا دەرفەتە بۆ ئاشكراكردنی نهێنییەكان دابنێین. هەیشە مردن دەكاتە هۆكارێك بۆ متمانە و پاراستنی نهێنی. كەشفكردن و ئاشكراكردنی نهێنیش لەو حاڵەتانەدا زۆر باوە كە ساڵ، مانگو ڕۆژی مردنی دۆستێك/ئازیزێك، دەبێتە هۆكار بۆ ئاشكراكردنی شتێك(ئەو ڕۆژەی ئەو لەدایكبوو فلان مرد)كاتێك نازانرێت كەی ئەو لەدایكبووە بەڵام بەهۆی مردنی ئەوەوە ورتر دەزانرێت كەی لەدایكبووە، ئەمە بۆ چەندین كەشفكردنی تر دەبێت، خاڵێكی سەرەكی، كە بۆ ئەم كەشفكردنە دەبێت ئەوەیە مردن كەمتر بیردەچێتەوە دەشێ خۆشیەكانمان بیر بچێتەوە بەئاسانی بەڵام ناخۆشیەكان بیرناچنەوە (ئەم جۆرە بەڵگەیەكە).

- ئەم گۆرە کەسی تێدا نییە: ئەمە پەندێکە- ئەم ماڵە کەسی تێدا نییە- واتە ماڵێك ئاوەدانی تێدا نەبێت گۆڕستانە- ماڵەکان گۆڕستانن چونکە دواجار هەمومان دەمرین- هەندێك جاریش گۆڕیان لەماڵ هەڵکەندووە). ماڵێك کە بێدەنگ بێت ئیدی وەك گۆڕستان وایە، ماڵ بە دەنگو هەرای منداڵەوە ماڵە، چونکە ئەوان زیندوویەتی ماڵ نیشاندەدەن. واتە مرۆڤ لەم ژیانەدا کە دەژی لەناو ماڵدا دەژی، کە دەشمرێت دەچێتەوە ناو ماڵێکی تر کە(گۆڕ)ە. خۆ دەشبێ وەك زیکرو یادی خوا داینێن کە هەر ماڵێك زیکرو یادی خوای تیا نەکرێت گۆڕستانە، کەئەمەش زیاتر دیدێکی ئایینییە.

- خوا لەمنت نەسێنێ(خوا لێدەسەنێت):

خوانەکات تۆ بمریتو من بێ تۆ بم، من ناتوانم بێ تۆ بژیم، تۆی بەخۆشەویستیت ژیانی منت ڕامکردووە، بوونی تۆ پاڵپشتێکی گەورەیە بۆ ژیانم، یاخود تۆ لەمن نەسێنێت، واتە تۆ هی منی(بەلام زۆرکەم واتای کۆیلەیەتی تیایە، بەڵکو لایەنی سۆزداری تیایە). یان دەوترێت. خوا لە یەکیان نەکات (دوعایە-تکایە- خوا دەتوانێت لەیەکیان بکات یان خوایە ئەیان پارێزێ. واتە خوایە هەر بەیەکەوە بنو جیا نەبنەوە)، یان کەسیان نەمرێنێت.(واتە ئێستا ئەو دوانە بوونە یەك، خوایە هەر بەیەکی بیانهێڵەوە مەهێڵە ببنەوە بەدوان(زەواج- بوون بەیەکە نەك بوون بەدوان- لەدەستدانی خودیەتیە). خوا خاوەنی دەسەلاتە مرۆڤەکانیش نزا دەکەن بۆ ئەوەی کە ئاواتو مرازەکانیان بێتە دی، بەلام هەندێ داوا هەیە کە نەکردەیە هەرچەند مرۆڤ خۆشی دەزانێت کە هەر دەمرێت(مردن حەقە) بەلام نزای مانەوە دەکات. هەروەك بە زانستی خوا(لەئایینی ئیسلامدا) کاتی مردن پێشتر دیاریکراوە.

- مردن- سوێند(تو گۆڕی مردووت وازبێنە- تو گۆڕی شەهیدان وازبێنە- بەپێی قورئان شەهید نەمردووە تا سوێندی پێ بخورێت و لە

قورئاندا ئەمە حەرامە–شیرك) وەك لە بەشی یەكەمدا باسمكرد(مردن لە ئەفسانە) مردن پیرۆزكراوە، چونكە مرۆڤە زیندووەكان خەویان بە مردووەكانەوە بینیوە و زانیویانە كە ئەوان نەمردوون، هاوكات كاتێك كەسێك تاوانێكی بەرانبەر بەكەسی مردوو كردبێت ترساوە لەوەی تۆڵەی لێبكاتەوە، هەروەك قوربانی بۆ مردووەكان كراوە، بەواتایەكی بەچاوێكی پیرۆزەوە لە مردوویان ڕوانیوە ، لەم سەردەمەشدا ئایینی ئیسلام بەردەوام هەوڵیداوە كە ئەم پیرۆزكردنی مردووە نەهێڵێت و بەكوفری دانێت، بەواتایەكی تر لەئایینی ئیسلامدا هەوڵدراوە لەلایەكی ترەوە مردن بەهادار بكرێت. بەڵام بەتەواوەتی نەیتوانیوە ئەوە بكات كە ئەم سوێندخواردنە بەمردوو بنەبڕبكات. چونكە كاتێك دایكێك كوڕەكەی دمرێت ئیدی جگە لەپیرۆزكردنی كوڕەكەی هیچی تری بۆ ناكرێت چونكە هێندە ڕۆڵەكەی خۆشدەوێت ئامادەیە پیرۆزیبكات، بۆیە گەر بڵێیت تو گۆڕی جوانەمەرگ ئەوە بكە یان مەكە ناتوانێت گوێڕایەڵ نەبێت. واتە كەسی مردوو، پاش مردنی لەلایەن زیندووانەوە بەهای زۆری دەدرێتێ، زیاتر لە مرۆڤە زیندووەكان چونكە، گەر لەویادا بڵێت لەبەر خاتری فلان كەسی زیندوو لەو بڕوایەدام گوێڕایەڵی نەكرێت. هاوكات بەپێی بیروباوەڕی كەسەكە دەگۆڕێت دەشێت كەسێكی زۆر دیندار بەهیچ شێوەیەك ئەم سوێندە نەخوات و گوێڕایەڵیشی نەبێت، دەشێ كەسێكی تری كەم باوەڕ بەئایین، یان بێباوەڕ سوێندخواردن و بەهای شەهیدو كەسی مردوی لا بەهادارتربێت لە خوا.

- ئەوە مردووە كە لە بیر دەچێتەوە(ئەوەی لە یادو بیردا مابێ نەمردووە– ئەمە گشتیە– دەشێ باش و خراپ بگرێتەوە– سوودی تیایە بەوەی كە ئەوەی مردووە و كەسێكی باشە چاولێكەری هەبێت وە گەر خراپە ببێتە عیبرەت بۆ هەموان لە پاش خۆی). بەواتایەكی تر مردوو نامرێت تا ئەوكاتەی زیندووەكان یادی دەكەنەوە، چونكە بەهای مردوو لای زیندووەكان

زۆره، هاوکات کەسی زیندووش لە ژیاندا بەردەوام کار دەکات بۆ پاش مردنی، بۆ نموونە دەڵێ با کە مردم ڕەحمەوبووم بکەن.

بەواتایەکی تر کەسی زیندوو بۆچی بەژداری پرسەکان دەکات، سەردانی نەخۆش دەکات، چەندین جار گوێمان لێبووە باسی قەرەباڵغی پرسەی کەسەکان کراوە، یان بەپێچەوانەوە، هەمیشە ئاوات بۆ ئەو پرسانە خوراوە لەلایەن زیندووەکانەوە کە پرسەی ئەوانیش وا قەرەباڵغ بێت، واتە بۆ ئەوە دەچین بۆ پرسەکان تا ئەوانیش بێن بۆ پرسەکەمان، واتە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەداین کە پاش مردن کە لێرە نابین بەس هەوڵبدەین لای زیندووەکان زیندوو بین، چەندین جار لە هەواڵی بڵاوکراوەکاندا ئەوەمان وەرگرتوە کە بە ئامادەبوونی هەزاران کەس فلان بەخاکسپێردرا. بەواتایەکی تر مرۆڤ هەمیشە خەونی گەران بەدوای نەمریدا لە یادناکات. یاخود مرۆڤەکان بەشێوەی جیاواز لەژیاندا کۆشش دەکات بۆ بەجێهێشتنی شتێك(بەرهەمێك) یان دەوترێت(جێدەستی دیار بێت لەژیاندا– بەردێك بخاتە سەربەردێك)تا لەپاشخۆیان ئەو کارەیان بۆ بمێنێتەوە. بەپێی بیروباوەڕی مرۆڤەکان ئەم هەوڵە ئامانجەکەی دەگۆڕێت، مرۆڤێکی موسڵمان دەشێ بۆ وەرگرتنی پاداشت بێت لای خوای گەورە، مرۆڤێکی دوور لەدینیش دەشێ بۆ خزمەتی مرۆڤومرۆڤایەتی بێت، هەشە بۆ ناووناوبانگە، یان خۆشەویستی کەسێك یان شتێك ئەوەی پێدەکات.

- قسەت خۆشبووە نەمری(قسەت خۆش بووە دەترسم بمریت):

ئەم دەربڕاوە زیاتر بۆ خۆشیو پێکەنین دەوترێت، یان بەخۆشیەوە بە کەسێك دەوترێت کاتێك کەسێك بیەوێت کەسی بەرانبەر بهێنێتە پێکەنین، کەسی بەرانبەر ئەمەی پێگوتوە. دیارە ئەویش بۆ هەمان مەبەست ئەمەی پێگوتوە، خۆ دەشبێ وەك قسەیەکی ڕەق بگوترێت کاتێك کەسی بەرانبەر داوای شتێ بکات لەکەسی بەرانبەر، بەڵام ئەو شتەی داوای دەکات بە

ئەندازەیەك زۆرە یان نەگونجاوە كە ئەو گاڵتەی پێدەكات، بەڵام گاڵتە پێكردنێك پڕ لە بایەخدان(ئەیەوێ بەم جۆرە پێی بڵێ ئەوەی تۆ داوای دەكەیت نەگونجاوە). یان دەشێ بەمنداڵێك بگوترێت كە تازە فێری قسەكردن دەبێت. بەڵام ئەوەش بڵێین مرۆڤەكان زۆركات كە كەسێكیان دەمرێت پاش مردنی ئەوجا دەكەونە باسكردنی (پێش چەند ڕۆژ بینیم قسەی خۆشی دەكرد...) بەواتایەكی تر زۆركات پاش مردنی كەسێك كە گەنجە بەتایبەت دەوترێت كەپێش مردنی وایدەكرد یان دەوترێت ئەم ماوەیە هەر پێكەنیوە یان هەر غەمبار بووە، دایكەكەی دەڵێت من هەر دەمزانی شتێكی لێ بەسەر دێت، واتە ئەو كردانەی پێشو دەركەوتەی مەرگی كوڕەكەی بووە، بەواتایەكی تر ئەم دەربڕاوە ئاواز بەشێوەیەكی گشتی بۆ گاڵتە یان تووڕە بوون یان هەرشتێكی تر ڕۆڵی زۆر دەبینێت. هاوكات واتای سیمانتیكی واتایەكی تەواو جیاواز دەدات لەوەی كە ئێمە دامان، واتاكەی نەمرییە، واتە كەسێكی قسە خۆش هەیە، نەمردنی دەخوازرێ. بوونی ترس لەمردن هۆكاری زۆرە بەڵام ئێمە كەمتر لەسەر ئەمە قسەدەكەین لەبەرئەوەی بەتایبەت لەسەر ئەمە كارمنەكردووە، بەڵام یەكێك لەهۆكارە گرنگەكان، كەسی مردوو زۆرینەی كات بەتەنیا سەفەر دەكات، مرۆڤەكان لێرەن بەگشتی ئەو بەتەنیا ڕێگەیەكی پێگیراوەتە بەر، واتە بێ خواستی خۆی دەڕوات، تەواو دڵنیا نییە بۆ كوێ دەڕوات، كەسێك نییە لەگەڵی بێت(هەربۆیە زۆركات وەسیەت دەكرێت گۆڕی مردووە نزیكەكان لەتەك یەكتر بێت). مرۆڤ نازانێت كەی دەمرێت تا خۆی حازركات (سەفەرێكە پرست پێناكرێت و دەبێت هەر بیشیكەیت، ناشزانیت كەی كاتی سەفەرەو تەواو دڵنیاش نیت بۆ كوێ دەچیت و چیت لێبەسەر دێت...) ئەمانە هەمووی هۆكارن بۆ ترس لەمەرگ، چون نەزانینێكی تارادەیەك ڕەها هەیە، بەڕووكەش دەزانیت چیت لێدێت، بەڵام ئەوەی بە قووڵی و ڕەهای نەگەیشتبێتە ئەوەی مردن چییەو چی

ڕوئەدات پاش مردن، ئەوا ئەگەری ترسان لەمردن لەم کەسانەدا زۆرە کە زۆرینەش پێکدێنن.

- شەیتان دەست لە مردوو هەڵدەگرێت تۆ دەستی لێهەڵناگریت:

(واتە خراپە- شەیتان، وازدەهێنێت لەوەی کە مرد، بەڵام تۆ ئەی لە شەیتان شەیتانتر وازلێنـاهێنی - لەناو گۆڕەکەشدا ناهێڵیت بحەوێتەوە- مردن= حەوانەوە). بەواتایەکی تر مرۆڤ بە مردن ئاسوودە دەبێت. بەواتایەکی تر شەیتان دەسەڵاتی هەیە بەسەر مرۆڤدا (وەیەکەم مرۆڤ کە هەڵخەڵەتێنرا لەلایەن شەیتانەوەبوو و شەیتان بەپێی ئایینی ئیسلام بەڵێنی داوە دەست لەمرۆڤی زیندوو هەڵناگرێت تا مردنی، واتە دەشێ لەسەرە مەرگیشدا خراپەی پێبکات). ئەم کەسە کە شەیتانانە مامەڵە دەکات، یان دەمانەوێ وەك شەیتان نەبێت بۆیە واپێدەڵێین تا بەئاگا بێتەوە لەوەی ئیدی باسی کەسی مردوو نەکات. دەشێ ئەو کەسەی کە باسدەکرێت یان زەمی دەکرێت کەسێکی خۆشەویست نەبێت لای ئەو کەسەی باسی دەکات، بەڵام لای کەسی بەرانبەر خۆشەویست بێت یان هیچی بەرانبەری نەبێت، بۆیە ئەمە دەڵێت تا کەسی قسەکەر بێدەنگ بکات، ئەم وتنەش توندە بەڵام شێوازی وتنەکەی وە ئەو کەسەی کە دەیڵێ و بەکێی دەڵێت، دۆخی وتنەکەی دەگۆڕێت.

- جوانەمەرگ: بۆچی جوانە مەرگ بەکاردێت بەڵام پیرەمەرگ بەکارنایەت؟ لەبەرئەوەی کە شتێکی شازە جوانو مەرگ پێکەوە بێن، بەواتایەکی تر پیر دۆستی مەرگە لەمەرگەوە نزیکە، شتێکی ناوازە نییە گەر پیرێك بمرێت بەڵام گەنجو مەرگ ناوازەیە بەیەکەوە بێن، بۆیە نەدەبوو جوان و مەرگ پێکەوە بێن کە دێن ئەوا حاڵەتێکی نائاساییو ئازاردەر دروستدەکات. هەروەك دەگوترێت. کاتی مردنی نەبوو (هێشتا گەنجبوو)

لەبەرئەوەی کە جوان هێمایە بۆ گەنج(لاو) واتە کەسێك مردووە گەنج بووە، لەبەردڵان شیرین بووە، کەسێك لەسەرەتای ژیاندابووە مردووە، (ئەمە

ئەسەفی زۆرە). واتە کاتێك گەنجێك دەمرێت ئازاری زۆرترە بۆ زیندووەکان تا پیرەکان، چونکە پیرەکان بەشی خۆیان ژیاون بەس لاوەکان پێویستیان بەژیانە. ئەوەی جوانە مەرگ دەوترێت بەلام پیرە مەرگ ناوترێت چونکە ئەوەی جوانە گەنجە، نەك بەتەمەن. لەبەرئەوەی شێوەی ژیان بەمجۆرەیە(لەگەنجی بۆ پیری لە پیری بۆ مردن) واتە مردنی گەنج باو نییە(ئەوکات نەبووە بەلام ئێستا ناتوانین ئەو بڕیارە بدەین چون ڕۆژانە گەنج دەمرێت)، ناکرێت گەنج بمرێت چونکە مردن و گەنجێتی نەشیاوە مرۆڤ لە پیریدا دەمرێت، مەگەر ڕووداوێك ڕوویدابێت بۆیە چاوەڕواننەکراوە کە گەنجێك لەخۆوە بمرێت بێئەوەی ڕووداوێك ڕوویدابێت، شین و شەپۆریش زیاتر بۆ گەنج دەکرێت تا پیر. چونکە دەگوترێت کاتی مردنی نەهاتووە، هەرچەند ئەمە بەپێی ئایین نەشیاوە چونکە خوا کاتی بۆ هەموو مرۆڤەکان داناوە وە خۆی باشتر زانینی هەیە بەشتەکان، کێ نالێ خێر بەمردنەکەیەوە نییە.

- نەخۆشەکە مرد:

نەخۆشیش دەسەلاتێکە ناتوانین نەخۆشنەکەوین(ئەم جەلدەیە کە لێت دەدات هەلت ناسێنێتەوە(هەلنەسانەوە- کەوتن) ئەم سەرەتانە هەرچی تووش دەبێ دەیکوژێت (نەخۆشی سەرەتان). بەواتایەکی تر مرۆڤ ناتوانێت نەخۆش نەکەوێت بەتایبە بەتەمەنەکان و نەخۆشیش مرۆڤ دەستەمۆدەکات، لەوەی بتەوێت بەسەریدا زالبیت بەتەواوی. جگەلەوە شتەکانیش دەسەلاتیان هەیە بمانکوژن (تەقینەوەی غاز). یاخود نەخۆشیەکان. نموونەکەی سەرەوە دەشێ وەك هەوالێدان بگوترێت.

- لە مردن گەڕایەوە (ئەوەندەی نەمابوو بمرێت)

واتای سیمانتیکی واتێدەگەین کە مردن شوێنێکەو کەسێك لەوێوە گەڕاوەتەوە بەبێ ئەوەی بزانین بۆ کوێ گەڕاوەتەوە، بەلام دەشێ دۆنادۆن ڕۆلی هەبوبێت لەم دەربڕاوەدا بەبێ ئەوەی ئێستا بتوانین بیسەلمێنین

لەرووی ئیتمۆلۆژیەوە، بەڵکو تەنیا لەرووی واتاوە، دیارە واتای سیمانتیکیش پێوەر نییە، چونکە ئەمە کە دەگوترێت زیاتر بەمەبەستی پراگماتیکی دەترێت. کەکەسێك لەڕووداوێکدا کە ئەگەری مردن نزیکبووە یان دەشێ لەکەسانی نزیکی ئەو لەو ڕووداوەدا مردبن ئەمی تیا دەرچوبێت(واتای دەرچوون– ڕزگاربوون لەمردن).مرۆڤ لە ژیاندا زۆرکات لەو ڕووداوانەی توشی دێن لە مردن نزیك دەبێتەوە چونکە ژیانمان لەناو مردندایە ڕۆژانە بەبەرچاومانەوە مرۆڤەکان دەمرن، لەڕووداوی جۆراوجۆردا. بۆیە نزیکی مردن لێمانەوە وادەکات هەمیشە لەزماندا نیشتەجێ بێت لەو دۆخانەدا کە ناهەموارە مردن بێتە سەر زمانمان. بۆیە نزیکبوونەوە لەمردن هەیە، بەلام نەجاتبوون(گەرانەوە) لەمردن نییە، مەگەر لەحاڵەتی دۆنادۆن، یان لای سۆفیەکان. بەلام مرۆڤ هەمیشە هەوڵدەدات ئەزموونی ئەو شتانە بکات کە ئەزموونی نەن، واتە ئەرستۆیانە بڵێین مرۆڤ حەزی زانینی هەیە، ئەزموونیش ڕێگەیەکە بۆ زانین، بەلام کاتێك مردن ئەزموونێکە گەڕانەوەی نییە، واتە کە مردن ڕوئەدات ئیدی ناتوانیت بێیتەوە لەسەر ئەو ئەزموونەی خۆت قسەبکەت، واتە ئەوکاتەی من دەمرم ئیدی من نیم، تا بتوانم لەبارەی ئەم ئەزموونەوە قسە بکەم، بۆیە ئەزموونێکە دەتوانین ناوی بنێین ئەزموونێك بۆ کۆتاییهێنان بەئەزموونەکان(ئیدی بەپێی ئاین ئەمە جیاوازە)، بەلام بەهۆی ئەم حاڵەتە ناچاریەوە مرۆڤ بەردەوام هەوڵدەدات ئەم ئەزموونە شارە، ئەنجامبدات دەستی بەسەردا بگرێت، ئەم وشەیە بۆ چەندین حاڵەتی جیاواز بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی برێك لەو نهێنییە ئاشکرا بکات، (ناوی یاریەکان/ دیواری مەرگ– مردوو بەرزکردنەوە بەچوار پەنجە...) [٦١] ئەمانە ناوی یارین، کە دەیکەینە نموونە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەم یاریەدا هەرچەند زیرە/ ئەتۆقێ، بەلام جێژی لێوەردەگرێ، هەر ئەیکا، واتە هەر ئەزموونی دەکات، چەند ترسناك بێت دواجار دەیەوێت تاقیبکاتەوە، واتە مرۆڤ بۆچی ناوی مردن دەداتە پاڵ ئەم هەموو شتانە، من پێموایە نەناسینی مردن هۆکارە، دەیەوێ لەم ڕێگەیەوە کەمێ لەمردن نزیك بکەوێتەوە، جگەلەوەی خاسیەتە

دەرەکیـەکانی مـردن هۆکـاری ئـەم ناونانەیـە. بۆیـە مـردن بریتییـە لـەو ئەزموونەی ناگێڕێتەوە.

- خوانەتکوژێ:

خوا نەتکوژێ قسەی وادەکەیت(ئاواز ڕۆڵـی هەیـە، پێکـەنینێك هەیـە لـە کۆتایی دەربڕاوەکەدا-ڕەگەزی مێ زیـاتر بەکاریـدێنێ). خـوا دەکـوژێ، خـوا دەتوانێت بکوژێت، دەسەڵاتی ئەوەی هەیە، خوانەتکوژێت واتە خوا بتهێڵێت، زۆرکات لە دەمەتەقێی ژناندا کاتێك یەکێك قسەی خۆش دەکـات، یـان باسـی یـەکێك دەکـەن، ئەوکەسـەی باسـی کەسـەکە دەکـات، زۆردەزانێـت، بەکورتیەکـەی ئـەم دەربـڕاوە لەزۆرکاتـدا لـەباتی بڵێـت زۆرزان، دەڵێـت خوانەتکوژێ شـتی وا دەڵێیـت (شـتی وانـەزانیت-باسـکردنی شـتگەلێکە کـە سەرسامی وە پێکەنینهێنەرە چونکە باسەکە بەدڵی گوێگرە). ئەم دەربـڕاوە دەڵێ خوا تۆ نـەکوژێ لەبەرئـەوەی تـۆ قسـەی بـەتام‌وخۆش دەکـەیت، یـان زانیاری سەیرت لایە، واتە بوونی تۆ بـۆ مـن باشـە بۆیـە مانـەوەت باشـە تکـا دەکەم بمێنیتەوە، بەڵام تکایەك نییە کە شوێنەکە زیـاتر مەبەسـتی نزاکـردن لەخۆبگرێت هێنـدە هانـدانی بەرانبـەرە بـۆ زیـاتر بـەردەوامبوون لەسـەر ئـەو ئاوازی گوتنە.

- خوا لەمنت بسێنێ-لـەناوت بـەرێ-لەکۆڵکردنـەوە-ڕزگاربوون(کـەی ڕزگارم دەبێ لەدەستت)-نەجاتدان...

ئەم دەربڕاوانەی سەرەوە، چەندین دەربڕاوی تـر هـەن بەهـەمان ئـاوازو واتا دەگوترێن، واتای گشت ئەو دەربڕاوانە، داواکردنێکە یـان نزاکردنێکـە بـۆ مردنی یان لەناوبردنی کەسێك یـان دەسـەڵاتێك، کـە دەشـێ ئـەو دەسـەڵاتە دەسەڵاتی کەسێك بێت یان دیکتاتۆرێك، هاوکات جیاوازیـان زۆرە بـۆ نموونـە (خوا لەمنت بسێنی) بەپێی دەوروبەری جیاواز واتای جیاوازی هەیـە، لێـرەدا داوا لەخواکراوە ئەو کەسەی هۆکارە بۆ ئازاردان لەناوی بـەرێت، جگەلـەوەی دەشێ واتای سیمانتیکی مەبەست مردنی (تۆ)بێت، واتە تۆ لەمن بسێنی، تـۆ

هی منی ، بەڵام من دەمەوێت تۆ هی من نەمێنیت چونکە تۆ هۆکاری بۆ ئازاردانی من، واتای سیمانتیکی مردنی تۆ دەگرێتەوە، بەڵام واتای پراگماتیکی جیاوازە، چونکە دەشێ وەك دۆخی پەستی یان تووڕەی دایکێك ببینین، دایکێك لە کورەکەی یان کچەکەی تورە دەبێت دەڵێت خوا لەمنت بسێنێ، دیارە ئەو دایکە مردنی نەوەکەی خۆشحاڵی ناکات وەك لەداواکەی هاتووە، بەڵام ڕاهاتنی زمانی، یان وەك گلەیکردنێك یان بێدەسەڵاتی خۆی ئەمە دەردەبڕێت، دەنا هەرگیز خۆشنوود نییە بە مردنی نەوەکەی، کە واتای سیمانتیکی پێمانی دەدات. هەروەك چۆن بۆ هەڕەشەکردنی دایك بەمنداڵەکەی دەڵێت (ئەوە بکەیت دەتکوژم)، کە لێرەدا واتای پراگماتیکی مەبەستە نەك واتای سیمانتیکی دەنا دایك ناتوانێت ڕۆڵەکەی خۆی بکوژێت. بۆ لەناوبردنیش، مەبەست لێی نەهێشتنە، با تۆ نەمێنی یاخوا تۆ نەمێنی، چون مانی تۆ ژیانی منی تێکداوە، یان ژیانمانی تێکداوە. لە کۆڵکردنەوەش مەبەست لێی شتێکە یان کەسێکە کە وازناهێنێ بەردەوام جێگەی نارەحەتیو ئازارە، ئاسوودەی تێکدەدات، بۆ گەڕانەوەی ئاسوودەیی دەبێت ئەو نەمێنێ(دەشێ مەبەست مردنیش نەبێت). ڕزگاربوونو نەجاتبوون، واتاکەیان ئەوەیە کە بوونی ئەوان هۆکارە بۆ ئەوەی کە ژیانمان پڕ دەردیسەر بێت، بۆ ئەوەی لەو ناخۆشیو ئازارە دەرچین، دەبێ لەدەست ئەوان(ئەو) ڕزگارمان بێت، ئیدی بە خۆشاردنەوەی ئێمە بێت یان بە نەمانی ئەو.

دەشێ هەموو ئەو دەربڕاوانە تەنیا وتنێکی سەرزاری یان هەست دەربڕینێك بێت لەچوارچێوەی وتندا نەك کرداردا کە ئەوەی دەیڵێت بە کردنیشی خۆشحاڵبێت. بەڵام ئەو وتنانە زۆرکات کاریگەری لەسەر پەروەردەو بیرکرنەوەو دنیابینیمان جێدەهێڵن هەتا بە شێوەیەکی بەرتەسکیش بێت. ئاسانی کوشتن لای ئێمە بۆ بچووکترین هەڕەشەکردن

لەمندالْ دەگوترێت ئەوە بکەیت دەتکوژم، منداڵی کورد تێگەیشتووە یان ڕاهاتووە کە ئەمە واتای پراگماتیکیە دەنا بەوتنی ئەمە خەوی لێنەدەکەوت لەترسدا(هاوڕێیەکم منداڵێکی هەیە لەهۆڵەندا لەدایکبووە واتە پەروەردەی هۆڵەندی کراوە بەلآم بۆی گێڕامەوە کە هاتونەتەوە لەگەڵ منداڵی خوشکەکەی گەمەیان کردووە پوری پێی گوتوە ئەتکوژم دەستکاری ئەوە بکەیت، هاوڕێکەم وتی شەو خەوی لێنەدەکەوت و هەردەیوت دەمکوژن) لەبەرئەوەی منداڵی ئەو هاوڕێیەم نازانێت کوشتن بە واتا پراگماتیکیەکە بەکارهێنراوە بۆیە ناتوانێت بخەوێت، بەلآم منداڵە کوردەکە تێدەگاتە کە واتای پراگماتیکی ئەو دەربڕاوە چییە، بۆیە ڕۆژی چەندجار ئەمەی پێدەگوترێت. لەبەرئەوە دەشێ ئەم دەربڕاوە کاریگەری لەسەر پەروەردەمان دانێت، هەرچەند زۆر لاوازیش بێت بەلآم شایەنی باسکردنە تا وتنی ئەم دەربڕاوانە لەنەریت بکەوێت، چونکە هەستدەکرێت ئاسانی کوشتن بەگەورەییش تیاماندا کارایە، دەشێ یەکێك لەهۆکارەکان ئەمەبێت!

- مردن لای مێ(دایکت مرێ- بەقوربانبم...)

لای دایکی کورد هەمیشە خۆ کردنە قوربانی بینراوە بۆ منداڵ، واتە دایك کە نەوەیەك دەخاتەوە ئیدی بۆ ئەو نەوەیەی دەژی، ئامادەیە خۆی بکات بە قوربانی، هەربۆیە کاتێك بچوکترین ئازار بەر نەوەکەی دەکەوێت خۆی دەکات بەقوربانی، هیواخوازە کە خۆی ئەو ئازارەی بەرکەوتایە نەك نەوەکەی، بۆ نموونە منداڵەکەی دڕکێك دەچێت بەپێیدا دەگری، دەڵێ، دایکت مرێ ئەوە چیبووە، یاخوا دایکت مرێ(دیارە مرێ مەبەست "بمرێ"یە، واتە دایکی کورد منداڵەکەی هێند لا شیرینە کە هەمیشە ئامادەیی تیایە خۆی شتێکی لێبێ ئەو لێی نەیەت، بۆیە خۆی دەکاتە قوربانی، چونکە بەشایەنی ئەوەی دەزانێت یان هێندە خۆشیەوێت کە خۆی بکاتە قوربانی بۆی، هەرچەند ئەمانە زیاتر سەرزارەکیە بەلآم نموونەی

خۆکردنە قوربانی دایك بۆ منداڵ کەمنییە. گەر سەرنج بدەین خۆکردنە قوربانی شتێکی باوە لەناو ئێمەی کورددا تەنانەت لەوەڵامدانەوەی سڵاوکردنیشدا، یان سەرم لە ڕێتە، دەیکەم بەقوربانت(کاتێك دوو منداڵی هاوسێ شەردەکەن بۆ ڕازیکردنی هاوسێکەی). واتە ئاسانی خۆ کردنە یان کردنە قوربانی زۆر باش دەبینرێت، هاوکات نموونەکەی سەرەوە ئاسانی کوشتن دەبینرێت(گەر بەراوردی کوشتن‌و توانای کوشتن‌و خۆکردنە قوربانی بکەین) چیمان دەستدەکەوێت؟ بەرچاوترین شت کە دەستماندەکەوێت بێبەهایی ژیانە. جگەلەوەی کە دەشێ ئاکارو بەرپرسیاریەتیشی تیا ببینرێت بەرانبەر بەیەکدی.

- دنیا سێ و دوو ڕۆژێکە: دنیا(ژیان) بۆ فلان (سوڵتان)...نەما.

لەم دەربڕاوەدا ژیان‌و دنیا وەك یەك دانراون، هاوکات ماوە کورتی ژیان ڕەچاوکراوە، کە زیاتر ڕیشەکەی بۆ ئایین دەگەڕێتەوە لەوەی کەژیانی ئەو دنیا(دنیاکەی تر هەر ڕۆژێکی چەند ئەوەنەی ژیانی ئەم دنیایەیە). ئەمە دەگوترێت وەك ئامۆژگاری یان تانەدان، لەوەی کە دڵ بەم ژیانە زۆر خۆشنەکرێت ئەم دنیایە بێ وەفایەو بۆ کەس نامێنێ دەبێ کۆشش بکرێت بۆ دنیاکەی تر، کەئەمانە نەگوتراوەکانی پشت ئەم گوتراوەن، پەیوەندی کات‌و مردن زۆر بەروونی دەردەکەوێت لێرەدا. هاوکات دنیا بۆ فلان نەما، جۆرە دەربڕاوێکە کە دنیا بۆ هیچ کەسێك نامێنێت، واتە مردن بەیەکچاو سەیری هەموومان دەکات، هەموومان دەبات، کەسمان نییە لێی هەڵێت. وەك پەندو وانەیەك زۆرکات ئەمە دەگوترێت، کە زوڵم و قووڵبڕین، کاری خراپ مەکەن، چونکە دنیا بۆ کەس نامێنێت، وە واباشە کە ناوت بەباشە بڕوات نەك بەخراپە.

- تا مردن لەبیرت ناکەم:(تا بمێنم ئەم چاکەیەتم لەبیر ناچێت).

مردن هۆکارە بۆ ئەوەی کە ئیدی شتەکانم لەبیربچنەوە و ئەوەی پێویستیشە بۆ ئەوەی من سیفەتی بێسفەتیم نەدرێتە پاڵ ئەوەیە تا مردن

که تۆچاکەو کردووە لەگەڵم من لەیادی نەکەم. یان کەسێکت خۆشویستوە، خۆشەویستیەکەی هێند بەهێزە کە چووەتە بیرگەی درێژخایەنەوە لەیاد ناچێتەوە. هاوکات دەشێ وەك جۆرێك لە خولقو مجامەلە بەکاربهێنرێت لەبەرانبەر کەسی بەرانبەردا. واتە من کەسێکی بەوەفام، یان من کەسێکم تۆم خۆشدەوێت. زۆرکات تا مردن ئەوەم بیرناچێتەوە دەگوترێت دەشێ کارێکی باشکرابێت بەرانبەر کەسەکە یان بەپێچەوانەوە، چونکە زۆر کاریگەری هەبووە لەسەر ژیانی بۆیە بیری ناچێتەوە مەگەر مردن بیری بباتەوە.

- مەگەر بمکوژیت ئەو چاکەیەت بدەمەوە(چاکەکەت هێندە بەهای هەیە بە ئەندازەی ژیانم)

بمکوژیت(تۆ من بکوژیت)، ئەم کەسە کە ئەمە دەڵێت مەبەستیەتی پێی بڵێت ژیانم بۆ تۆیە تۆ دەتوانیت چی لەژیانم بکەیت، تۆ دەتوانیت ژیانی من هەڵسورێنیت بڕیار لەژیانی من بدەیت، چونکە تۆ کارێکی وەها بەهادارت بەرانبەر بەمن کردووە دڵنیام کە کاری خراپ لە تۆ ناوەشێتەوە بۆیە ژیانیشمت بدەمێ بەخەیاڵما نایەت چونکە دەزانم تۆ کەسێکی باشیت. هاوکات خۆ کردنە قوربانی تیایە، لەهەندێ دۆخیشدا دەوترێت مەگەر بتکوژم ئەو چاکەیت بدەمەوە. (من تۆ بکوژم) لێرەدا کوشتن وەك کارێکی باشە دانراوە، بەڵام دەشێ مەبەست کوشتن بێت وەك ڕزگارکردن. چونکە من دەستم ناچێتە خوێنی تۆ بەڵام گەر ئەوە بکەم ئەوە بۆ ڕزگارکردنی تۆیە(هەروەك ئەمە ناکرێت لەواتای سیمانتیکیەوە واتاکەی بخوێنینەوە). بەڵام ئەمە لەکاتێکدا دەوترێت کە کەسێك کارێکی باش بەرانبەر بەکەسەکە دەکات. وتنی ئەمەش وەك پێدانی پاداشتە.

- مەگەر من بمرم بهێڵم ئەوە ڕووبدات- مەگەر من مردووم وەلامی کەسێك کە دەیەوێ کارێ بکات ئەوکارە بەدڵی کەسەکە نییە دەڵێ مەگەر من نەمێنم ئەوە ڕوبدات- مەگەر بەسەر لاشەی مندا بڕۆیت- واتە ئەوە مردنی

منه تۆ ئازاد دەكات لەوەی ئەو كارە بكەیت، ئەو كارە كە من بێزار دەكات، یان كارێكی خراپە(بەدیدی ئەو خراپە- چونكە كارەكە دەوروبەر دیاریدەكات چییە)، ئەوا من نارازیم بیكەیت و رێگە نادەم ئەو كارە بكەیت، خۆ من نەمردووم تا ئەو كارە بكەیت، كردنی ئەو كارە پەیوەستە بە مانەوەی من، واتە نكوڵیكردنێكی رەها بۆ كردنی ئەو كارە لەلایەن كەسی بەرانبەرەوە كەپێداگری دەكات بیكات، ئەمیش زیاتر لەو پێداگری دەكات بەرادەی ژیانی پێداگری دەكات لەنەكردنی كارەكە.

- كوێر تا دەمرێ بەنیازی دوچاوی ساغە:

(جۆرە پەیامێكە، مەبەستی ئەوەیە كە تا مردن لە كۆششكردن مەكەون بۆ هێنانە دی ئامانجەكان، یان ئەوە مردنە كە كۆتایی بە هەموو شتێك دێنێت دەنا هەتا لەژیاندا بیت دەبێت كۆشش بكەیت لەپێناو هیواوو ئاواتو نیازەكانت. لەپەیامە جوانو ژیاندۆستییەكانی ئایینی ئیسلامیش ئەمەیە (كاربكە بۆ دنیا وابزانە قەد نامریت، كاریش بۆ دوارۆژ بكە وابزانە سبەی دەمریت. یان پێغەمبەر لەم پەیامەیدا زۆر گرنگ ژیاندۆستی لە ئایینی ئیسلام خستووەتەروو، دەڵێت ئەگەر رۆژی دووای دەركەوت و نەمامێك بەدەست یەكێكتانەوە بوو بینێژن چونكە بەوە پاداشتان بۆ دەنووسرێت). مرۆڤیش تا بژی پێویستیو نیازمەندە بە ژیانە، باپەندە بە ویستو خواستو ئارەزووەكانی.

- مردوو لەوە پاكتر ناشۆرێت. (ئەو كارە لەوە باشتر ناكرێت)- مردووشۆردن=كارە.

نانخۆرت بمرێ بەس مشور خۆرت نەمرێ (با من بمرم ئینجا ئەوسا دەتبینمەوە-لەتەمەنی پیریدا شتێ دەوترێ بۆ نازكردنو كۆنترۆڵكردنو دەستسپێتی بەرانبەر نیشاندەدات، كە ئەگەر من نەبم تۆ هیچت بۆ ناكرێ-تا نەمرم قەیرم نازانن(ئەوە منم ژیانی تۆم دابینكردووە) با بمرم ئەوكات قەدرم

دەزانن. واتا ئەو کارە گەیشتۆتە کۆتایی لە چاکیدا، لەمە زیاتر چاکنابێت، چونکە شۆردنی مردو پەیوەندی هەیە بەوەی ئیدی ئەم مرۆڤە مردووە ئەمە دوا شۆردنییەتی و بەخاك دەسپێرێ، واتە ئیدی ناوی خوای لێبێنە دەست بەوکارە بکە(دەست بەناشتن بکەن).

- دکتۆر گیان مرد فریا بکەوە:

ئەمە لەوکاتەدا دەوترێ کە نەخۆشەکە زۆر حاڵی خراپە، لەم دەربڕاوەدا مرد(ئەو مرد) هێمایە بۆ کەسی نەخۆش. ( لەواتای سیمانتیکی ئەم دەربڕاوەدا کەسەکە مردووەو هەواڵ دەداتو داواشدەکات)، بەلام ئەم کەسەی ئەم دەربڕاوە دەڵێ، مەبەستی ئەوەیە کە دکتۆر بگاتە لای نەخۆشەکەو ڕێگە لە مردنی نەخۆشەکە بگرێت یان کارێك بکات نەخۆشەکە پێویستی بەوە، وە هیچ ئامـاژە بە نەخۆش نەدراوە بەس دەوروبەری دەربڕاوەکە کە وشەی (دکتۆر-فریاکەوتن)ی تیایە ئەوە دەردەخات.

- سەرە خۆرە: بکوژ: ١- بەمنداڵێك دەگوترێ کە لەکاتی لەدایك بوون دایکی یان باوکی بمرێت. ٢/کچێك شوو بەپیاوێ بکات، پیاوەکە بمرێت(٧٠)

دەخوات، خواردنی سەریش هێمایە بۆ مردنی کەسێك، واتە جۆرێك لە شومی تیایە، کە تۆ کەسێکی بەخێر نەبوویت چون بوویتە هۆی مردنی دایك. هاوکات بە چەشنێك واتای دووەمیشی هاتنێکە خێری پێوە نەبێت واتە چ منداڵەکە چ ژنەکە بۆ دایکەکەو پیاوەکە خێری نەهێناوە،(پێوقەیەمی بەخێر نەبوو). جگەلەوەی بە کەسی عەجولو منداڵی بێرەوشت، دەرچوو (ناگوێڕایەڵ) دەوترێت.

- خوا بردیەوە بۆ لای خۆی:

لێرەدا وشەی(بردنەوە) مەبەست لێی مردنە، واتە ئەو کەسە مرد و لەم ژیانەدا نەما. جگەلەوەی کە بردیەوە هێمایە بۆ ئەوەی کە بەردەوامی هەیە، واتە ئەم کەسە لە شوێنێکەوە براوە بۆ شوێنێکی تر، ئەو شوێنەش لای

خوایە بەڵام شوێنەکە شوێنی فیزیکی نییەو دیار نییە، ئەوەشی بردویەتیەوە هەر خوا خۆیەتی، هەروەك دەشتوانین ئەوەی لێ هەڵێنجین کە لە کوێوە هاتوین دەبرێینەوە بۆ ئەوێ. ئەوەش دەرخستنی دەسەڵاتی خوایە.

- ئەو مردووەی سەرقەبران هەمووی تۆ کوشتوتە[٧١]:

ئەم ئیدیەمە، وەك تانەیەك بەکاردەهێنرێت بۆ کەسێك دەوترێت کە خۆی هەڵدەکێشێتو فشە دەکات، واتە تۆ هیچ نیت. لێرەدا ئازایەتی ئەوەیە کە بتوانیت بکوژیت، واتە تۆ ئەوکات ئازایت کە کوشتن ئەنجامبدەیت، ئیدی کوشتنی کێ باسنەکراوە، خۆ دەشێ مەبەست دوژمن بێت، بەڵام ئەمە ئێمە وەك ئەگەر دایدەنێین بەڵام واتای سەرەکی تانەدانە لەکەسێك کە فشە دەکاتو دەیەوێت خەڵك لێی بترسن، ئەمەی پێ دەوترێت تا هیچیەتی کەسەکە بخاتە بەرچاوی خۆی، واتە کاتێك خەڵك لێت دەترسێت کە بتوانیت بکوژیت، هاوکات ئەوەشی تیا دەبینرێت گەر کەسێ بکوژرێت پاشان پێی دەگوترێت(پێی گوتراوە) مردوو. یاخود کەسێك کە زۆر بەخۆیدا دەنازێتو دەڵێت من دەتوانم ئەوە بکەم، هیچیشی لەباردا نییە، واتە کردنو کار وەك کوشتن دانراوە.

- ئەوەی من نەیکوژم نامرێت[٧٢]

(ئەمە یەکێك دەیڵێ کەبەهێزو تواناو دەسەڵاتی خۆی بنازێت). هەروەها دەشێت وەك تانەش بگوترێت ئەوەی تۆ نەیکوژی نامرێت(ئاواز لە وتنەکەیدا دەریدەخات کە واتاکەی پێچەوانەیە)، لێرەدا دەسەڵاتی کوشتن هەیە، هەروەها خۆ باڵاکردن هەیە، تا ئاستی خوا(نەعوزوبیلا). گەر ئێمە لە ئایینی ئیسلامدا هەموو دەسەڵاتەکان بۆ خوا بگەڕێنینەوە، بەوەی ئەوەی ئەو مەیلی لێنەبێت نابێت، ئەوا لێرەدا کەسێك بەمجۆرە ڕەفتار دەکات، ئەوەی من نەیکوژم نامرێت، واتە من مردن دەدەم، وەك چۆن ڕژێمی بەعس مردنی بەکورد دەدا، ئەم کەسەش دەڵێت من مردن دەدەم، جگەلەوەی واتە کەسێك

نامرێت لەدەرەوەی سنووری دەسەڵاتی من بێت، ئەمە هەڕەشەیەکە دەکرێت لەدۆخێکی زۆر تووڕەبووندا بگوترێت یان لە تۆڵەسەندنەوەدا بگوترێت. دەشێ ئەوەش بێت ئەوەی من نەیکەم و بڕیاری لەسەر نەدەم نابێت و ناکرێت.

- ترس لەچاویدا مردووە:جەربەزەیە[٧٣]:

لێرەدا پەیوەندی ترس و مردن دەبینرێت، ترس نەمان هۆکارە بۆ ئازابوون و ئازادبوون، واتە تا ئەوکاتەی من بترسم ئازاد نیم، وەك چۆن هیگڵ ترسی لەمردن بەهۆکارێك بۆ کۆیلەبوون داناوە، چونکە من کە ترسم لە ژیانم هەبوو ئەم ترسە ڕێگریم دەکات لەوەی بەهێزبم، چونکە نامەوێت ژیانم بفەوتێنم، بەڵام کەسێك کە ترسی لەمردن نەمابێت ئاسایی هیچی نییە بیدۆڕێنێت یان هیچی نییە لەناوبچێت. جگەلەوە ئەمە پێمان دەڵێت لەهەموو ئەندامانی لەشماندا زیندوویەتی هەیە، وەك چۆن دەممردوو، دڵمردوو، ڕەنگی مردوو، ئەواش چاوی مردوو هەیە، واتە هەریەك لە ئەندامانی جەستەمان نیشانەی زیندوویەتی یان نازیندوویەتی پێوەیە. هاوکات ئەمە لەوکاتەشدا دەگوترێت کە دەشێ وەك کارێکی باش بێت کە سڵ لەهیچ ناکاتەوە هاوکات دەشێ وەك خراپە بگوترێت، بەوەی دەستی لێبشۆن چونکە ئەوە ترسی لەهیچ نەماوە، بۆیە ئەوەی خراپە بێت لێی دەوەشێتەوەو سڵ ناکاتەوە لە کردنی. هاوکات ترس لە چاودا دەردەکەوێت. لەزۆربەی کاتەکاندا وتنی ئەمە بەکەسێکە کە خۆی ئامادەنییە(گوێی لەمە نییە)، مەگەر زۆرکات کە بەمنداڵ دەوترێت، چونکە منداڵێك کە سڵ لەهیچ ناکاتەوەو دەست بۆ هەموو شتێك دەبات، ئەمەی پێدەگوترێت بەوەی کە گوێڕایەڵ نییەو چەند لێی تووڕەبم و هەڕەشەی لێکەم و لێی دەم فایدەی نییە، دەست هەڵناگرێت. بەڵام دەشێ منداڵەکەش لەمە تێنەگات، نەك ترسی لەهیچ نەمابێت.

- چرای ماڵی کوژاوەیە:١/ گەورەی ماڵی نەما، ٢.خۆشی کۆتایی هاتووە.(٧٤):

چرا هۆکارێکە بۆ ڕووناکردنەوەی شوێنێکی تاریک، واتە ئەوە چرایە هۆکاری ڕووناکی بەخشینە. کاتێک ئەم ڕووناکیە نەما ئیدی تاریکی دروستدەبێت، واتە ڕووناکی خۆشیهێنەرە (باشەیە) تاریکی ناخۆشیهێنەرە(خراپەیە) واتای یەکەمی ئەم ئیدیەمە هێمایە بۆ کەسی بەڕیوەبەری ئەو شوێنە، گەورەی ماڵ وەك ڕووناکی وابوو بۆ تاریکاییەك، بوونی ئەو ڕووناکی دەبەخشێتە ماڵ، مرۆڤی موسڵمانیش هەمیشە نزای ڕووناکی گۆڕیکردووە، واتە تەنانەت ڕووناکی ناو گۆڕیشی لاگرنگبووە. واتای دووەم، ڕووناکی باشەیە، خۆشیە، چاکەیە...کاتێك ئەم ڕووناکیە نامێنێ ئیدی هێمایە بۆ نەمانی خۆشیەکان. هاوکات دەشێ وەك ڕێ ڕۆشنکەرەوەش لێی بڕوانین کە ڕووناکی هەبوو هەڵەکردن نییە چون ڕێگە ڕۆشنەو چاكو خراپ لەلایەن سەرپەرشتیاری ماڵەوە خراوەتە ڕوو بەلام کە ئەو نەما ڕێڕوونیش نامێنێت، کەسێك نەما ڕێنوێنیان بکات تا نەکەونە هەڵەوە.

- حەفتی بمرێ لەباوان کلەی نابڕێ لەچاوان: (بەئافرەتێکی دڵ تەڕ یان دەلوو دەوترێ)[٧٥]: دیارە مردن کاریگەری خۆی بەجێدەهێڵێ بەسەر کەسوکاری مردووەکە، واتە بەپێی نزیکی لە کەسی مردووەوە خەفەتباریو مەراسیمی مردن بەڕێوە دەبرێت. واتە کاتێك کەسێکی نزیکمان لێدەمرێت خۆمان لە کۆمەڵێ شت دەپارێزین، یانی ناتوانین ئەوە بکەین کە پێشتر ئەمانکرد، ئەوە لەبەربکەین کەپێشتر لەبەرماندەکرد(پۆشتنی جلو بەرگ)، سەیرکردنی تەلەفزیۆن، خۆ جوانکردن،...ناکرێت یان لەڕووی ئەخلاقیەوە یان لەڕووی بەهای کولتووریەوە ئەوە بەهای کولتووریە کەوادەکات ڕێوڕەسمی مردن بەمجۆرە بێت، لادان لەم دابانە لادانە لە کولتوور، بۆیە بۆ ئەو ئافرەتە، چەند خاڵێك باسدەکەم، دەشێ کەسێکی دڵڕەق بێت، دەشێ کەسێك بێت گوێ خۆشەویستی بۆ مردووەکە یان بۆ کەسە نزیکەکانی(باوان) نەبێ. دەشێ کەسێکی دڵتەڕ بێت یان دەشێ کەسێکی

لادەربێت لەو کەلتوورە باوەی کەهەیە(ئەمە زۆر زەحمەتە). واتە ئەوەی کە مردنی دۆستێکمان لێماندەخوازێت لەو ئافرەتەدا نابینرێت.

– خـوا بردیـەوە بـۆ خەزێنەکـەی خۆی(خـوا بتباتـەوە بـۆ خەزێنەکـەی خۆی): لەکوێوە هاتوین بۆ ئـەوێ دەچـین، یـان ئەبرێینـەوە. کاتێـك هـەواڵی کەسێك دەپرسیت وەڵامدەرەوە ئەمە وەڵامەکەیەتی، دەشێ گەر من نـەتوانم ئەم کۆدە لێبکدەمەوە واتاکەی ناروون بێت، چـونکە ڕێکـەوتنی کۆمەڵایەتیـە کە ئەم دەربڕاوەی تیا بەکاردێت، جگەلەوەی هۆی ئایینیش دەشـێ لەپشـت ئـەم دەربـڕاوەوە بێـت بـەوەی ئێمـە هـی خـواین هـەر بـۆ لای ئـەویش دەگەڕێینەوە(انا لله وانا اليه راجيعون). هـەروەك جگـە لـە واتـا ئایینییەکـە واتایی فەلسەفی هەیە، ئەوەی کـە دێـت دەبێـت بـڕوات، ئەوەشـی بـڕات هـەر دێتەوە "ئـەوەی لـەدایك ببێـت ناچـارە بمـرێ. ئەوەشـی بمرێـت ناچـارە بگەڕێتەوە"[٧٦]، هاوکات ئێمە هێنراوین دەبێ ببرێینەوە، بۆیە لـەو شـوێنەی کە لێی هاتوین(خەزێنە) دەبێ ببرێتەوە بۆ هەمان خەزێنە. لێرەدا دەسەڵاتی خوا بەتـەواوی دیـارە، کـە خـوا خۆی ئێمـەی دروسـتکردووە(خەزێنەکە هـی خوایە) هەر خۆشی دەمانباتەوە.(هەر دەچینەوە هەمان خەزێنە). واتە ئەوە خوایـە کـە دەتوانێـت بباتـەوە، چـونکە خـۆی خـاوەن خەزێنەیـە. هاوکـات "خوابتباتەوە بۆ خەزێنەکەی خۆی" مەبەست ئەوەیە نزا لە کەسـێ بکرێـت، یان دەشێ وەك گاڵتە پێکردنە نە ئەوەی نزای لێبکات بەڕاسـتی، لەبەرئـەوە وەك هۆکارێك نزای مردن بەکارهێنراوە، بۆ ئـەوەی کەسـانی دەوروبـەر بێنـە پێکـەنین. لەبەرئـەوەی ئـەم دەربـڕاوە زیـاتر لـە ئێسـتادا بـۆ مەبەسـتی دروسـتکرنی ژینگەیـەك بـۆ پێکـەنین و گاڵتەوگەپـە یـان لـەم دەوروبـەرەدا دەوترێت بۆیە کـەمتر بـۆ دۆخـە ڕاسـتیەکەی دەوترێـت، کـە کەسـێك بمرێـت دەچێتەوە بۆ لای خوا(خەزێنەکەی خوا).

– ئێمە ئەمانەتین چۆن هاتوین دەبێ بگەڕێینەوە:

مردن زۆرکات وەك ئامۆژگاری یان بەئاگاهێنانەوە بەکارهێنراوە، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە چۆن لەم ژیانەداین دەبێ بشمرین، واتە چۆن هاتوینەتە ژیانەوە دەبێ بشگەڕێینەوە، بەواتایەکی تر ئێمە لەشوێنێکی دیاریکراوەوە هاتووین، دەبێ بگەڕێینەوە بۆی، واتە نەکەی لەیادی کەیت کە هاتیت ناگەڕێیتەوە بەڵکو دەبێ بگەڕێیتەوە. ڕووی دەمی لە ئێمەیە، زۆرکات ئەمە بۆ گوێڕایەڵیکردنی خەڵکانێك بەکاردەبرێت، هاوکات "ئێمە"ی بەکارهێناوە تا لەڕووی بەکارهێنانو ڕێزەوە ڕەچاوکردنی تیابێت، واتە خۆکردنە ئەمانەت هەیە، ئەمانەتیش دەبێ پارێزراوبێت و دەبێ بگەڕێنرێتەوە، واتە من کراوە بە ئەمانەت، سروشتی ئەمانەت بریتییە لە پاراستن، دەبێ بیپارێزین چونکە ئەمانەت. هاوکات جۆرە ئارامبەخشیەك دەبینرێت، کاتێك هەست بە ئەمان بکەیت، واتە ئێمە لای خوا پارێزراوین. یاخود ئێمە بە ئامانەت دراوینەتە دەست ئەم ژیانە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ خاوەنە یەکەمو ئەسڵیەکە. پاراستنی ئەمانەت بەهایەکی کولتوورییە لامانە، گەڕاندنەوەی ئەم ئەمانەتەش وەك خۆی بەهایە. هاوکات چۆنییەتی هاتنو چۆنییەتی گەڕانەوە بەدیدەکرێت. واتە بەهەمان چۆنییەتی ئێمە دەگەڕێینەوە، بەڵام هاتنو گەڕانەوەمان تا چەند لە دەسەڵاتی خۆمانە؟ کەلەم دەربڕاوەدا ئەمە تارادەیەك ناروونە واتای سیمانتیکی ئازادیدانە بە خۆمان بەڵام ناچارانەیە لەوەی (دەبێت) ئەو کارە هەر بکەین.

- پیاوەوێ لەبەردەم مردندا خۆی بگرێ(هێزی مردن- هێزی ڕووخێنەر- بەکارهێنەر(واتە من وادەڵێم بە کەسانێ کە خۆیان هەڵدەشاخن، بۆ کەمکردنەوەی هێزی ئەوان هێزی مردن/خوا بەکاردێنم. ئەمەش ڕاستە پیاو هاتووە بەڵام دەشێ تەنیا مەبەست لە پیاو نەبێت(کە پیاو هێمایە بۆ ئازایەتی- واهاتووە). ئەو کەسانەی کە وەك خوان لەسەر ئەم زەویە ناتوانن هێزو دەسەڵاتی مردن ببەزێنن، جەنگی مردنیان پێناکرێت، خۆیان پێراناگیرێت لەبەرانبەر ئەو هێزەدا هەر شکست دێنن.

- مردن بۆ خۆ نەمرکردن(خۆ کوشتن- خۆفڕێدان- گەڕان بەدوای شێوازی ناوازەی خۆکوشتندا) یان لەکتێبی ئەزموونی (شێرکۆ بێکەس)دا کەسێك ئاواتی ئەوەی هەیە کە بمرێت بۆ ئەوەی شێرکۆ بێکەس شیعری بۆ بنوسێت، دەشێت زیاتر بۆ ئەوە بێت کە بەو شیعرە نەمر دەبێت. یان کەسێك خۆ دەکوژێت بۆ ئەوەی ببێت بەناو، لەمانشێتو سەردێڕی هەواڵەکاندا بێت، لەکاتێکدا ئەو مرد، تاچەند ئاگای لەمەیە کە پاشخۆی ڕوودەدات؟ هەروەك ئێمەش کە دەچین بۆ پرسەو سەرقەبران... ڕێورەسمەکانی تر من ئەوەی لێهەڵدەهێنجم کە بۆئەوە بێت کە ئێمەش مردین خەڵك بێت بۆ پرسەو قەبرسان بۆ لامان. هاوکات شێواز هەیە بۆ خۆ نەمرکردن بە مانا ڕەمزەیەکەی.

- تەمەنی درێژی بۆ خۆتان جێهێشتبێت(ئایا کاتی تەواوی خۆی نەژیا- وا تەمەنەکەی بۆ ئەوانیتر بەجێهێشتبێت- تەمەن لەیاد دەکرێت یان بەجێدەهێڵرێت... ئەو تەمەنەی ئەو نەژیا ئێوە بژین- ژیاندۆستی). تەمەنی درێژی ئەو(مردووەکە) بۆ زیندووەکان.

- مردنو سەفەر(ئاوکردن بەدوای کەسی سەفەرکەردا- ڕۆشتن بەدەست خۆمەوە هاتنەوە بەدەست خۆم نییە)، واتە ئەگەری مردن هەمیشە ئەگەرێکی بەهێزە، یان گەر مردیشم گران وەریمەگرن چون مردن هەیە، هەر دەشبێ بمرین، وە مردن شتێکە ناتوانین لێی هەڵێین، گەر هەموو شتێ بەدەست مرۆڤ خۆی بێت مردن بەدەست خۆی نییە. هاوکات مردن(کۆچی دواییکردن) سەفەری کۆتایی.(لە ئاییندا باسی توێشوی سەفەر دەکرێت، کە مەبەست کردەوەی باشەیە).

- خوا بداتێ مردنێکی باش(خوایە مردنێکی باشمان بەنسیب بکەیت) مردنی باش بەپێی بیروباوەڕی کەسەکان دەگۆڕێت، دەشێ پێشمەرگەریەك مردنی باش(سەربەرزانە) ئەوەبێ کە لەشەڕدا(جەنگ)دا لەگەڵ دوژمن

بمرێت(لێرەدا زیاتر وەك شەهید بەكاردێت)، بەڵام بۆ باوەڕدارێكی ئایینی دەشێت، بوونی ئیمان(بەئیمانەوە مردن) یان زەلیل نەكەوتن، باشترین مردن بێت.

- هەزارساڵ عەمرت بێت هەر دەڵێی فلانی(بەراوردكردنی زیندوو بەمردوو)، ئەمە دەشێ لەدەوربەرێكدا ڕەوشتێكی باش/ خراپ ببینیت، ئەمە بگوترێت كە تۆ وەك ئەو نەمریت، تەمەنی تۆ درێژبێت بەڵام هەر دەڵێی ئەویت، هەزار ساڵ ناژین، بەڵام بۆ ئەوەی كە كەسی بەرانبەر دڵگران نەبێت بەو بەراوردە و واهەستنەكات كە خراپ ئەوە دەوترێت. واتە مردوو زیندوو بەرانبەر بەیەكدی بەراورد دەكرێن، كە نیشانەیەكیشە لەسەر وەفاداری زیندووەكان كە مردووەكان لەیاد ناكەن، چونكە بەردەوام وێنەیان بۆ دەدۆزنەوە ئیدی بەزیندووەكان بێت یان لە خەونیاندا، یان بەقوربانیكردن بێت، هەر لەبەر ئەمە كەسی بەرانبەر كە بەراوردی پێكراوە زۆر خۆشەویست دەبێت یان دەشێت بەپێچەوانەوە بێت كە كەسی مردووەكە خۆشەویست نەبووبێت وەك سەرچاوەی مانەوەی ڕق دانرێت. مردن خۆشیهێنەر نییە بۆیە دەڵێت هەزارساڵ. مرۆڤی زیندوو زۆركات ڕێز لەمردوو دەنێت، واتە هێندەی ڕێزی لێدەنێت هێندە بێڕێزی ناكات، واتە وەك تابۆیەكی لێدێت، مەگەر مردووەكە زۆر نەویستراو بێت، زۆر زاڵم بێت، دەنا بەردەوام بەڕێزەوە ناوی دەبرێت، خۆشەویستی زیاددەبێت، هەتا مرۆڤ كە سەفەر دەكات خۆشەویستر دەبێت، مردنیش سەفەرێكی یەكجاریە، بۆیە خۆشەویستی چەند زیاد دەبێت، (لەدەمم دانەچڵەكێت) ئەمە ڕێزێكە بۆ مردووەكە كە باسی دەكرێت، جگەلەوەی وەك زیندوو مامەڵەكردنە لەگەڵیدا، وەك بڵێی خەوتوە بەخەبەر نەیەت. یان بەمردوو دەوترێت(لەگەڵ نوری خوادا چاو هەڵ بهێنێت).

- مردنی جەستەیی و مردنی مەعنەوی، بەس بە جەستە ماوم. مردنی بەچاوی خۆی بینی(دیارە بینینی دەشێ لەچەندین شێوەدا بێت، بۆ كەسی

سۆف ئەم دیتنە جیاوازە وێنەو شێوەی، بەبەراورد لەگەڵ کەسێك ئازاری پێدەگات، یان دەترسێت...)

- ئەمڕۆ هەر مردم(کرێکارێك زۆر ماندووە/شەکەتە لەکارکردن- جەستەیی).

وەك ئیستێك باسی میللەتی کورد دەکەین لەکۆندا هەندێ حاڵەتی ڕەچاوکردووە سەبارەت بەمردن کە زیاتر لەژێر کاریگەری ئاینو ئەفسانەدا بووە، بۆ نموونە ئەو ئافرەتانەی بەسەر منداڵەوە بمرێت وەك شەهیدوایە، ئەوەی منداڵی (مەلۆتکەی)ی بمرێ عەزابی قەبری کەمتر دەبێت. یاخود ڕۆژی پیرۆزیان جیاکردۆتەوە ئەگەر ڕۆژی هەینی بمریت عەزابت نابێت، چونکە ئەم هەینییە بەو هەینییەی تری دەسپێرێت... ئەم حاڵەتە بووە هۆی ئەوەی کە زۆرکەس ڕۆژی هەینی مردووی خۆی نەشارێتەوە گوایە مردوو هەست بەمردنی خۆی ناکات، پاش ناشتنی کە خەڵك بەجێی دەهێڵن لەگۆڕستان مردووەکە دەیەوێت هەستێتەوە لەگەڵیان بڕوات بەڵام سەری بەر بەردی ئەلحەد دەکەوێت ئەوکات دەزانێ مردووە، ئەو دەم گۆڕەوشار دەدرێت، دێتەوە شیری مەمکی دایکی لەدەم دێتە دەرەوە بۆیە پەسەند نییە مرۆڤ گۆڕی بگۆڕدرێت. لەلایەکی ترەوە هەندێ کرداریان نەکردووە چونکە هێمابووە بۆ مردنی کەسێك، بۆ نموونە ئەو تەنوورەی کە نانی پێ برژا نابێ گۆشتی پێ ببرژێنن چونکە ئەو ماڵە مردوویان لێ دەمرێ[٧٧] مرۆڤی کوردیش وەك هەر نەتەوەیەکی تر ڕوانینو تێڕامانی خۆی هەبووە بۆ مردن، هاوکات کاریگەری ئاینیش زۆر بەروونی دەبینرێت. بۆ زیاتر نزیکبوونەوەمان لەواتاو دیاردەی مردنو دەرکەوتەکانی چەند وشەو دەستەواژەیەك دەنووسین، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆیان بەمردنەوە هەیە. یاخود ڕەمزن بۆ مردن، پاشان دەستدەکەینەوە بە لێکدانەوەی هەندێك پەندو دەربڕاوی تر کە تایبەتن بەمردن.

- ڕەشپۆشین
- شین و شەپۆڕ
- لافیتەی ڕەش
- دارەمەیت
- چارداخ(کۆبوونەوەی کەسوکاری مردوو لەو شوێنەدا- لەژێر چارداخەدا)
- بوونی پرسە لە مزگەوتدا
- مۆسیقا(بوونی شەهیدو مۆسقای تایبەت)
- خامەی سپی
- مەیت
- گۆڕ- لافیتە- قور بەسەرداددان(قورم بەسەر)
- بەرزکردنەوەی ئالای ولات(لەهەندێ ولاتدا) نیشانەی مردنی سەرکردەیە
- دانانی خەتێکی ڕەش لە تەلەفویۆن و بلاوکراوەکاندا، بۆ مردنی کەسایەتیەکی دیار، تایبەت بەو بلاوکراوەیە، یان نەتەوەکە.
- جەنازە(جەنازەیەکم بینی ئەو هەموو سەیارەیە بەدوایەوە بوو(هی مەسئولە- ناسراوە)
- چارەنووس و کۆتایی ژیان(چارەنووسی هەموومان هەر مردنە)
- پاتری مردن
- ئیسکت مریێ(ڕەگەزی مێ بەکاریدێنێت)
- بارزانی نەمر/ شێخ مەحمووی نەمر (هەوڵدانی مرۆڤ بۆ نەمرکردن)
- سەرە مەرگ
- کولەمەرگی: لەژیاندا مردن هەیە، وەك چۆن بەپێی هەندێ بیروباوەڕ لەمردندا ژیان هەیە). واتە ژیانێکم هەیە لەمەرگەوە نزیکە، چونکە توانای ئەوەمان نییە رابژین کە ژیان پێویستیەتی، ژیانێکی نەدارانە.

- مەرگەسات
- ئەوەندەیان لێوت تا مردن
- مردوویەك
- مردن کەری دەچالە لەهەموو ماڵە[78]
- ڕۆژێ دێ ئێمەش بمرین(ڕۆژێ دێ سەرەی ئێمەش دێت)
- گیانەڵا
- فەتارەت(وابزانم بەفەتارەتێکمان دەدات)
- کۆستکەوتن(کۆستکەتوو- دەڵێی کۆستت کەوتوە).
- بشمرم(بشمرم گەردنی ئازاد ناکەم)
- بێکەس مان(بێکەس ماوە بەتەنیا - داماوە هەر خۆی ماوەتەوە- ئەوانیتر هەمویان مردوون)
- دەترسم نەتبینمەوە(دەترسم بمرمو نەتبینمەوە)
- هەرکەسەو دەچێتە گۆڕی خۆی(زۆرجار بۆ پاساو هێناویانەتەوە، بەوەی کە تۆ حەقی منت نەبێت)
- خوا نەتکەیەنێتە جێ - خوا لەمنت بسەنێ- ڕاستنەبیتەوە- بەڕۆڵەی گڵ بێت...
- قوڕیکرد بەسەری خۆشیو منیشدا(دایکێك کورەکەی دەمرێت- بەهۆی ڕووداوێکەوە-لاساریەکەوە) ئەم سەرە سەری خۆت نییە.
- سەری بێ ڕزق لەژێر خاکدایە
- ناوی شوێنەکان: مەرگە- باوەمردە- گوندی نەمرکێ(لەبادینان)

جنێودانو قسەی ناشیرین بەمردوو"لەچاڵ دەرهێنان، دەڵێ سەرەڕای بێگارەکە دایك و باوکیشم لەچاڵ دەردێنن"[79]

- مل لاربوونەوە:

بۆ مردنو زیندووبوونیش بەکاردێت، ملی لاربۆتەوە واتە نووستووە، یان واتا مردووە[80] هەروەك ڕەگی ژیانیش بە نزیك لای مل دانراوە، بەوەی دەوترێت. مردن لە ڕەگی ملم نزیکترە لێمەوە.

- لەمردن نزیکبۆتەوە:

ئایا ئێمە لە مردن نزیك دەبینەوە یان ئەو لەئێمە نزیکدەبێتەوە- لەدەرگامان دەدات) ئایا ئێمە بەرەو مردن دەڕۆین یان ئەو بەرەو پیرمان دێت یان هەردوو حاڵەتەکە. بەکەسێك دەوترێت کە نەخۆشبێت، چونکە نەخۆشیو مردن پەیوەندیەکی زۆریان بەیەکەوە هەیە، وەك چۆن پیریومردن پەیوەندیان هەیە، دەشێ مەبەستیش پیربوون بێت.

- نەمری- نەمریت:

بەپێی دەوروبەرەکەی واتاکەی دەگۆڕێت، کاتێك منداڵێك شتێکی سەیر دەکات(مەرجیش نییە کردەیەکی سەیر بکات، بەڵکو خۆشەویستی منداڵە هەموو کردەیەکی دەتهێنێتە پێکەنین). نم. خوایە نەمریت(دیارە ئاوازیش لەم دەربڕاوەدا هەیە) یان بە کەسێك دەوترێت(نەمری ئەمەش دەزانیت) هاوکات دەکرێت نەمری وەك چەمك- یان ناونیشان (گەڕان بەدوای نەمرییدا)[81] یان (بارزانی نەمر- شێخ مەحمودی نەمر...)دا هەبێت، بەشێوەیەکی گشتی وشەی (نەمری) بەکارهێنانی زۆرە.

- نیوە مردوو(نیوە عەمربوو):

(دەشێ لێدان بێت، دەشێ ترساندن بێت(ترسابێت)، هەروەك دەشێ ماندووبوونو شەکەتبوون بێت، هاوکات نیوە عەمربیت، وەك نزاکردنیش بەکاردێت. ئەمانەش پەیوەندیان هەیە بەکورتکردنەوەی تەمەنی مرۆڤەوە[82]، واتە مردن لەخۆوەوە نەهاتۆتە ناو ئەم ئیدیەمەوە.

- من مردوو تۆ زیندوو:

من گفتوگۆ دەكات لەگەڵ تۆ(دەشێ گفتوگۆ نەبێت)، من لەئێستادا پێشبینی شتێك دەكات بۆ ئاییندە، لەبەرئەوەی ئاییندە ئەگەری مردنی لەپێشە من خۆی بەمردوو دادەنێت بۆ كاتی ئاییندە، كە ئەو شتەی ئێستا دێتە دی. ئەمە لەكاتێكدا دەوترێت كە قسە لەسەر شتێك لە ئاییندە دەكرێت، واتە ئەو كەسەی كە مردووە(من لەئاییندەدا دەشێ بمرم) شتێكی وتووە لە ئاییندەدا دەبێت، یان بابەتێك هەیە ئێستا ڕاستیەكەی دەرنەخراوە بەڵام ئەم ئومێدی هەیە كە لەئاییندە دەرخرێت جگەلەوە خۆشی لێكدانەوەیەكی بۆ بابەتی نادیار كردووە كە ڕاستیەكەی ئەوەیە. وەك دەشزانرێت مردن لەڕێی هەموو مرۆڤێكە، واتە ئەگەری مردن لەئێستاوە هەیە تا ئاییندە، واتە ئێستا دەشێ بمرم، وە دەشێ پاشان بمرم، هەر دەمرم، كە دەڵێ من مردوو واتە من ئیستا نەمردووم بەڵام ئەوكات دەشێ من بمرم بەڵام خۆ تۆ زیندوو دەبیت ئەوجا دەڵێیت وەڵا فلان ڕاستی وت، وادەرچوو. لێرەشدا ڕەچاوی ئەوە كراوە كە كەسی بەرانبەر نارەحەت نەكرێت چونكە مردنی بۆ خۆی داناوەو زیندوویەتی بۆ ئەو داناوە، لەكاتێكدا كاتی مردن نادیارە بەڵام ئەم كەسە كاتی مردنی خۆی داناوە(نەك بەڕاستی بەڵام وەك ئەوەی كە كەسی بەرانبەر ئازار نەدات ئەمە دەڵێت)، هەروەك وەك گریمانە دەوترێت.

- مەرگ حەقە: بەوەی كە مردن بە بێزراو لێی دەڕوانرێت، هەمیشە هەوڵدراوە نكوڵی لێكرێت، بەردەوام گەراوین بەدوای نەمریدا، هەوڵدان بۆ لێدان لە مردن لەمێژە هەیە، هەمیشە هەوڵدراوە لەبەهای كەمكرێتەوە، بەدرۆبخرێتەوە. بەڵام ئەمە ویستی ئێمەیە بەرانبەر بەمردن، ئایا مردن خۆی چی، مردن خۆی ئاوازێكی دی دەچرێت، كە جیاوازە لەو ئاوازەی ئێمە دەمانەوێت، واتە ئاوازی ئێمە بریتییە لە دوورخستنەوەی مەرگ، مەرگیش هەرگیز بەمە ڕازی نییە، مردن ئەركی خۆی بەجێدەهێنێت. واتە نكوڵیكردن

لەمەرگ مێژوویەکی هەیە، هەروەك خۆسەپاندنی مەرگیش مێژوویەکی هەیە، کە بەردەوام ئەم هەوڵەی تێکشکاندوە. بۆیە مرۆڤ دەبێت بگاتە ئەوەی کە مردن حەقە، واتە ئیدی دەبێت دان بەمردندا بنێت، دەبێت ئیدی وەك ڕاستی لەمردن بڕوانێت، هاوکات ڕاستی مردن لەئاییندا وەلامێکە بۆ زۆر لایەن، کە ئەمە زیاتر ئاین ڕووی دەمی لەو کەسانەیە کە مردن بەشتێکی تر دادەنێن. ڕاستی مردن لەوەدایە کە بۆ هەریەکێکمان مردن بە ڕەهایی ڕوودەدات، واتە هەریەکێکمان دەبێت بمرین، بۆیە مردن ڕاستیە بۆ هەریەکێك لە ئێمە. مردن حەقە، زیاتر لە ئایینەوە سەرچاوەی گرتوە، بەوەی کە مردن هۆکارێکیشە بۆ ئەوەی کە لەم ژیانە کورتە ڕزگارت بێت بۆ ژیانێکی هەتاهەتایی، وەك کەسی زیندوو مردن بە حەق و چون بۆ حەق دادەنێت، ئەم ژیانەش بە ناحەق و ناڕاستی دادەنێت(تۆ لەشوێنی حەق من لەناحەق). لەبەرئەوە مردن حەقیقەتێکی نائاشکرایە، دەزانین دەمرین، هەردەبێ بمرین، ناکرێ نەمرین، بەلام کەی و چۆن...چی دەبێ پاش مردن...ئەمانە هەمووی نادیارو نهێنین، واتە مردن حەقیقەتێکی لێڵە، دڵەڕاوکێ وترس و نیگەرانیش بەرانبەر بەمردن لەمەدایە، هەروەك بۆچوونی کریشیان مۆرتی بەمجۆرەیە کە ئێمە لە حەقیقەتی مردن ناترسین بەڵکو لەوشەی مردن دەترسین، واتە کاتێك ئێمە حەقیقەتی مردن ناناسین ئیدی چۆن لێی دەترسین، بەڵکو لەڕێگەی وشەکەیەوە ئێمە ترس و نیگەران...دەبین[٨٣]، جگەلەوەی ئەم بۆچوونەی کریشیان مۆرتی سوکرات لەزاری ئەفلاتوونەوە پێشتر باسی لەمە کردووە(بڕوانە– بەشی یەکەم، مردن لەفەلسەفەدا). هاوکات دەشێ مردن حەقە وەك خوا حەقە دابنێین، بەلام مردن وەك دەسەلاتێکی خوا وایە. لەکاتێکدا ئەم دەسەلاتە تا ئێستا نەتوانراوە ڕەد بکرێتەوە، چونکە زانستیش لەئاستیدا دەستەوەستانە، لەوەی مردن تێپەڕێنێت. هاوبەشی نێوان مردن و خوا وەك لای دێریدا باسمان کرد زەقەو بەشێوەیەکی فراوان

دەبینرێت، وەك بەڵگەیەکی ڕەدنەکراوەش ئایینییەکان مردن بەهێزی خواوە دەبەستنەوە کە تا ئێستا هیچ زانستو تیۆریە نەهاتووە ڕەدی ئەمە بداتەوە، لوغزی مردن تەنیا بە لوغزی خوا دەپێورێت، هەروەك ئەم هاوبەشییە لە ئەدەبیاتیشدا ڕەنگی داوەتەوە. بۆ نموونە (دلاوەر قەرەداغی) لە شیعری "مەلەك ڕەیحان"دا دەڵێت.

لەخۆوە نەبوو کە زۆرمان پێمانوابوو
سێ شەوە خودا جێی هێشتووین
دەمانگوت گەر وانییە
ئەدی بۆ سێ شەوە
مەرگ سرەوتی نییەو
ئەم بەفرەش بێوچان
کەوتۆتە ڕەنگکردنی ماڵەکان

لەم دەقە شیعرییەی دلاوەریشدا تەواو هەست بە نزیکی و لێکچوونو هاوبەشی نێوان مەرگو خوا دەکەین، مەگەر جێهێشتنی خواو نەسرەوتنی مەرگ هاوبەشی نییە لەم دەقەدا؟ هاوکات سێ شەوە خوا جێی هێشتوون، سێ شەویشە مەرگ سرەوتو دەنگی نییە. کەشفکردنی مەرگ کارێکی ئاسان نییە هاوکات کەشفکردنیشی لەودیو ژیانەوەیە، واتە هیچ کات ئاشکراکردنی مەرگ ناکەوێتە ئەمدیو ژیانەوەو ناو ژیانەوە بەڵکو بەردەوام لەدەرەوەی ژیانەوە مەرگ ئاشکرایە، من کە لەم جیهانەداو لەم ژیانەدا دەژیم مەرگ ئامادەیی بەردەوامی هەیە، وەك چۆن بۆ ساتێکیش ناتوانم لەم زەویە دورکەومەوە ئاواش ناتوانم بۆ ساتێ لەمەرگی خۆم دوورکەومەوە، مەرگ هێندەی هەناسەکانم لێم نزیکە، وەك لە کوردەواریدا کە بەکاریگەری ئایین هاتۆتە ناوەوە مەرگ لە کونەلوت نزیکترە یان هاتۆتە سەر کونەلوت، ئابەوجۆرەیە. ئاشکراکردنی مەرگ عەشقی دەوێ وەك چۆن پەبوولە تا

نەسوتێ لە نهێنی ئاگر تێنگات ئەواش مرۆڤ تا نەمرێ لەنهێنی مەرگ تێناگاتو نهێنییەکەی بۆ ئاشکرانابێت.

- مەرگم پێش مەرگت کەوێ: مەرگت نەبینم(خوا دەکات مەرگیان نابینم ئیتر من هیچم ناوێت)

ئەم دەربڕاوانە زیاتر تایبەتن بەرەگەزی مێ(بەتایبەت دایك)، مەبەستیش لەمە نزایەکە دەکرێت بەرانبەر کەسێکی ئەزیز، واتە منداڵ بۆ دایك زۆر خۆشەویستە، ئەم دایکە بەرگەی ئەوە ناگرێت مردنی منداڵەکەی یان ئەزیزەکەی ببینێت بۆیە نزادەکات پێش ئەو بمرێت. یان دەشێت وەك نزا بۆ پاراستنی منداڵ بێت لەناڕەحەتیو تەنگو چەڵەمەی ژیان. دەشبێ وەك پارانەوەیەك بێت بۆ نەمردنی منداڵ. هاوکات ئەو مانایەشی هەیە کە ژیانی من بە بوونی ئێوەوە خۆشە گەر ئێوە نەبن من ژیانم ناوێت، یان دەشبێ بەپێی بەکارهێنانو دووربەرەکەی بۆ ئەو مەبەستە بگوترێت کە دایکێك کوڕەکەی لێی دوورە(بەنموونە لەئەورووپایە) ئەمەی بەلاوە گرانە بەڵام هەر پێی ڕازیە مادام زیندووە، چونکە ئەوەی بۆی زۆر سەختە مردنی ئەوانە دەنا هیچشتێ بەقەد ئەمە گران نییە. هاوکات ئایا تاچەند ئەم ویستو نزایە لە زانستو ویستی خوا دەجوڵێنێت، کە پێشتر کاتی مردن بۆ مرۆڤەکان داناوە؟

- ڕەنگی مردووی لێنیشتووە:

ئەمە بەکەسێك دەوترێت کە ناسراوبێت، واتە کەسێك بەکەسێك دەڵێت کە دەیناسێت(چونکە دەبێت دەموچاوی ئەو کەسە ناسراوبێت). کاتێك هەستبکەیت کەسێك ڕەنگی دەموچاوی(بەتایبەت ڕوخسار) گۆڕاوە، بۆ نموونە زەرد هەڵگەران، واتە کەسێك هەیە تەندروستی باشنییە، بۆ ئەوەی گوزارشت لە ناتەندروستی و ئەو گۆڕانە بکات کە بەسەریدا هاتووە ئەمەی پێدەڵێن، واتە بەهۆی پەیوەندی مردنو نەخۆشی لەیەکیانەوە دەشێ ئەم وشەیە هاتبێت. هەروەك دەشێ ئەوەش بڵێین مردنیش ڕەنگی هەیە؟ ئەمە واتای سیمانتیکی پێمان دەڵێت بەڵام واتای پراگماتیکی واتە

ناتەندروستی(کە هەرچەند ئەمەش تەواو وایە چون ڕەنگی ئەم مرۆڤە نەخۆشە گۆڕاوە) بەڵام گۆڕانەکەی بەمردن گوزارشتی لێکراوە، واتە واتای سیمانتیکی‌و پراگماتیکی پێویستە بۆ زانینی واتای ئەمە. دەشێ لەترسدا ڕەنگ بگۆڕێت، مردن‌و ترسیش هاوڕێی یەکن، مرۆڤی کەم هەن کە بێ ترس لەمردن پێشوازی مردن بکەن، مەگەر ئەوانەی یەقینی تەواویان هەیە بە نەمری ڕۆح، ترسیان لە مردن نەماوە، بەڵام ئەوانەی کە دڵنیانین(دڵنیاییەك لە هۆشیاریەوە نەك لە ڕاگەیەنراویەوە- لەکەسێکەوە یان قورئانەوە هەر شتێکی تر بیستبێتی))، واتە هەستکردن بە ڕۆح لەم دنیایەدا مردن ئاسان دەکات، بەڵام گەر هەستی پێنەکەیت مردن گرانە.

- دەڵێی خۆڵی مردووی بەسەردا کراوە(بەکەسێکی بێدەنگو داماو دەگوترێت)

مرۆڤ بوونەوەرێکی دەنگدارە، واتە بوونەوەرێکە قسەدەکات‌و جووڵە دەکات، یەکێك لەو خاسیەتانەی مرۆڤی زیندوو جیادەکاتەوە لەمردوو ئەو جووڵەو دەنگداری‌و بزێویەیە(بازاڕێکی مردووە، واتە بێ جووڵەیەو کاروکەسابی نەمان-کەمبۆتەوە). بۆیە لەم پەندەدا کە مرۆڤ دەمرێت ئیدی لە جووڵە دەکەوێت، هەستەکان دەوەستن کە گوزارشتن بۆ ژیانمان، مرۆڤیش کە دەمرێت دەخرێتە ناو گۆڕەوە ئیدی بێدەنگیەکی سامناك لەگۆڕستانیشدا هەیە، خۆڵی مردوو، (ڕەنگە مەبەست خۆڵی سەر گۆڕەکە بێت). بۆیە بێدەنگی و کەم جووڵەیی(نا عەجولی) بە خاسیەتی مردن دانراون، چونکە مردن وەستانی جووڵەیە.

- مانگا مردوو دۆ برا:(ئاژەڵێکە شیرەکەی وشك دەکات) ئەو باوکەت مرد (ئیدی ئەوەت بۆ ناچێتە سەر کە پێشتر بۆت دەکرا) با من بمرم سەگ بەگووەوە ئەتانبا:

لەم چەند دەربڕاوو پەندو ئیدیەمانەدا، مەبەستێکی جەوهەری هەیە، کاتێك سەرچاوەیەك هەیە نامێنێت، یان دەشێ سەرچاوەش نەبێت بەڵام خۆی بەسەرچاوە بخاتەڕوو، لێرەدا ئەم دەربڕاوانە دەشێ بەکەسێك یان زیاتر لەکەسێك بگوترێت، وشکردن= نەمان، نەمانیش بریتییە لە مردن، واتە کە مانگا دەمرێت ئیدی بەرهەمەکەشی دەوەستێت، کاتێك مرۆڤێکیش دەمرێت، ئیدی زۆرشت لەگەڵ خۆی دەمرێنێت، زۆرکات کە وەسیەت دەکرێت بۆ ئەوەی پاش خۆیان هەندێ شتی پێویست زیندوو ڕاگیرێ، نیگەرانییە وادەکات وەسیەت بکرێت، چونکە بۆ نموونە باوکێك هەیە دەزانێت بەمردنی بەشی کچەکەی دەخورێت لەلایەن براکانییەوە بۆیە وەسیەت دەکات بەشی نەخورێت،(چونکە مانی باوکەکە هۆکارە بۆ ئەوەی ئەو غەدرە روونەدات، واتە سەرچاوەی سۆزەکە لەویا باوکەکەیە).

هەروەك دەشێ (ئەو باوکەت مرد) دەرخستنی دەسەڵاتو توانای خۆ بێت لەبەرانبەر بەرانبەردا، واتە تۆ بزانە ئیدی بێدەسەڵاتی. یان دەشێ وەك تانەدان بگوترێت(کە ئەمە ئاوازەکەی پێمان دەڵێت)، کاتێك کوڕێك زۆر بەقسەی دەکرێت، کتوپڕ ئەو بەقسەکردنەی لێدەسەنرێتەوە وەك هەڕەشە یان وەك تانە یان وەك ئامۆژگاریو گرتنەوە لەکاری خراپە... ئەم دەربڕاوە بەپێی دەوروبەرەکان ئەم واتا جیاوازانەی دەدرێتی، وەك دەزانرێت باوك پشتیوانی منداڵەکانییەتی و بەخێوکەریانە، ژیانیانی ڕادەگرێت(مردنی باوك هەتیوکەوتن بۆ منداڵ دێنێت، واتە بێ پشتیوانو بێ ناز دەبێت)، واتە جگەلەوەی دەشێت وەك نازکردن بەکاربێت هاوکات، دەشێ وەك نەمانی نازهەڵگرتنی منداڵ بێت لەلایەن باوکەوە. کاتێکیش دەگوترێت (با من بمرم سەگ ...) ئەوا کە من مردم ئیدی ئێوە(ئێوە دەوروبەر دیاری دەکات مەبەست کێیە)، دۆخی ژیانتان تێکدەچێت، واتە ئەوە منم ژیانی ئێوەم ڕاگرتووە، مردنی من ژیانی ئێوە تێکدەدات، یان ڕێگەیەکە بۆ ڕێگرتن لەوەی

(ئێوە) نەتوانن کارێك بکەن من نارەحەت بکات، لە گوێڕایەڵی مـن دەرچـن، (بامن بمرم ئەتانبینمە- لێرەدا ئەمەش گرنگە مردنو بینینەوە). واتا ئارامی ژیانتان بەندە بە ژیانو مانی منەوە گەر مـن نـەمام ژیانتـان وێـران دەبێـت، ئەوە منم ئێستا ڕێتان نیشاندەدەم گەر مـن نـەمام کـێ ڕێتـان نیشـاندەدات، واتە ئێوە خۆتان ئیرادەو توانای ئەوەتان نییە ژیانتـان بـەڕێوە ببـەن. ئەمـە زیاتر بەتەمەنەکان دەریدەبڕن، خۆ دەشبێ بەمەش لێکی بدەینەوە، بریتییـە لە جۆرێك نازکردن بەسەر نەوەکانیدا(بـەوەی ئـەوان بڵـێن خـوا نـەکات، خـوا سێبەری تـۆ بەسـەر سـەرمانەوە بهێڵێـت). هاوکـات دەشـێ وەك جۆرێـك لـە هەڕەشەکردنیش بگرێتەوە. لەڕاستیدا لە دەروبەری کۆمەڵایەتیدا زۆر دەربڕاو لەسـەر مـردن دەوترێـت یـان بـۆ نازکردنـە یـان بـۆ سوپاسـگوزارییە، یـان بـۆ دڵدانەوەیە، بۆ نموونە (بەس نییە کـەسو کـارت هەیـەو کـەمردی شـارەوانی ناتناژێـت- بشـمریت لـەناو کەسـوکارو وڵاتـی خۆتـدا بمریـت-بەسنییە لـە غەریبایـەتی نـەمرد) گرنگـی شـوێنی مـردنو کـاتی مـردنو ئاواتخواسـتن بـۆ چۆنییەتی مردن، ڕازیبوون بـەمردن بـەو مەرجانـە، خۆشـبەختیە بـەو جـۆرە بمریت، چونکە مردن خۆی ناخۆشە بەتایبـەت لەشـوێنی کـە کەسـێك نـەبێت ئاخو شیوەنت بۆ بکات(چونکە بەڕاستی کورد حەزدەکات بەگشتی شـیوەنی بۆ بکرێت).

- تۆبەی گورگ مەرگە:

مەبەست ئەوەیە کە باوەڕ بەکەس مەکە چونکە مەگەر بەمەرگ ئـەو لـە فێڵو درۆکردن بکەوێت، گورگ وەك هێمایەك بۆ درۆزنیو هەڵخەڵەتێنـەر، کـە ڕاستگۆنییە، بەبەڵێن نییە. واتە توبەکردنی لەگەڵ مەرگدایە، ئەو تۆبە ناکات مەگەر مەرگ پێی بکات، چونکە مەرگ کۆتایی پێدێنێت، تا لەژیاندا بێت ئـەو تۆبە ناکـات، ئامادەنییـە لـە هەڵـەکردن وازبێنێـتو دان بەهەڵەکەیدا بنێـت. هاوکات ئەمە مرۆڤ بەکاریدێنێت بۆ ئەوەی متمانە بەکەسی خراپو بـێ بـەڵێن

نەکرێت، یان ناکرێت کەسی خراپ باشبێت یان متمانە بەکەسی خراپ مەکە، وە مردن کە کۆتاییهێنەرە بەشتەکان بۆیە مەرگ هێنراوە بەوەی بەهیچ جۆرێ بڕوا نەکەیت، چونکە هەڵدەخەڵەتێیت. هاوکات مەرگ تۆبەمان پێدەکات، یان بەچەشنێك مەرگ دەمانترسێنێت(ترسێنەرە)، یان مەرگ زاڵە.

- هەمومان مردنێك قەرزارین:

ئەم دەربڕاوە دەکرێت زیاد لە خوێندنەوەیەکی بۆ بکرێت، بەپێی ڕوانگە جیاوازەکان. با لەخودی زمانەوە دەستپێبکەین. هەموومان قەرزارین، چی قەرزارین، مردنێك. واتە بە کۆ(هەموومان+قەرزارین)، تاکێك بەناوی کۆوە قسەدەکات، بەڵام بۆ هەریەکێك لەو کۆیە مردنێك(نەك دووان) هەیە، کە دەبێت بمرن(وەك قەرزێکە دەبێت بدرێتەوە). بەڵام قەرزەکە چییە، ئەوە نەخراوەتە ڕوو تەنیا دانەوەی قەرزەکە هەیە(دەشێ خۆمان ئەوەی لێ بخوێنینەوە، کە ژیانمان قەرز کردووە- بەمردن دەیدەینەوە، وەك بڵێی بەهای ژیان = بێت بە مردن). هاوکات کاتو شوێنی دانەوەی ئەو قەرزەو بەکێ ئەدرێتەوە دیار نییە(واتە کاتێکی نادیاریکراو هەیە بۆ دانەوەی قەرزەکە، دەشێ ئێستا یان ئاییندە بێت). بەڵام گەر لێکدانەوەی دەرەوەی زمان بکەینو دەربڕاوەکە پەیوەست بکەین بە کولتووری ئایینی کورد ئەوا ئەو لێڵیە دەڕەوێتەوە. چونکە لە قورئاندا ئامازەی بەمجۆرە تیایە[٨٤]. هەروەك دەشێ ئەوەش بڵێین کە ئەو قەرزە میتافۆرێکە.

لەلایەکی دییەوە بۆ دەبێ قەرز بکەین؟ ئایا مرۆڤ بۆ ئەوەی بێتە ژیانەوە دەبێت قەرز بکات؟ ئایا قەرز لە چ کاتێکدا دەکرێت؟ لە کاتی پێویستیدا قەرز دەکرێت، ئایا مرۆڤ پێویستی بەو قەرزەیە یان ژیان پێویستییەتی بۆ ئەوەی بەردەوام بێت دەبێ بەردەوام خۆی قەرزار بکات؟ ئەوە ژیانە لەسەر بوونی ئێمە قەرز دەکاتو ناچاریشمان دەکات قەرزەکە بدەینەوە. ئایا من داوای قەرزم کردووە، یان وەك بوونگەرا بێ باوەڕەکان

دەڵێن فرێدراوینەتە بوونەوە. لێرەدا ئەوەش دەبێ بڵێین ئەوەی قەرزەکەی لێکراوەو دەشی درێتەوە بە پێی باوەڕی مرۆڤەکان دەگۆڕێت. واتە ئەوێکی موسڵمان دەزانێ قەرزەکەی دەداتەوە کێ، کەسێکی بێ باوەڕیش دەزانێ، بەڵام ئەوەی قەرزەکەی دەدەنەوەو لێیان کردووە جیاوازن، هەروەك دەشێ هەندێ قەرزەکەی بداتەوە بە نیشتیمان وەك خۆفیداکراوێك. بەڵام ئەم قەرزە ناچارانە دەبێ بدرێتەوە، ئەوەی دەگوترێ قەرزار قەرزاری نەکوشتووە، بێگومان قەرزار دەکوژرێ یان بەجۆرێ خۆشی بێ و ترشی بێ هەر دەبێ قەرزەکەی بداتەوە.

کەسی قەرزار بەردەوام نیگەرانە بۆ دانەوەی قەرزەکەی، کەسی بوونگەراش لەم دۆخەدا دەژی لە بوونیدا ڕووەو مەرگ. چونکە کۆتا ئەگەری بوونییەتی، کە ناچارانە نیگەرانی دەکات. بەڵام لە واقعدا دەبێ کەسەکە خاوەن متمانە بێت ئەوکات قەرزی دەدرێتێ، بەڵام لێرەدا هەموو مرۆڤەکان قەرزیان دراوەتێ، واتە متمانە بەهەموو مرۆڤەکان کراوە، دەشێ مرۆڤ لەبنەرەتەوە ڕاستگۆبوبێ، بۆیە قەرزی دراوەتێ، بەڵام لە واقعدا گۆڕابێ، یان دەشێ مەبەست ئەوەبێ، ئەم مرۆڤە کلیلی قاسەکەی لە گیرفانی خاوەن قەرزدایە ناتوانێ لێی هەڵبێ‌و بڵێت پارەم نییە بیدەمەوەو پاساوی درۆ بهێنێتەوە.

هاوکات بەگرنگی دەزانم، کە چەند شیکردنەوەیەکی تری فەلسەفیش بۆ ئەم دەربڕاوە بکەم، بەدیدی هایدیگەر مردن یەکێکە لەو ڕووداوانەی تەواو خودی دەبێتەوە، هەر تاکێك مردنی خۆی دەژی(٨٥) ئەم ئەزموونە ناکرێت گشتی بکرێت، بەڵام مرۆڤی ناڕەسەن، مردنی خۆی ناژی، واتە لەڕێگەی ئەوانیترەوە دەزانێت، کە مردنێك هەیە، ئەزموونەکەی ئەزموونێکی خودی نابێت، لەم دەربڕاوەشدا ئەوە دەبینین کە بە کۆ دەربڕاوە، وە هەموان ڕێکەوتون لەسەری کە مردن بەمجۆرەیە، نەك ئەوەی مردن بەشێك بێت

لەخودی تاك خۆی، واتە من كە دێمە بوون مردنیش لەگەڵ خۆم دێنمە بوون، نەك مردن شتێك بێت لەدەرەوەی من، چونكە لەم دەربڕاوەدا هەست بەمە دەكرێت. هاوكات مردن كۆتاییهێنەرە واتە چونكە دوا هەڵبژاردنی ناچارانەی منە، دوا ئەگەری منە، كۆتاییهێنەری سەرجەم ئەگەرەكانی ترە، ئەم ئەگەرە ناكرێت جێبەجێنەكرێت، چونكە دەكرێت مرۆڤ قەرزار بێت و نەیداتەوەو خۆی لەخاوەن قەرز بدزێتەوە، بەڵام ناكرێت خۆ لەمردن بشارێتەوە، ناتوانین مردن هەڵخەڵەتێنین، چونكە مردن ژیانی هەڵخەڵەتاندووە باشتر بڵێم من كە دەژیم ناچارم بەمردن، چونكە هەر ئەوەی كە دەژیم مردنم لەگەڵ خۆم هێناوەتە ژیانمەوە، واتە مردن دابڕاو نییە لە من بەڵكو هەر خودی من خۆیەتی.

هەروەك چیرۆكێكی (عەتا محمەد) هەیە بەناوی "تامی مەرگ"كە كیمیاگەرێك دەیەوێت مردن هەڵخەڵەتێنێت، میوانداری مردن دەكات، دەبینێ مردن لەشێوەی خۆیدایە، دوو جام ئاوی ترێ دەهێنێ، جامەكەی مەرگ ژەهری تێكردووە، بەڵام كە مەرگ ژەهرەكەی خواردەوە كیمیاگەرەكە هەستیكرد تامی ژەهرەكە لەگەروی خۆیدایە، جامەكەی لەدەستدەكەوێت و لەمردن دەڕوانێ مردنیش پێی دەڵێت كە ژەهرەكەت كردە ناو شەربەتەكەوە دەبوایە بتزانیایە مردن وا لەناو خۆتدایە.[٨٦] ئەم چیرۆكە ئەوە دەهێنێت لێكۆڵینەوەیەكی تایبەتی لەسەر بكرێت، ئایا دەكرێت باس لەمەرگی مەرگ بكەین.؟ ئێمە بێدەسەلاتین بەرانبەر بە مەرگ ئەم بێدەسەلاتیەش بۆ زۆر كەس ئازار دەرە. لەو چیرۆكەدا كیمیاگەر و مەرگ ئاوێنەن بۆ یەكتری مرۆڤ كەی گەیشتە ئەوەی مەرگ لەناو خۆیدا ببینێتەوە ببێتە ئەو ئاوێنەیەی كە مەرگ خۆی تیا دەردەخات و وێنەی مەرگ دەبینین ئەوكات مردن ئەو وێنە ناشرینەی نابێت چونكە ناشرینی مەرگ ناشرینی خودی خۆمانە، ترس لەمەرگ ترسە لەخود...ئەوانەی خۆیان نەدۆزیوەتەوەو خۆیان نەناسیوە

بەتـەواوەتی، بێگومـان تـرس‌و ئـازار، ناشـرینی مـەرگ لایـان میـوانێکی هەمیشەیی بێزارکەرە، بەڵام ناسینی خۆمان هـەموو ئەوانـە ناهێڵێت چـونکە ئەوکات دەزانین مەرگ چییە. واتە ناسینی خود ناسینی مەرگیشە. ئەو وێنـە قێـزەون‌و بیـزراوەی هەمانـە بـۆ مـەرگ ڕەشـەبا دەبیـات. ئـەو چـیرۆکە گرنگیەکەی لەوەدایـە کـە مـرۆڤ جـەنگێکی بێهودەدەکـات لەگـەڵ مـەرگ کـە هەمیشە دەدۆڕێت چونکە ئەو جەنگەی دەیکات جگەلـەوەی وەك ئـەوە وایـە جەنگ لەگەڵ خۆی بکات هاوکات لەخۆناسیەوە نەهاتووە.

بەواتایـەکی تـر مـرۆڤ هەمیشـە لـەخۆی هەڵدێ چـون خـۆی نەناسـیوە خۆنەناسین یەکسانە بە دۆڕاندن، ئەو کیمیاگەرە کە لەمەرگ هەڵدێ بەجۆرێك لەخۆی هەڵدێ، چونکە گەر خۆی ناسیبا دەیزانـی مـەرگ‌و خـۆی دوانەیـەکی لێکدانەبڕاون، مـادام مـن هـەم کەواتـە مـن دەمـرم چـونکە مـەرگ نزیکترینـە لێمـەوە وەك چـۆن ئێمـە تائێسـتا نهێنییـەکانی بوونمـان کەشـفنەکردووە ئەوهاش نەمانتوانیوە نهێنییەکانی مەرگ پەی بێبەرین. دنیـای کـەتوار(واقع) و ژیـانی بـاوو کـوێری کـردوین، فێربـووین کـە ژیـان دژی مردنـە، بـەڵام ئـەم دژیەکیـە دەسـتکردی خۆمانـە. چـونکە ژیـان گـەر مـردن ناتـەواو دەبێـت هاوکێشەیەکی ناتـەواودەبێت. ئـەو کیمیاگـەرە کـە مـردن بەبەشـێك لـەخۆی نابینێت ئیدی وەك هـەموو مرۆڤـەکانی دی لـەمردن هەڵدێ‌و مـردن بەخراپـە دەزانێت، بەڵام کاتێ مردن بووە بەشێك لە بوونی خۆمان، ئەوکات ئەو ترسە نامێنێ، مرۆڤ کە دێتە ژیانەوە مردن لەگـەڵ خـۆی دێنێـت، واتـە دۆسـتایەتی من‌و مردن لەسـەرەتایی سـەرەتاوە دەسـتی پێکـردووە هـیچ شـتێ هێنـدەی مـردن لـێم نزیـك نییـە. چـەند ژیـان لـێم نزیکـە هێنـدەش مـردن، بۆیـە کیمیاگەرەکە کـە سـەیری مردنـی دەکـرد وایـدەزانی سـەیری خـۆی دەکـات، سنوورێك لـەنێوان کیمیاگـەرو مـردن نـەماوە، وەك لـەکوردەواری دەگوترێـت ڕەنگی یەك نەگرن خوی یەکدەگرن، کیمیاگەرو مردن ڕەنگی یـەکیان گرتـوە

لەو چیرۆکەدا ناتوانرێت جیا بکرێنەوە، چونکە پەیامی مەرگ ئەوە بووە بۆ کیمیاگەرەکە پێی بڵێت مەرگ لەناوخۆتدایە دەبوایە ئەوەت بزانیبا، کاتێك مەرگ لەناو خۆماندا بێت ئیدی ناتوانین دەری بکەین، وەك چۆن ڕۆح لەناو جەستەماندایە یان خوێن بەنێو دەمارەکانماندا دەڕوات ئەواش مردن لەهەناسەو دەمارو خوێنماندایە، هەربۆیە ئەزموونی خوێندنەوەم ئەوەی پێگوتوم بەدەگمەن مرۆڤ گەلێکم ناسیوە لە ڕێگەی خوێندنەوە، کە خۆیان ناسیبێ و لە مردن ترسابێتن، لەسوکراتەوە بیگرە بۆ کریشیاناو هایدیگەرو... هەتاوەکو عارفان ... چونکە ئەوەی خۆناس بێت توانیویەتی مردن‌و خۆی وەك ئاوێنەیەك بۆ یەکدی ببینێت، کە ئاوێنەی یەکدین، ناکرێ لەیکدی جیاکرێنەوە.

لەو چیرۆکەدا کیمیاگەر چەند بەژیان خۆی دادەپۆشێت چەند خۆی ون دەکات بەڵام ناتوانێت لەمردن هەڵێ، چون مرۆڤ ناتوانێت لەخۆی هەڵێت، وەك چۆن مرۆڤ شێوەی زۆرە ئەواش مردن شێوەی زۆرە، گەر لەخۆمان بڕوانین ڕۆژانە بەپێی شوێنەکان کەسایەتیمان دەگۆڕین، لەگەڵ هەر شوێن‌و پێگەو پەیوەندیەکماندا ڕەفتارو گوفتارمان دەگۆڕێت، هێندەی فۆرم گۆڕینەکانی مرۆڤ مردنیش شێوەی هەیە، هەرجارەو لەبەرگێکدا دێت، کەس نازانێت جارێ لەبەرگی ئۆتۆمبێلێکدا جارێ لەبەرگی بەردێکدا، جارێ لەبەرگی میوانێکی کتوپڕ یان میوانێکی خۆشەویست، یان گەمەیەکدا بەرگەکانی مردن زۆرن، لەبەرئەوە چەند بتوێینەوە لەنێو ژیاندا هێندەش لەنێو مەرگدا دەتوێینەوە، ناتوانین ژیان بکەینە دەمامکێك بۆ ئەوەی لەمردن خۆمان بشارینەوە، چون مردن دێتە هەناوی ژیانمانەوە، وەك چۆن مردن لەنێو خودی خۆماندایە ئەواش ژیان لەنێوماندایە، ئایا پەیوەندیەك لەنێوان ژیان‌و مردندا هەیە بەوەی کە مردن ڕوخسەت لە ژیان بخوازێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی، یان بێ مۆڵەت کردەکانی خۆی دەکات، نقومبوون

لەنێو ژیاندا دادی فریادبوون لەمەرگ مسۆگەر ناکات، چونکە ئەوەی هەیە و دیارە ئەوە ژیانە بەردەوام دۆڕاوە بەرانبەر بەمەرگ، مەرگ براوە بووە، ئێمەی مرۆڤیش کە لەنێوان ژیانو مردنداین ناتوانین بێلایەن بین، بەڵام هەمیشە دۆڕاویشین، چونکە وەك چۆن ژیان زاڵە بەسەرمانداو ناتوانین ڕێگر بین لەوەی نەبیەنە ئەم ژیانەوە ئاواش ناتوانین ژیان بەردەوامکەینو مردن بووەستێنین، لەبەرئەوە دۆڕاو مرۆڤ خۆیەتی، بەڵام چارەکردنی ئەم دۆڕاندنە بەوە دەبێت خۆ بناسین، هەرکات خۆمان ناسی گرفتی دۆڕاندن بەژیانو مردن چارەدەبێت، تا ئەژین خۆش دەژینو ڕەسەنانە دەژین، کەمردیشین هەر ڕەسەنانە دەمرین، بیزو قێزمان لە ژیانو مردن نایەتەوە چونکە بێزهاتنەوە لەهەرکامیان بێزهاتنەوەیە لەخۆمان.

گەر بگەڕێینەوە بۆ دەربڕاوەکە، لەم دەربڕاوەدا ڕوانینەکە بۆ مردن سەیرکردنی مردنە وەك بابەتێك(کاڵایەك). بەڵام گەر لێکدانەوەیەکی تر بکەین ئەوا دەڵێین لەم دەربڕاوەدا هەستکردن بە بەرپرسیاریەت هەیە، ڕەوشت هەیە، کاتێك من قەرزاربم و نکوڵی لەو قەرزە نەکەمو ئامادەبم ئەو قەرزە بگێڕمەوە هەستکردنە بە بەرپرسیاریەتو ڕەوشتی من دەردەخات کە ئامادەم ئەو قەرزە بگێڕمەوە. بەڵام دەشێ بڵێین دواجار قەرزاری مردنین ناتوانین لێی هەڵبێین بۆیە بەمجۆرە خۆبەدەستەوە دەدەین، دەنا لەمێژە مرۆڤ هەوڵیداوە لە مردن هەڵبێتو بەدوای نەمریدا وێڵ بووە، بەڵام هەوڵەکەی بێ ئاکام بووە هەربۆیە بەکاریگەری ئاینو ئەو ئەزموونە لەمێژینەیە ناچاریی وادەکات بەمجۆرە ئامادەبین قەرزەکە بدەینەوە. لەلایەکی ترەوە دەشێ ئەم دەربڕاوە بەپێی دەوروبەری جیاواز لێکدانەوەی بۆ بکەین من دوو دەوروبەر دەهێنمەوە، یەکیان کە بەپێی ئەو دەوروبەرە ماناکەی سوودبەخشو دڵدانەوەیە بۆ کەسی مردوو واتە پاش مردنی کەسەکە، ئەو دەربڕاوە دەردەبڕێت بۆ ئەوەی ئەو خەمە گرانەی کەسوکاری مردووەکە بڕەوێنێتەوە،

یان هاوبەشیکردنی خەمی کەسوکاری مردووەکەیە. بەڵام هەر ئەم دەربڕاوە دەشێ وەك ئامۆژگاری یان وەك سوککردنی باری دەروونی یان بەپێچەوانەوە بە کەسێك بگوترێت.

کاتێك سەردانی نەخۆش دەکرێت، ئەو نەخۆشە لە حاڵێکی زۆر خراپدایە و لەمردن نزیکبۆتەوە(سەرەمەرگ)، سەردانکەر بۆ ئاسانکردنی باری کەسی نەخۆش(باری دەروونی)ئەوە دەڵێت، بەڵام ڕەچاوی هاریکاری ناکات، واتە ئەو کەسە بنەمای هاریکاری پێشکەشدەکات کە چۆنییەتی گوتن یەکێکە لەبنەماکان(٨٧) چونکە ئەم کەسە هێشتا دەژی بەڵام ئەم سەردانکەرە بەم دەربڕاوەی بێ ئومێدی دەکات، مامۆستایەکی خۆم کە ناتەندروست بوو پێیوتم کە وایان ئەوت ئەوەندە لەسەر دڵم گرانبوو، واتە گەر قسەکەر بەمەبەستی باشە وتنەکەی وتبێت ئەوا پێچەوانەکەی کەوتووەتەوە لەو دۆخەدا. یەکێکی دی لەخوێندنەوەکانم بۆ ئەم دەربڕاوە، کە دەشێ ڕۆح بکاتەوە بەبەر ئەو خوێندنەوە نەرێنییەی، کە گوتم ئەمە نارەسەنەکان بەو جۆرە بیردەکەنەوە، دەشێ ئەوەبێت، کە هایدیگەری فەیلەسووف لەکتێبی بوون و کاتدا باسی دەکات. ئەوەی هێشتا نەبووە، واتە دازاین بەکەمیەوە دێتە بوون، دەبێت خۆی پڕبکاتەوە. وەك چۆن هایدیگەر نموونەی میوە دەهێنێتەوە کە هێشتا پێنەگەیشتووە، واتە پڕنەبووە، نەگەیشتوە بەتەواوکۆیی. دازاینیش ئەگەری لەبەردەمدایە تا لەجیهاندایە، ناتەواوە دەبێت خۆی تەواوکات، هەرچەند خۆشی تەواو نەکات، هەر دەمرێت، بەڵام بە هەڵبژاردن و ئەگەرەکانی بوونی تەواو دەکات، پەیوەست بەدانەوەی قەرزەکە، من قەرزارم هێشتا قەرزەکەم نەداوەتەوە، هێشتا ئەگەرەکانم پڕنەکردۆتەوە، هێشتا تەواوی پارەکانم کۆ نەکردۆتەوە تا قەرزەکەی پێبدەمەوە، بەڵام دڵنیام دەبێ ئەو قەرزە بدەمەوە، لێرەدا بەبۆچوونی من ئەوەی قەرزەکەی بەدروستی بداتەوە مرۆڤی ڕەسەنە، بەڵام ئەوەی خۆی

پڕنەکردۆتەوە بە ئەگەرەکان، پارەکانی کۆنەکردۆتەوە تا خۆی پڕبکاتەوە، واتە قەرزەکانی پێ بداتەوە نارەسەنە. هەروەك هایدیگەر دەڵێت زۆرینەی دازاین بەناتەواویەوە واتە کۆی قەرزکەی نەداتەوەو کۆتایی هاتووە. واتە کێشەی دانەوەی قەرزەکە لای دازاین کێشەیە، بەدانەوەی قەرزەکە کێشەکە بەکۆتا دەگات، ڕوونتر بڵێم زۆرینە ئەوانەن، کە بەتەواوی پارەکەیان کۆنەکردۆتەوە، ناتەواون و بە کۆتا دەگەن، چونکە وەك هایدیگەر دەڵێت مەرج نییە کۆتایهێنان تەواو بوون بێ، بەڵکو شێوازێکی کۆتایهاتنە، دەشێ من کۆتایم هاتبێ بەڵام بە ناتەواوی، بەڵام خۆ دەشبێ کۆتایم هاتبێ بەتەواوی. وەك چۆن بوون بۆ دازاین کێشەیە بەهەمانشێوە قەرزدانەوەکەش کێشەیە، تا من قەرزەکە نەدەمەوە بوون بۆ من پرسیارو کێشەیە بەس کەمردم (قەرزەکەم دایەوە) ئیدی بوون لەکێشەو پرسین دەردەچێت. بە بوونی دازاین پرسیار لەبوون دەکرێ، کە دازاین لێرە نەبوو ئیدی کێ پرسیار بکات؟ چونکە جگە لەدازاین هیچ هەبوویەکی دی نییە لەبوون بپرسێت.

- مردن بە دەوڵەمەندیو هەژاری نییە:

(دەوڵەمەند گەر بەهۆی سەروەتەکەیەوە دەتوانێت زۆر شت بکات بەس لەبەرانبەر مردن بێدەسەڵاتە و مردنیش بۆ هەموو کەسێکە بەیەکسانی)، لێرەدا مردن وەك ڕووداوێکی باش لێیدەڕوانرێت، نەك خودی مردن، بەڵکو خاسیەتێکی مردن کە بۆ هەموو کەسێکە، واتە دادپەروەریەکی ڕەهای هەیە(لێرەدا شوێنی ئەوە نییە، دەنا باسی ئەوەم دەکرد کەزۆر خاسیەت هەیە مردنو خوا بەیەکدی دەچوێنێ، یان زۆر خاسیەتی هاوبەشیان لەنێواندایە.کە ئەمە خاسیەتێکە، ڕەهاییەکەیو بێ پرسیارکردنەکەیو... خاسیەتی هاوبەشیانە. وایبۆدەچین سەرچاوەی ئەم پەندە بگەڕێتەوە بۆ قورئان(بگەڕێوە بۆ بەشی یەکەم مردن لە ئاییندا). لەم دەربڕاوەدا کە بەتایبەت ڕەنگە کەسانی هەژار ئەمە بڵێن، بەهۆی زوڵمی دەوڵەمەندان

لەهەژاران بەمە خۆشحاڵن کە مردن بەیەکچاو سەیری هەموویان دەکات، واتە دەوڵەمەند بێدەسەڵاتە لەئاست مردن، ناتوانێت مردن ببەزێنێت، دەشێ لەدۆخێکدا ئەمە بگوترێت کە کەسێکی دەوڵەمەند دەمرێت خەڵك بەلایەوە سەیرە کە مردووە یەکێك ئەمە دەڵێت کە سەیر نەبێت لات(واتە وەك وەلامێك).

- دەمریت بۆ کێی کۆ دەکەیتەوە؟:

لەم دەربڕاوەدا کە چەشنی گفتوگۆی هەیە، یان دەشێ وەك گاڵتەکردنێك بەکەسێکی نزیك بگوترێت، هاوکات دەشێ وەك تانەدان بێت، جگەلەوەی مەبەستە بنەڕەتیەکەی ڕەنگە ئاگادارکردنەوەیەك بێت، بۆ کەسی بەرانبەر، کە زۆر زیادەڕەوی دەکات لەژیانـدا بەجۆرێك بۆ ماڵی دنیا ماڵی ئەودنیای لەیادکردووە، یان مردنی لەیادکردووە، واتە کە مردن هەبوو ئیدی پێویست ناکات هێند خۆمان ماندو بکەین، یان بەڕێگەی نادروست سەروەت پێکەوە بنێین. هاوکات بە (دەمریت) دەستی پێکردووە کە وشە کاریگەرەکەی خراوتە سەرەتاوە، واتە وشە مەبەست(وەك لەرستەی باسمەندیدا ئەمە هێمایە بۆ هێنانە پێشەوەی هەر وشەیەك زەقکردنەوەو تۆخکردنەوەیەتی) هاوکات دەشێ ئەم دەربڕاوە بەمجۆرە بێت(بۆ کێی کۆ دەکەیتەوە دەمریت؟) واتە پرسیارکردنەکە یان کەسەکە مەبەستە زیاتر لەمشێوە ڕیزکردنەدا. واتە تۆ ئەو کەسەی کە هەر سەروەت کۆدەکەیتەوە ئاگات لەخۆت بێت دەمریت، بیربکەوە یارمەتی هەژاران بدە چونکە دواجار هەر دەمریت، سەروەتو سامان فریات ناکەوێت بۆ ئەو دنیا. ئەم دەربڕاوە واتای پەلاماردان یان ژیانویستی تیایە، بەڵام بەشێوەیەکی نارەوا، واتە ڕەددراوەتەوە کە بەمجۆرە بەژیانەوە وابەستە بیت، بۆیە مردن وەك زەنگی ئاگادارکردنەوە بەکارهێنراوە، چونکە مردن هەموو شتێکمان لێدەسێنێت، وە هیچ شتێك فریامان ناکەوێت لە مردندا. بۆیە واتای سیمانتیکی - پرسیارێکە

ئاڕاستەی کەسێك دەکرێت، کە کۆکەرەوەیە(بەڵام چی کۆدەکاتەوە نازانین، هاوکات پرسیار هەیە لەوەی کۆکردنەوەکەت بۆ کێیە، جگەلەوەی هەواڵی تیایە(دەمریت) بەڵام واتای پراگماتیکی پێماندەڵێت کەچی کۆدەکاتەوە، هەروەك پێمان دەڵێت (ئەمریت) هەواڵپێدان نییە بەڵکو تانەدانە یان ئاگادارکردنەوەیەکە.

- گەر بمزانیایە هەر چی سەروەتم هەیە هەموویم دەخوارد(مردن هەڵخەڵەتێنەرە- تێکدەری بەرنامەیە- بەرنامەی ژیان تێکدەدات...)

مرۆڤ نەزانە بەرانبەر مردن، واتە ڕاستە کاتێك هەیە دەبێ مرۆڤ تیایدا بمرێت، بەڵام ئەم کاتە دیارینەکراوە(مەگەر خۆ کوشتن...)، کاتێك مرۆڤ ئەم نەزانییەی هەیە بەرانبەر بە ڕووداوێك کە هۆکارە بۆ تێکدانو لەناوبردنی هەموو خەونو ویستو ئاواتەکان، واتە مرۆڤ بەهۆی ئەم نەزانییەوە هەمیشە گریمانەی ئەوە دادەنێت (گەر بژیم- گەر نەمرم-تەمەن باقی بێت- تابمێنم...) ئەو کارەدەکات، واتە گەر مردن بوار بدات ئەو کارەدەکەم، واتە ئایندەی مرۆڤ نادیارە، بۆیە مرۆڤ لەبەردەم ئاییندەدا هەمیشە بەگریمانە خۆی تێدەپەڕێنێت چونکە مردن پرس بەمرۆڤ ناکات بۆ مردنەکەی، واتە هەر چرکەساتێك بیەوێت دێت، ئیدی ڕەچاوی ئەوە ناکات تا چەند تۆ ئێستا گونجاوە بۆ مردنەکەت، مردن لەدەرەوەی ئەمەیە. بەواتایەکی تر مردن ژیان بەهەموو خواستو ویستو هیواو بەرنامەکانەوە دەبات، چاوەڕێی ئەوە ناکات تۆ چیت ماوە بیکەیت لەم ژیانەدا، بۆیە (مردنی ناوەخت-جوانە مەرگ...) هەیە. لێرەدا دەسەڵاتی مردن دەرخراوە بەرانبەر بێدەسەڵاتی مرۆڤ، چونکە ئەو دەسەڵاتی ڕەهای هەیە، بێ پرس، بێ هۆ دێت خۆی دەسەپێنێت. (تا ماوم فلان ببینم ئەوکات بشمرم ئیسراحەت دەکەم-ئەترسم نەگەم فلان ببینمەوە) نەگەم واتە (بمرم). ترس لەوەی بمرین و خۆشەویستەکەمان(کوڕ-کچ...) نەبینینەوە. دایك زۆر ئەمە دەڵێت لەکاتێکدا

بیری منداڵە یان دۆستە غەریبەکەی دەکات، لەمێژە چاوەڕوانی دیتنییەتی ترسی هەیە مەرگ نەهێڵێت ببینێت(بۆ دوایینجار). گەر ئەوە ڕوویدات ببینێت ئەوکات مردنەکەی ناخۆشنابێت (دەحەسێتەوە لەگۆڕەکەشدا)، واتە بێخەم دەمرێت، بەخەمەوە نامرێت (بەراوردیبکە بە سەفەرکردن بەخەمو قەهرەوە)، لەزۆرینەی کاتدا ئەم مەرجدانانە بۆ مردنی خود، بەگریمانەو خۆزگەیە چون ئەو هۆشیاریە هەیە کە بێدەسەڵاتی هەیە بەرانبەر بە قەدەرو مردن، واتە لێرەدا مەرج هەیە لەنێوان تکاو نزاو هیواو ویستدا نەك وەك فرماندان، چون دەزانرێت کە مردن فەرمانی بەسەردا ناکرێت.

- نوێژ بۆ مردوو:

نوێژکردن جێبەجێکردنی ئەرکێکە لەسەر ئیمانداران، چونکە یەکێکە لەڕوکنەکانی ئیمان. کردنی نوێژ بۆ مردوو پێویستیەکە کە ئایین داوایکردووە.

- خۆزگە بمردمایەو بەوجۆرە نەمبینیایە- ئاواز(ئەو کەسەی بینیم لەو دۆخەدا، زۆر ناخۆشبوو قەت چاوەڕێم نەدەکرد ئەو کەس وابێت- ئەو کوڕە چوارشانەیە ئەوەندەی تۆزێکی مابووەوە- یان کەسێك کە خراپەیەکی لێدەبینیت و پێشتر ئەوەت ڕەچاو نەدەکرد لەو کەسە)

- مردن وەك زانیاریو وەك بەها: دوایی خۆی کتێبەکەی بڵاو بوویەوە(پاش مردنی):

زۆرکات وشەی مردن دێتە بەر دەممان لەکاتی خوێندنەوەدا کە هیچ هەستێکی تیا نییە، واتە وەك پێدانی زانیاری، یان وەك تاقیکردنەوە (لەپرسیاری تاقیکردنەوەدا فلان ساڵی چەند مردووە)، واتە کاتێك کەسێکی نووسەر یان زانایەك، شاعیرێك... مردووە باسی ژیانو مردنەکەی دەکرێت، لەم نووسینەدا بەدەگمەن دەنا تەنیا وەك پێدانی زانیاری پێویستیەك بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت ئەم کەسە ماوە یان نا، واتە ناسینی کەسەکە

پێویست دەكات، باسی ئەمە بكرێت، بەڵام مردنی سوكرات، لەنووسیندا زۆركات جیاوازتر لەپێدانی زانیاری دێت، وەك دەوترێت (مردنەكەشی فەلسەفی بوو) واتە مردنەكەشی لەپێناو حەقیقەتدا بوو، ئەم جۆرە وتنە لەسەر مردنی هۆكارێكە بۆ ئەوەی هەستی خوێنەر بجوولێت (بەجیاوازی لای خوێنەرەكان). یان كاتێك دەوترێت پاش خۆی ئەو بەرهەمەی بڵاوكرایەوە، دەشێ چەندین لێكدانەوە هەڵگرێ، بەوەی كە تا خۆی ژیا بەرهەمەكەی نەبینی بەچاپكراوی، ڕەنجی خۆی نەبینی، یان دەشێ هێما بێت بۆ دەسەڵاتێكی دیكتاتۆر كە ئەو نووسەرە نەیتوانیوە بەهۆی دڕەندەی دەسەڵاتو نەبوونی ئازادیەوە بەرهەمەكەی چاپبكات، چونكە دەسەڵاتێكی ڕێگر هەبووە. هەروەك دیاردەیەك هەیە لای زۆرێك لە میللەتان بەتایبەت لای ئێمەش كە دەوترێت تا نەمریت قەدرت نازانرێت، بەوەی، كە پەیكەرت بۆ دروستناكرێت، واتە كەسێكی داهێنەر لەبوارێكدا كە ئەمە دەڵێت جیاوازە لە كەسێكی ئاسایی، مەبەستیش لە وتنی ئەمە زیاتر مردووپەرستیە.

مرۆڤ هەمیشە هەوڵیداوە مردنەكەشی مانادارو بەبەها بێت، واتە لەپێناو شتانێكدا بمرێت كە سەنگی هەبێت، "بە هەوانتە مردن" لەگەڵ مردن لەپێناو حەقیقەتدا، لەپێناو میللەتدا(ئەوانیتردا)، لەپێناو بەختەوەریدا، لەپێناو ئازادیدا... زۆر جیاوازن لەو مردنانەی كە مردنن لەپێناو هیچدا، واتە هەمیشە ئەو جۆرەی مردن كە لە پێناو بەهایەكدایە نەمری بەمانا ڕەمزیەكەی دەهێڵێتەوە بۆ كەسی مردوو. بەڵام مردنێك كە بەهای نەبێت دەشێ تەنیا لەچوارچێوەیەكی بەرتەسكدا یادبكرێتەوە، دەنا نابێتە یادێكی جیهانی. گەر بكرێت بەراوردنی مردنو كوشتنی ئەم مرۆڤانە بكرێت باشتر ئەم دۆخەمان بۆ یەكالا دەبێتەوە (سوكرات– غاندی– هیتلەر–سەدام) ئەمانەش لەگەڵ مردنی مرۆڤە ئاساییەكان. ئەو مرۆڤانەی كە مردنیان زیاتر بەهای هەیە، ئەوانەن كە لەپێناو بەهایەكدا دەمرن، واتە دەبەخشن، بەخشینو دانی مردن

لەپێناو بەهادایە، بەواتایەکی تر بەخشینی مردنە بەژیان، دەشێت ژیانی تاکەکەسێك بێت دەشێت ژیانی کۆی مرۆڤ بێت، ئەو کەسەی دەبەخشێت لەزۆرینەی کاتەکاندا هۆشیارانە ئەم بەخشینە ئەنجامدەدات، چونکە ئەمانج هەیە.

- عومری نووحت بێ هەر دەبێ بمریت (تەمەنی نووحت بێ دەبێ بمریت):

نووح یەکێکە لە پەیامبەرەکان، ئەم پەیامبەرە بەپێی سەرچاوە ئایینییەکان یەکێك بووە لەو مرۆڤانەی(پەیامبەرانەی کە تەمەنی درێژ بووە)، هەموو پەیامبەرێك چەندین خاسیەتی هەیە(یان پەیامبەرەکان پەرجوویان(موعجیزە) هەبووە تەمەن درێژی نووحیش یەکێك بووە لە پەرجووەکان)، یەکێك لەوخاسیەتانەی کە ئەم پەیامبەرە(نووح) پێی دەناسرێتەوە تەمەن درێژیەکەیەتی، کە ئەمە بووەتە هێمایەك بۆ ئامۆژگاری کردنی مرۆڤ، لەبەرئەوەی لەبیرکردنەوەی ئەفسانەیدا مرۆڤ بەدوای نەمریدا دەگەڕا، واتە هەوڵیدەدا کە نەفی مردن بکات، بەڵام کۆششەکەیان بێ ئاکام بوو، وەك بەڵگەیەك تەمەنی نووح دەهێنرێتەوە کە ئەو ٩٠٠ ساڵ ژیاوە بەڵام دواجار هەر مردووە، چونکە مرۆڤ دەبێت بمرێت، مردن ڕووداوێکە مرۆڤ ناتوانێت لێی هەڵێت، چونکە ئەوە مرۆڤ نییە کە کۆنترۆڵی مردن دەکات، بەڵکو ئەوە مردنە کۆنترۆڵی مرۆڤ دەکات، ئەم دەربڕاوەش(پەندەش) هێمایە بۆ ئەوەی لە ئایینەوە سەرچاوەی گرتوە، هێماشە بۆ ئەوەی کە پاش ئەفسانە هاتۆتە ناو بیرکردنەوەی مرۆڤ(بۆچوونیش هەیە ئەمەش بە ئەفسانە دادەنێت). جگەلەوەی پێماندەڵێت مرۆڤ لەتەمەنێکدا دەبێت بمرێت، واتە پەیوەندی کاتو مردن ڕەچاوکراوە لەم دەربڕاوەدا، دواجار تەمەن درێژی نووحیش وەك حەقیقەتو ئەفسانەیەك لێی ڕاماون، بەوەی کە ئەو تەمەنە درێژە هیچ مرۆڤێك ناتوانێت ئەوەندە بژی، ئەمە شکاندنی پێوانەیە، هاوکات

حەقیقەتە لەوەی مردن ڕەهایە، زۆرکات مەلای ئایینی یان کەسانی بەتەمەن‌و دیندار ئەمە دەڵێن وەك ئامۆژگاری یان وەك یادخستنەوەیەك بۆ ئەو کەسانەی کە بیر لەمردن ناکەنەوە، وەك ئەوەی بڵێیت نامرن، ئەوەندە باوەشیان کردووە بەژیاندا دەڵێی نامرن، بەڵام گەر وەك نووحیش ٩٠٠ساڵ بژیت هەر دەبێت بمریت.

-(گۆڕستان = ماڵی مردووان):

مردووەکانیش شوێنیان هەیە، کە بریتییە لە گۆڕستان، کە دەشێ گۆڕستان وەك ئاگادارکردنەوەی مرۆڤ بێت لەوەی کە دەمریت، دواجار هەموومان دەبێت بێینە ئەم شوێنە(چونکە دوا مەنزڵە).

- ئەجەل: ماوە، کات- ئاکام[٨٨]

ئەجەل دەکرێت بەپێی دەوروبەرەکان واتای جیاوازی هەبێت، واتە دەشێت پاش مردن بە کەسێك بگوترێت و دەشتوانرێت پێش مردن بگوترێت، پاش مردن دەوترێت(ئەجەلی هاتبوو هەردەبوو بمرێت)، پێش مردن (رۆڵە بۆ دەرۆیت ئەجەلت هاتووە)، هاوکات دەبێ بڵێم ئەجەل وەك لەواتای فەرهەنگیدا هاتووە کاتی مردن دەگرێتەوە(ئەجەلت هاتووە=کاتی مردنت هاتووە) یان چارەنوس‌و ئاکامی هەموو کەسێك دەگرێتەوە، واتە چارەنوس‌و ئاکامی هەمومان هەر مردنە. هەروەها ئەجەل بەکاردەهێنرێت وەك هەڕەشە(مەگەر ئەجەلت هاتووە). جگەلەوەی لەدەوروبەری تایبەتیدا وەك خستنە دۆخی تایبەتی کەسی بەرانبەر بەکاردێت، وەك بیەوێت کەسی بەرانبەر تووڕە بکات، یان کەسانی نێو ئەو بازنەیە بخاتە پێکەنین بەیەکێك لەکەسانی ناو بازنەکە دەڵێت یان ناڕاستەو خۆ بەمەبەست دەیەوێت بەکەسێکیان بڵێ(بەخوا ئەجەلی هاتووە...تۆ دەڵێی چی). واتای ئەجەل، دەشێ بڵێین وەك ئاسانکردنی مردنیش وایە(بەوەی هەر دەبوو بمرێت) کە بەکەسوکاری مردووەکە دەوترێت. لەپەندی پێشینانیشدا دەگوترێت (تا

ئەجەلەت نەیەت نامریت)[٨٩] هاوکات ئەمە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئایینی ئیسلام کە کاتی مردنی هەموو مرۆڤێك دیاریکراوە.

- پارەکەی لای من مراندوە[٩٠]

پەیوەندی خەوتن و مردن زۆرە، زۆرکات مردن وەك خەوتنێکی هەتاهەتایی، یان خەوتنێك هەڵنەسیتەوە، یان جۆرێکی مردن کە دوورە لە ئازار ئەویش لەکاتی خەوتندا بمریت. هاوکات ئەو کەسانەی مردن بە خراپ نابینن، یان ئەوەی پێی وایە مردن ئارامی و ئیسراحەتی دەداتێ، مردن و خەون دەچوێنێ بەیەك. ئەم پەیوەندیەمان بۆ ئەوە باسکرد تا ئەو جیاوازیە دەرخەین کە لەنێوان (پارەکەی لای من خەواندوە)لەگەڵ ئەوەی سەرەوەدا، چونکە بەپێی دیالێکتە جیاوازەکان هێماکان بۆ شتەکان و ڕووداوەکان...دەگۆڕێت. پارەکەی لای من(مراندوە) خەواندوە. واتای ئەوەیە پارەکەی لای من داناوە، ئەمەش لەکاتێکدا دەگوترێت کە من ئەمەوێ شتێ بکڕم لەوکاتەدا شتەکە بەردەست نییە، بەڵام من ئەمەوێ ئەو شتە بکەمە ماڵ پێشەکی دەدەم، یان پارەکە هەمووی دەدەم بۆ ئەوەی لەدەستم دەرنەچێت(واتە بریتییە لە جۆرێك متمانە دروستکردن لەڕێگەی مراندنی ئەو پارەیەوە)، جگەلەوەی کردنە ماڵی شتەکەیە. یاخود دەشێ لە دۆخێکی نا جۆردا بگوترێت، کاتێك کەسی سێیەم دێتە ناوەوە بۆ چارەی کێشەکە لەنێوان کەسی یەکەم و دووەمدا، پارەکە لای کەسی دووەم دەمرێنرێت، چونکە نەکەسی یەکەم نە دووەم متمانەیان بەیەکدی نییە، دیارە مراندنی ئەو پارەیەش لەبەرانبەر شتێکدایە، واتە بابەتێك هەیە کە ئەم پارە مراندنەی بۆ دەکرێت، مراندنی پارەش جێگیرکردن و لەکارخستنییەتی تا ئەوەی ئەو بابەتە یەکلای دەبێتەوە.

- مەرگ بۆ بەهانە دەگەڕێ:

بەپێی لۆژیك هەموو كردارێك ڕوئەدات هۆكارێكی هەیە، مردن وەك ڕووداوێك كاتێك ڕوئەدات بێ هۆكار روونادات، وەك چۆن هاتنە ژیانەوە هۆكارێكی هەیە، كردنی ئەم باسە هۆكاری هەیە كە لەسەر مردن دەنووسم لەسەر بابەتێكی تر نانوسم. لێرەدا بەهانە هۆكارە، بەلام ئەوەی گرنگە، پەلەیی مەرگە لێرەدا واتە مەرگ هێند پەلەیەتی هۆو بەهانەیەك ببینێتەوە ڕاستەوخۆ دێت، هاوكات مەرگ وەك كەسێك سەیردەكرێت(كەسێكی دڕندە) كە بەدوای بەهانەیەكی بچووكدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی بتكوژێت، یان كەسێكی تۆڵەسێن. هاوكات لەپشتی دەربڕاوەكەوە هەست بەدرندەیی‌و یان هەست بەتۆڵە دەكەین. هاوكات دەشێ وەك ئاگاداركردنەوەیەك بە كەسێك بگوترێت كە زۆر سەرەڕۆیە، كەسی بەرانبەر ئەمەی پێدەڵێت كە بەقسەی خۆم ناكەیت(یان خۆم ناتوانم كاریگەریت لەسەر دانێم) بزانم مردن دەتوانێت بتگەڕێنێتەوە لەو سەرەڕۆییە، واتە دەربڕاوەكە وەك هێزی مردن دەردەخرێت. هاوكات ڕەنگە هێماش بێت بۆ زۆری مردن یان بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردن، یان ئاسانبوونی مردن. جگەلەوەی مردن وەك بوونەوەرێكی زیندوو تەماشاكراوە، وەك چۆن كەسێك بەدوای بەهانەیەكدا دەگەڕێت بەرانبەر بەبەرانبەرەكە(دەشێ مەعشوق بێت بۆ عاشق، دەشێ ڕق بنەما بێت...) بووەستێت بۆ قسەكردن لەگەڵیدا یان بۆ لێدان‌و ئەزیەت پێگەیاندنی... واتە بەپێی دەوروبەری جیاواز چییەتی‌و چۆنییەتی بەهانەكە دەگۆڕێت. هاوكات دەشێ كەسێك لەشەردا بێت(پێشمەرگەكان) بەیەكدی ئەمە بڵێن كاتێك لەدۆخی غافڵبوون یان ئاگانەمان، خەیاڵ ڕۆشتن بن(بۆ كوێ ڕۆشتویت ئاگات لەخۆت بێت مەرگ لەبەهانەیەك دەگەڕێ)، واتە ڕەنگە دوژمن بێت بەم ماوە كورتە لەناوت بەرێت، واتە خەیاڵ ڕۆشتن‌و بێئاگاییەكەت هۆكار بێت بۆ ئەوەی دوژمن بتكوژێت.

- مەرگ بەجوانی و پیری نییە:

جیاوازینـەکردن لـەنێوان مردنـی گـەنج و پـیردا، وەك دەوتـرێ مـەرگ بەدوای بەهانەدا دەگەڕێت نەك جیاوازی گەنجوپیر. بەلام وەك ڕاستیەك دەبێ بلێین پیری نیشانەی نزیکبوونەوەیە لە مردن(لەگەنجی بۆ پیری لە پـیری بـۆ مردن) واتە ئەوە پیرەکانن کە مردن لێیان نزیکە یان لە مردن نزیکدەبنـەوە، بەلام ئەم دەربڕاوە دەیەوێ ئەوە ڕەدکاتەوە، سەیرە زۆر کەس مـەرج نییـە بەتەمەنیش بـن بـەلام هەسـت بەنزیکبوونـەوە دەکـەن لەمـەرگ، واتـە پـێش مردنیـان پێشـبینی مـەرگی خۆیـان دەکـەن. هاوکـات هەسـت دەکـەم ئەمـە لەدەمێکدا وتراوە کە ڕەنگە جـەنگ بووبێـت یـان ڕێکـەوت وایکردبێـت چـەند گەنجێك لەماوەیەکی کەمدا مردبن، وشەی جوانیش هێمایە بۆ گەنجێتی. ئـەم پەندە دەیەوێت کەمێك مردنی گەنجان ئاسانکات بەوەی کـە مـردن جیـاوازی ناکات لەنێوان هیچ کەسێکدا و مەرج نییە مردن تـەنیا بۆ بەتەمەنـەکان بێـت، ئەوە ئێمەین کە مردن بۆ پیرەکان دادەنێین لە گەنجانی دوردەخەینەوە، ئەم پەندە دەیەوێ لەو وەهمە بمانکاتە دەرێ کە دەلێین گەنج بوو کـاتی مردنـی نەهاتبوو. بەلام مردنی گەنج هەمیشە ئەسەف و قەهری زیاتر بەجێدەهێلێت وەك لە بەتەمەنەکان، چون مردنی ئەوان چاوەڕێ کراوە یان شتێکی ڕەهایە، بـەلام مردنـی لاوێـك حالـەتێکی تایبەتـە، هاوکـات لاوەکـە تـازە لەسـەرەتای ژیانیدایە، بەلام بەتەمەنەکە ژیـانی خـۆی کـردووە، هـەروەها ئـەوەی چـەکی ژیانی پێیە لاوەکانن. چەندین هۆکار هەن کە مردنـی گـەنج جیاوازدەکـەن لـە مردنی پیر، بۆ نموونە ناگوترێت *جوانەپیر. بـەلام جوانـە مـەرگ بـەکاردێت. واتە جیاوازینەکردن لە تەمەندا بۆ مردن، ئەوەی کاتی مردنی هـات دەمرێـت، ئیـدی لاوە بەتەمەنـە گـرنگ نییـە، ئـەو خـۆی دەسـەپێنێت ئێمـەش تـەنیا ڕازیبوونمان لەسەرە، چون ئێمە بێدەسەلاتین لەبەرانبەریدا. وەك چۆن مردن بەهەژاری و دەولەمەندی نییە ئاواش بە گـەنجی و پـیری نییـە، ئـەم ئاکـارەی مردن کە جیاوازی ناکـات لەهەنـدێ دۆخـدا (هـەژاران ڕەنگـە خۆشـحالبن کـە

جیاوازنین لەدەوڵەمەندان، یان کەسانی خاوەن دەسەڵات لە بێ دەسەڵات...)
بەڵام دەشێ جیاوازینەکردن لەنێوان لاوو پیردا ئەو خۆشحاڵیە دروستنەکات تەنانەت بۆ پیرەکانیش، واتە پیرەکانیش حەزنەکەن لاوەکان بمرن خۆیان بمێنن (ئەمە ڕێژەییە).

- مەرگ کە هات ناگەڕێتەوە[91]:

مردن کاتی خۆی هەیە، هەرکات هات ئیدی تەواو، واتە کاتێک مەرگ دێت، ئیدی ناتوانرێت بگەڕێنرێتەوە و خۆشی ناگەڕێتەوە، کاتێک ئێمە بەگومانین لەوەی مردن ئێستا یەت یان جارێ زووە، بەڵام ئەمانە جیاوازن لەوەی مردن خۆی دەیەوێت چونکە هەرکات مردن ویستی بێت دێت وە کە هات ناگەڕێتەوە، هیچ شتێ نییە ڕێگەی لێبگرێت. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەوە مردنە دێت، چونکە هەندێ دەربڕاومان هەیە بەپێچەوانەوە ئێمەبەرەو پیری مردن دەچین، یان ئێمە بۆلای مردن دەچین، بەڵام لێرەدا ئەوە مردنە دێت. واتە جیاوازی هەیە لەوەی کەسێك خۆی بەرەو پیری مردن بچێت لەوەی کە لەمردن هەڵێت یان مردن بێت بۆ لای، بچوکترین جیاوازی ڕەنگە لە ترسەوە بێت کەئەوەی خۆی بەرەو پیری مردن بچێت ترسی لەمردن کەمترە، یان لەمردن هەڵنایەت، وەك لەوەی مردن دەبێ بێت بۆ لای، واتە ئەم کەسە گەر بۆیبکرێت ئەوا دەیەوێت ڕاکات لەدەست مردن، تۆقیوە لەمردن. هاوکات ئەم دەربڕاوە پێمان دەڵێت مردن ڕاستگۆیەو هیچ هێزێك ناتوانێت ئەو دواخات، کەی کات هات بۆ ئەوەی بێت دێت، واتە هیچ هۆکارو بەهانەیەك نییە ڕێگەی لێگرێت لەو هاتنەی، ڕاستگۆی مردن لەمەدایە. هاوکات تا چەند مردن جێبەجێکاری فەرمانی خوایە یان ئەوە خۆیەتی بەمجۆرەیە؟

- مەرگ خەبەر ناکات[86]:

هەندێ کات مەرگ وەك میوانێك دەبینین، بەڵام ئەم میوانە پرسیار ناکات کە دێت، واتە کاتێك مەرگ دێت پرس ناکات، یان هەواڵت ناداتێ

لەهاتنی، دێت ئیدی ناپرسێ، یان مۆڵەت وەرناگرێ، ناڵێ ئێستا باشە بێم یان نا، بەڵکو ئەو دێت بێئەوەی چاوەڕوانی تۆ بکات کە ئایا ئێستا سەرقاڵی یان نا، کارت هەیە یان نا. ئامادەیی یان نا. ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر پێماندەڵێت ئێمە بێ ئاگاین بەرانبەر بە کاتی مردنی خۆمان، واتە ئێمە نازانین کەی دەمرین. بەڵام لێرەدا پرسیاری گرنگ ئەوەیە کە ئایا ئێمە لەناو کاتداین یان کات لەناو ئێمەدایە، واتە ئێمە بەسەربەخۆیی لەدەرەوەی کاتداین، یان ئەوە کاتە حوکمی ئێمەدەکات، چونکە لەهەندێ دەربڕاودا هەستبەوەدەکەین کاتیش ڕوویەکی تری مردن بێت.

جگەلەوە کردەی مردن وەك کردەکانی خوا وایە، کە پرس بەکەس ناکات، چونکە گەر پرس بکات ئەوە خوانییە، مردنیش گەر پرس بکات ئەوە مردن نییە[٩٣]. ئەگەرچی دەشتوانین جۆرێك لەتانەدان لە مەرگ ببینین بەوەی کە مرۆڤ بێدەسەڵاتە بەرامبەری، ئێمەش تانەی لێدەدەین کە دەبێت پرس بکات، هەرکات میوانێك بێت پێمانخۆشە پرسمان پێبکات تا خۆمان حازرکەین واتە لەناوەختدا نەیە، مردنیش هاتنەکەی بێ هەواڵپێدانە بۆیە دەگوترێت مردنی ناوەخت، کاتی مردنی نەبوو... وەك چۆن بێهەواڵپێدانیش زۆرکات میوانێکمان دێت دەڵێین بەخوا لەکاتی خۆیدا هاتی، بۆ "مەرگ"یش هەندێکات ئەمە دەڵێین، بەڵام هەندێجار بەپێچەوانەوە، ناوەختی هاتنی مەرگ بێزارکەرە، چونکە مردن دێت لەدەسەڵاتی ئێمە دەدات، لەژیانمان دەدات، ئەمەش بۆ هەندێك ناخۆشە(قەبووڵنەکراوە) بۆیە پرسیار نەکردنی مردن دەبێتە تووڕەبوونی .

- مردن لەکوێیت:

ئەم دەربڕاوە واتای سیمانتیکی بانگکردنە، بانگی مردن کراوە، هێمای پرسیاری بۆ دانانرێت لەبەرئەوەی زۆرکات وتنی ئەمە بۆ مەبەستێکە(کە دەوروبەرەکە مەبەستەکە دیاری دەکات) بەڵام لەکاتێکدا ئەم دەربڕاوە تەواو

دەكرێت بەوەی (مردن لەكوێیت ژیان كوشتمی)، لێرەدایە كە مەبەست هەم رووندەكاتەوە هەم لێڵی دەكات، واتە لەبەشی یەكەمدا پرسیار دەكات لە مردن بەبێ ئەوەی بزانین مردنی بۆچیە، یان ئایا مردن بانگدەكرێت؟ یان ئەوە ئێمەین واهەست دەكەین مردن گوێی لێمانە، یان مردن بەقسەی ئێمەدەكات...كە پێی دەڵێت لە كوێیت مەبەستی ئەوەنیە بەڕاستی شوێنی مردن بزانێت، بەڵكو مەبەستی ئەوەیە سەردانی ئەم بكات، واتە من لەدۆخێكدام ئەی مردن پێویستم بەتۆیە چونكە حەز بەم دۆخە ناكەم ئەوە تۆیت كە دەسەڵاتت هەیە من لەم دۆخە بهێنیتە دەرێ، یان دەشێ ڕووی دەمی لەبەرانبەر بێت بە تەعلیقەوە پێی بڵێ بۆ نامریت، (زۆركات لە دۆخی تەریقبوونەوەدا مردن بەكاردێت- تەریق نابیتەوە-نامریت). واتای "مردن لە كوێیت ژیان كوشتمی" زۆركات لە دۆخێكی گاڵتەجاڕدا دەوترێت واتە هەر بۆ زیاتر خۆشكردنی مەجلیسەكە، هاوكات دەشێ ئەوەشی لێهەڵێنجین كە ویستی مردن پێش ویستی ژیان دەكەوێت، ئەوە مردنە ڕەغبەتو بایەخی زیاترە تا ژیان، ئەوە داوایەكە لە مردن، كە بێتو پەردەی ژیانم لەسەر لادات، ئەوەی من دەمەوێت مردنە، بینینەوەی بوونی خودە لە مردندا نەك ژیاندا. لەلایەكی ترەوە دەشێ ئەوەش بڵێین كە كاتێك دەڵێت ژیان كوشتمی واتە ژیان بكوژە، واتە دەسەڵاتی كوشتنی هەیە، بەڵام من نامەوێت بكوژرێم دەمەوێت خۆم بمرم، مردن ئاسانترە لە كوشتن، هەروەك وەك واتای میتافۆر بەكارهێنراوە بۆیە بێئەندازە واتا هەڵدەگرێت یەكێك لەواتا زۆر نزیك وە دورەكانیش (چونكە واتای ئەم دەربڕاوە سركە بەپێی دەوروبەرو ئەوكەسەی دەیڵێتو ئەو دۆخەی تیای دەگوترێت، كەسی بەرانبەر واتا كەی دەگۆڕێت). بۆیە دەشێ واتای ئەوەی هەبێت كە ئەم ژیانە شایستەی ئەوەی نییە تیا بژیت، بۆیە مردن باشترە لە ژیان، سەختیو گرانی ژیان وایكردووە كە مردن سەنگین بێت، بۆیە بانگی مردن دەكرێت بێت بەهانای ژیانەوە، چونكە ژیان

لەقەیراندایە ئەوە مردنە کە لەم قەیرانە دەریدەکات. جگەلەوەی هاتنی مردن بردنی ژیانە، واتە تا ژیان هەبێت مردن لێرە نییە، بەهاتنی مردن ژیان لێرە نامێنێت (دیارە تایبەت بەمنەوە). جگەلەوەی دەسەڵاتی ژیان زاڵکراوە، کە ژیان منی کوشتووە، بەڵام کوشتنێکی تەواوەتی نا، بەڵکو کوشتنێك کە ئازاراویە، واتە تۆ ژیان ئازارت بۆم هەیە، ئەمەویٚ لەم ئازارو ناڕەحەتیە دەرچم، مردن هۆکارە بۆ ئەم دەرچوونە، یان مردن تاکە فریاد ڕەسێکە. ئەوەش گرنگە بڵێین بوونی مەرگ هۆکارە بۆ باشترکردنی ژیانمان چونکە گەر مەرگ نەبێت ژیان زاڵمو ستەمکار دەبوو، ئەم دوانەیە (ژیانو مەرگ) بڕێك هاوسەنگی بوونیان ڕاگرتوە، گەرچی هەندێك بۆچوون بەپێچەوانەی ئەمەوەیە، بەڵام ئەوە ڕاستیە، گەر ئێمە نەمرین، ئەی مرۆڤەکانی دی چۆن دەژین، واتە ژیان بریتییە لە ئاڵوگۆڕ ئێمە بەشی خۆمان دەژین، مرۆڤگەلێکیش سەرەیان گرتوە بێنە ژیانەوە دەبیٚ ئێمە ڕێگەیان بدەین، بۆیان بەجێبهێڵین، تا ئەوانیش بێن. بۆیە بەبیٚ مەرگ ژیان چ واتایەکی دەبوو، ئەوە کۆتایی نییە کە مانا ئەبەخشێت بە سەرەتاو ناوەرۆك[٩٤] گەرچی دەربڕاوەکەی سەرەوە کەمتر بەم مانایانە بەکاردێت، کەمتر بیرە فەلسەفیەکەی تیا زاڵە بەڵام پەلکێشمانیکرد بۆ ئەو واتا فەلسەفیانە.

- مردن بووە بە ژمارە.

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا دنیاوژیانی ئەمڕۆمانی گۆڕیوە، جۆری مردنو گیان لەدەستدانیش گۆڕیوە. مردن لەم سەردەمەدا بووەتە ژمارە، واتە ڕێژەی مردن فراوان بووە، هەرچەندە ئەوەش گرنگە تا چەند ئێمە کە کۆمەلگەیەکی ئایینین وشەی (مردن-گیان لەدەستدان) گونجاوە بۆ ئەو کەسانەی کە تیرۆر دەکرێن یان بە ڕووداوێك(ئۆتۆمبێل) تیا دەچن؟ زۆرکات لە (tv) لە هەواڵو گۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکانی وەزارەتی ناوخۆ یان تەندروستی-هاتووچۆ... گوێمان لێدەبێت کە لەماوەی ئەوەندەدا ڕێژەی

ئەوەندە مردوون- یان لەڕووداوێکی تیرۆریستیدا دووسەد کەس گیانیان لەدەستداو ئەوەندەش بریندارن، ئەمە ئاسانکردنی مردنو گیان لەدەستدان دەردەخات لای ئێمە، واتە زۆر بە ئاسانی دەمریت، چەندێتی مردن لە ئێستادا بووەتە باو، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە هەستی مرۆڤیشی گۆڕاوە بەرانبەر بەمردووەکان، مردنی مرۆڤەکان چیدی وەك جاران هەستمان ناجوولێنن. بەڵام شتێکی تر هەیە کە زیاتر لە بواری تەندروستیدا کاری پێدەکرێت بۆ نەخۆش کە ڕێژەی مانو نەمانی دیاری دەکرێت، کاتێك قەلەقی ئەوەبن کە نەشتەرگەری بۆ نەخۆشێك بکرێت یان نا بە کەسوکاری نەخۆشەکە دەڵێن ئەمەلی لەسەدا ئەوەندەی هەیە لەو نەشتەر گەریە نەجاتی بێت (نەمرێت)و بە پێچەوانەشەوە. یاخود ئەوەی زیاتر کاتی ژیانی نەخۆش دیاری دەکات زۆرکات پەیوەستە بەو لینجیو ئاوەی ژێر پێست، بەپێی مانو نەمانی کاتی مردن دیاری دەکرێت. بوونی مردن بەژمارە هەم هۆکاری زۆرە هەم لێکەوتەی زۆری هەیە، بەڵام دەرفەت نییە لێرە زیاتر لەسەر مەترسیەکانی ئەم دۆخە بدوێین.

- مردمو زیندووبوومەوە:

ئەم پەسنە وەرگیراوە لە کولتووری ئایینییەوە بەوەی کە ئێمە دەمرینو پاشان زیندوو دەکرێینەوە، ئەم کەسە بانگەشەی ئەزموونکردنی ئەو دۆخە دەکات کە پێش ئەوەی ڕوبدات، لای ئەم ڕوویداوە. کەسەکەش باوەڕی بەزیندووبوونەوە هەیە(لە ڕوکەشی دەربڕاوەکەوە دەردەکەوێت).

ئەم دەربڕاوە، گێڕانەوەیە، واتە ڕووداوێکت بەسەر دێت، گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەیە، چونکە مردووە و پاشان زیندووش بۆتەوە، واتە هەردوو کردەکە لە ڕابردودا ڕوویانداوە. هاوکات ئەمە پەسنێکە بۆ دۆخی خۆی (ئەوکەسەی کە ڕووداوەکەی بەسەرداهاتووە). بەڵام ئەو دەووروبەرەی کە ئەمەی تیا بەکاردێت جیاوازە بەس واتای سەرەکی ئەوەیە کە ئەو ڕووداوە ئازارێکی زۆر

هەبوو تا ئاستی ئازاری مردن. جگەلەوەی کە ئەم کەسە ئازاری مردنی نەچەشتووە، بەڵام بە قەولی هایدیگەر مرۆڤی نارەسەن دەڵێت ئەوان دەڵێن مردن ئازاراویە، ئەم کەسەش بەمجۆرە زانیویەتی مردن ئازاراویە، بۆیە ئازاری مردنی چواندوە بە ئازاری خۆی لەو ڕووداوەدا. واتە پەیوەندی ئازار و مردن ڕەچاوکراوە. لەبەرئەوەی کە ئێمەی مرۆڤ ئەزموونی مردنمان نەکردووە نازانین ئایا مردن ئازاراویە یان ئەوە ئازارە مردن دەهێنێت، یان ئەوە مردنە ئازار جێدەهێڵێت؟ کەسێکی ئەزیزمان دەمرێت ئازارێکی زۆر دەچێژین لەمردنی ئەو، هاوکات لەئایینی ئیسلامیشدا لەچەندین فەرمودەو ئایەتدا باسی ئازاری مردن کراوە، کە ڕۆحدەرچوون و سەرەمەرگ ئازاری زۆری هەیە، لەبەرئەوەی ڕۆح تەمەنێك لەگەڵ جەستەدا ژیاوە ئاسان نییە جیابوونەوە و نارەحەتی دەوێت، لەبەرئەوە خوا دەفەرموێت تەنیا لەڕۆحکێشانی باوەڕداران دوودڵ بووم، ڕۆحکێشان کۆتا کاری مرۆڤی موسڵمانە، کە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت. بۆیە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ حەزناکەم ڕۆحکێشانەکەم لەسەر سوکبێت. لەلایەکی ترەوە ڕۆحکێشانی مرۆڤی کەم باوەڕ ئازاراوی دەبێت بۆ تا ڕۆحکێشانەکەی ببێتە هۆی زیادکردنی چاکەکەی. بەڵام مرۆڤی زۆر باوەڕدار قورسە ڕۆحکێشانی لەلایەن خواوە چونکە خۆشەویستە بەڵام ئاسانەو کەم ئازاراویە بۆ خۆی.

شەهید زۆر ئاسان ڕۆحی دەردەچێت(ئەو کەسەی دەیکوژێت وەك ئەوەی چرنوکێکی لێبیگیرێت، هەربۆیە دەشێ کاریگەری ئایین بێت کە مردن بەئازاراوی پەسندەکرێت، یان دەششێ دیتنی کەسانێك بێت کە لەسەرەمەرگدان‌و ناڵەیانە ئەمەی پێگوتبین، یاخود هەڵەیەکی باوە، یان هەربەڕاستی مردن ئازاراوییە، یان ئازاری پاش مردن کراوەتە ئازاری پێش مردن، خۆدەشبێ ئازاری جودابوونەوە بێت، واتە پەیوەندی جیابوونەوەی

مرۆڤ بێت لە هاوەڵو دۆستانی. بەڵام ئێستاش ئەو پرسیارە بەکراوەیی جێدەهێڵین.

لەدەروبەرێکی تردا بەکاردێت، وەك چۆن شامەرگ هەیە، واتە مردن لە خۆشیدا ئاواش مردن لە ناخۆشیدا هەیە، لەوکاتەدا جۆرە شکانەوەیەك بەسەر ئەو مرۆڤەدا دێت کە شتێکی پێدەوترێت یان بەرانبەری ڕەفتارێك دەنوێنرێت تەریقدەکرێتەوە، دەشکێنرێت. ئەمە دەردەبڕێت. هەندێجار دەشوترێت(مردمو ژیامەوە)(٩٥)

– ئەودنیام بەچاوی خۆم دی: (زۆرجار ئەم دەربڕاوانە دەکرێنە شوێنی گاڵتەو گەپ) وەك دەوترێ چۆنبوو؟

لەم دەربڕاوەدا ئەوە دەردەکەوێت کە تەنیا ئەم دنیایە بوونی نییە، بەڵکو دنیایەکی تریش بوونی هەیە چونکە کەسێك دنیایەکی تری بەچاوی خۆی بینیوە(مکورە لەسەری کە بینیویەتی)، دەشێ لێرەدا باوەڕێکی ئایینی زاڵبێت لەڕوکەشدا. هاوکات لە مێژە سوکرات وتویەتی کە ئێمە سەرەتا لەجیهانی ئایدیالیزم بووین بە لەدایکبوونمان شتەکانمان بیرچووەوە واتە ڕووداوی کەوتنە ناو جەستە شتەکانی بیربردینەوە(حەقیقەت) بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین شتەکانمان بیربکەوێتەوە، ئێستا ئەم کەسە ئەو دنیای بیرکەوتووەتەوە کە دەڵێ بینیومە ڕاستەدەکات پێشتر بینیویەتی ئێستا بیری کەوتووەتەوە. بەڵام لە ئاییندا وێنا کراوە ئەو دنیا (بەهەشت و دۆزەخ...) لەڕێی ئەم وێناکردنەوە لە قورئانو فەرمودەکانو کتێبەکاندا، ئێمە زۆرکات دنیای خۆمان دەچوێنین بەو دنیا (ئەم ئاوە وەك ئاوی کەوسەرە– ئەم باخە دەڵێی باخەکانی بەهەشتە، دەڵێی لە جەهەنەمداین ئەو گەرمایە چییە) پیرە مێرد دەڵێ (برۆ سەر گۆیژە عەرشی پەروەردگارت لێ دیارە) ئەم بەرزکردن و نزمکردنەوەی دنیای واقیعە بۆ دنیای میتافیزیك* گرنگی خۆی هەیە لە زۆر لایەنەوە کە دەکرێت توێژینەوەی تایبەتی لەسەر بکرێت. بەڵام تا چەند ئەم

ناڕاستی وتنە (بانگەشەکردنە بۆ دیتنی ئەو دنیا- لەو کاتەدا) خراپەیە لەڕوانگەی باوەڕی ئایینییەوە. بەڵام کەسەکە زیاتر ئەوەی مەبەستە کە هەستی بەرانبەر بجوڵێنێت بەوەی کە ئازارێکی زۆری بەرکەوتووە، یان کاتێك کەسێك ئازارو ئەشکەنجەی زۆری دەدەن، کاتێك ڕووداوێکی بەسەردا دێت، بۆ نموونە بلۆك بەر نوکی پێی دەکەوێت، کە دەیگێڕێتەوە بۆ پەسنی ئازارەکەی ئەوە دەڵێت، دەبێت ئەوەش بڵێم کە ئەمە زۆرکات لە ئەنجامی وەڵامدانەوەدا دەوترێت، زیاتر مەبەستی هەستی بەرانبەرە.

- داناوەشێی، بمریت لەو حاڵەت باشترە: بمردیتایەوە ئەو کارەت نەکردایە.

ڕووکردنە کەسێکە، جۆرێکە لەتانە لێدان و تاوانبارکردنییەتی، دەشێ ئەوکەسەی ئەمەی پێدەوترێت هەم دۆستی نزیکی بێت هەم بێگانەبێت (دەشێ دزێك بێت، یان کوڕەکەی بێت کارێکی بەدی کردبێت). ئەوکارەی ئەو کەسەکردوویەتی هێندە ئابرووبەروو قێزەونە کە جۆرێك لە ئاواتخواستن دەبینرێت کە بمرێت باشترە وەك لەوەی لەو دۆخەدا بێت، چونکە حاڵەتێکی بێزارکەرە، مانەوەی سەختە بەوەی کە تانەی زۆری لێدەدرێت هەر تانەیەکیش لە مردنی خراپترە(هەر تانەیەك = بەمردن و زیاتریش، چونکە وەك دەوترێت هەموو دەقەیەکی هەر مردنە، بەڵام مردن یەکجارە. جگەلەوەی مردن بەشتێکی خراپ پەسنکراوە، هەروەك بوونی ئیرادە وا لەو کەسە دەکات کە خۆی لەناوبەرێت. بمریت لەو حاڵەت باشترە(برۆ خۆت بکوژە لەو حاڵەت باشترە- بۆ خۆت ناکوژیت). شکاندنی کەسی بەرانبەرە بەشێوەیەکی زۆر خراپ، لەڕووی سایکۆلۆژیەوە(بەجیاوازی بۆ هەر مرۆڤێك) بەڵام کاریگەریەکی زۆری لەسەر ئەو کەسە داناوە.

لە (بمردیتایەوە ئەو کارەت نەکردایە) داخوازی تیایە لەوەی کە کارێك نەکرێت، کە کراوە، کردنی ئەو کارە زۆر بەخراپ بەسەر کردەکەردا-

بکەر(ئەوکەسەی کارەکەی کردووە) شکاوەتەوە. واتە دوو داخوازی تیایە(بمردیتایە–نەتکردایە) بەڵام ئاخ هەڵکێشان هەیە(کە دەرنەکەوتوە) واتە ئەوە کراوە دەبوایە نەکرایە. (خۆزگە خواستن) پەنهانە لەرووی فۆرمەوە بەڵام لەرووی واتاوە زەق دەرکەوتوە، خۆزگە تۆ لەو کاتەدا کە ئەوکارەی تیا کرا تۆ نەبوویتایە(بمردیتایە) بەس ئەو کارەت نەکردایە، بەهای کارەکە لە مردن زیاترە، چونکە ئەو کارە ژیانتی نابووت کردووە، نەك هەر ژیانی خۆت بەڵکو ژیانی ئێمەش. گەر زیاتر ورد بینەوە، دەڵێین زۆرکات ئەمە لە دەوروبەرێکدا دەورترێت کە دەوروبەری کولتووری دەتوانێت شیکاری بکات[٩٦] کەسێتی مرۆڤ زۆر گرنگە و مەسەلەی شەرەف لە ژیان بەهادارە(دیارە چەمکی شەرەف– ئابڕو لای ئێمە مەبەستە) کچێك لە خێزانێکدا کارێکی نا کولتووری (ناشەرعی) ئەنجامدەدات، واتە کۆی خێزانو هەندێجار بنەماڵەش بەهۆی چەوتی ئەو کارەوە دەکەونە ژێر تانەی کۆمەڵگە، ئەمەش وادەکات دەیانجار ئەمە بەو کچە بووترێت، جگەلەوەی کە ئەو کچە زۆر ئاساییە(چونکە حاڵەتی بەمجۆرە زۆر ڕوویداوە) کە خۆبسوتێنێت (لەناوبەرێت) چونکە مانەوەی هەموو دەقەیەکی مردنە، بەڵام یەکجار مردن ڕزگاربوونە، ئەم کچە هۆشیاری هەیە لەرووی کۆزانیاری کولتوورییەوە بۆیە مانەوەی بە قورس دەزانێتو خۆی لەناو دەبات.

لە زۆرێك لەو دەربڕاوانەدا هەست بەوە دەکەین ڕوانینمان بۆ مردن گواستنەوەی ئەو وێنەیەیە کە ئیبن سینا ئاماژەی پێدەکات، واتە ڕووداوی مردن لەدنیای دەرەوە دەبینین، ئەم ڕووداوە وێنە دەگرینو دەچێتە نێو دنیای ناوەوە پاشان بەشێوەیەکی تر وێنەکە دەدەینەوە لە فۆرمی تردا، ئەوەی کە بەشێوەیەکی تر وێنەکە دەدەینەوە چونکە وێنە دەرەکیەکە(ڕووداوی مردن) ناتوانێت بە ئاسانی وەرگیرێتو لەسەرمان گرانە، کاردانەوە دروستدەکات ئەم کاردانەوەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر

دەگۆڕێت، واتە دنیابینی کەسەکان بۆ مردن دەگۆڕێت، هەیە ترسێکی زۆری لە مردن هەیە، هەشە ئەم ترسەی نەماوە، هەیە بەردەوام ڕادەکات لەمردن(نایەوێت نەباسی مردن بکات نە بکرێت)، هەیشە ئاواتی مردن دەخوازێ.

- هێندە زاڵمە لە دەستی بێت زیندو مردوویەك لە قەبر دەنێت[٩٧]

گێڕانەوەیە یان باسکردنی کەسێکە لەلایەن چەند کەسێکی ترەوە، یان کەسێك بۆ چەند کەسێك یان تاکەکەسێك قسە دەکاتو باسی(زەمی) کەسێك دەکەن، ئەو کەسە بە زاڵم پەسن دەکات، زاڵمێك کە ئاستی زاڵمیەکەی بەرزە چونکە "هێند"هێمایە بۆ زۆر زاڵمی. "زاڵم"ی واتە توانای کردنی زوڵم، یان ئازاربەخشو کەسێك دەرچوو لە ڕەوشتی کۆمەڵایەتیو ئایینی...کەسێك کە غەدر دەکات. لەم پەندە یان دەربڕاوەشدا "لەدەستی بێت" واتە زاڵم، گەر زەمینە بۆی گونجاو بێت دەست ناپارێزێت، هەر زوڵمێك بیەوێت ئەنجامی دەدات، ئەم زاڵمە گەر دەسەڵاتی هەبێت ئەتوانێت زیندووەکانیش بخاتە گۆڕەوە، واتە کاتێك وەك هەڕەشە (هەندێ کات بۆ پێکەنین) دەوترێت (حەواڵەی ئەو دنیای دەکات) ئەمەش زیندووەکە دەخاتە نێو گۆڕەوە، لەگەڵ مردوودا، واتە ئەوەم لەدەست دێت لەگەڵ هەر مردوویەکدا زیندوویەکیش بخەمە نێو گۆڕەوە، یان بڵێین من دەسەڵاتی ئەوەم هەیە بۆ هەرکەسێك کە دەمرێت بە مردنی ئاسایی کەسێکیش بە دەستی من دەمرێتو دەیخەمە گۆڕەوە، بەجۆرێك دەرخستنی دەسەڵاتی کەسە زاڵمەکە دەردەخات، کە تا ڕادەی دەسەڵاتی خوا دەڕوات (ئەمە تەنیا چواندنێکە) چونکە مردن بەدەست خوایە بەڵام ئەم زاڵمە دەڵێ خوا هەر مردوویەك بمرێنێت منیش وەك ئەو زیندوویەك دەمرێنم (دەکوژم). هاوکات لەم دەربڕاوەدا سنووری نێوان زیندوو مردووەکان تێکەڵکراوە، دەبێت زیندووەکانیش بچنە شوێنی مردووەکان. یان ورتر بڵێین مرۆڤی زیندوو

هەمیشە لە گۆڕستانەکان سڵیان کردۆتەوەو ترسیان لێی هەبووە، لێرەدا ئەو ترسە بە هەند وەرگیراوە وەك هەڕەشەیەك کە زاڵم دەتوانێت بتباتە ئەو شوێنە ترسناکەو لە گۆڕت نێت لەگەڵ مردووەکەدا، وا مردووەکە ئیتر مردووەو ناترسێتو بەڵام زیندووەکە بە ئاگاییەوە ئەمە وەردەگرێت، زاڵم لێرەدا ناچارت دەکات بە ترس. لەلایەکی ترەوە ئەم کردەیە(مردوو و زیندوو پێکەوە ناشتن) ئەرکێکی ئایینیو دابێك بووە لە کۆندا جێبەجێکراوە، هاتووەتە نێو پەندو ئەفسانەو حیکایەتەکانەوە، لەوە دەرچووە تەنیا بۆ زاڵم بەکاربێت بەڵکو بووەتە کارێکی گشتیو ئەرکێکی ئایینی، کە پاشایەك دەمرد لەگەڵیدا چەندین زیندوویان دەخستە گۆڕەکەیەوە، یان کاتێ پیاوێك دەمردو لاشەکەیان دەستووتان، لەگەڵیدا وەك وەفایەك ژنەکەش خۆی دەخستە نێو ئاگرەکەو خۆی دەسووتاند لەبەرئەوە لەگۆڕنانی زیندوو مردوو پێکەوە تەنیا کاری زاڵمانو بێ دین نەبووە بەڵکو دابوونەرێتێكو ئەرکێك بووە[٩٨]. هاوکات لەئێستاشدا هەمان حاڵەت بەشێوازی تر دەبینین گۆڕگرتن بۆ ئەوەی لەتەنیشت یەکەوە بن، یان هێند یەکدیان خۆشدەوێ دوو کەس(ژنو مێرد/دوو عاشق) گەر ڕێگری ئایینی نەبێ کە کوشتنی حەرام کردووە ئەوا دەبووە دیاردەیەك. بەڵام ئەوەش دەبێ بڵێم کە ئەوە کارێکی زاڵمانەیە بەڵام گەر لەڕووی دەروونییەوە ورد بینەوە ئەو تابۆیە کە زیندوو مردوویەك لەگۆڕدەنێ، وەك پێویستیەکە بۆ دەرخستنی خۆشەویستی خۆی، چونکە تابۆ بۆ ئەو شتە یان ئەو کەسە دەبێ کە زۆر خۆشماندەوێ و توانای زیانگەیاندنی هەیە پێمان هەرچەند هەندێ جار وەك یاسایەکیش وایە، بەڵام بۆ نموونە خوا تابۆیە چونکە خۆشەویستە، خۆی لەخۆیدا پاڵنەرێکی هەستی هەیە بۆ خۆشەویستی مێردەکە کەدەمرێت، هاوکات پاڵنەری نەستیش هەیە کە بەهۆی ئەوەوە توشی ئازار دەبێت، کە ئەو بمرێت دەبێ ئەم ئازار بچێژێت بۆیە لەگەڵ ئەو بمرێت نەك ئازاری بێ ئەوەی بچێژێت، ژیان بەبێ

ئەو سەختترە لە مردن، ئەم خۆشەویستیە زۆرەی ئەو وایکردووە ئەو وەك زاڵمێك دەركەویٚ كە خۆشەویستیەكەی هێندە هێزی هەیە كە دەتوانیٚ ئەم كردەیە بە هاوسەرەكەی ئەنجامبدات.

- ئەوەندەم كار هەیە، كاتی ئەوەم نییە بۆ خۆشم بمرم(٩٩)

ئەم پەندە، لێكدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت. منێك دەڵێت، كارم زۆرە بە ئەندازەیەك، كە كاتی ئەوەم نییە كارێك بكەم كە دەبیٚ هەر بیكەم (مردن). لێرەدا مردن بە كار دانراوە، كە دەبیٚ بكرێت. ئەمە لە دەوروبەرێكدا دەوترێت كە كەسێك داوای لەكەسێكی تر كردبێت هاوكاری بكات، یان كارێكی بۆ ئەنجامبدات، كەسەكەش زۆر سەرقاڵە كە ناتوانێت ئەو كارە بكات، ئەمە دەڵێت، واتە دەتوانین وەك نەبوونی گیانی هاوكاری بیخوێنینەوە. بە واتایەكی تر گیانی هاوكاری لای ئەم كەسە(یان لای كورد بەگشتی) وا تەماشادەكرێت كە مردنە لەبەر یەكتری واتە گەر من كارێك بۆ تۆ بكەم وەك وایە مردبێتم یان ژیانم لە پێناو كارەكانی تۆدا سەرفكردووە.

كاتێك دەڵێت كارم زۆرە ناتوانم بۆ خۆشم بمرم واتە كارم زۆرە ناتوانم كارەكانی خۆشم بكەم راپەرێنم نەوەك كارەكانی تۆ. هاوكات دەشیٚ پەیوەندی بەوەوە هەبێت كە كەسەكە داوای كارێكی لێدەكات دەشیٚ كەسی داوالێكراو ئەمە بڵێت وەك داوای لێبووردن، كە وەك وتنی شەرمەزارم ناتوانم، كەسەكە توشی تەریقبوونەوەو ئیحراجی ببێت لەوەی كە ناتوانێت، بۆیە تا سنووری مردن دەڕوات كە بۆی بسەلمێنێت گەر بتوانێت ئەوكارەی بۆ بكات بەدڵنیایەوە دەیكات.

هاوكات لەم دەربڕاوەدا كارو ژیان پەیوەندی توند بەیەكیانەوە دبەستێتەوە (كار نەكەیت ناژیت)، لێرەدا گیانی هاوكاری(لەبەریەك مردنە) چونكە ئامادەیی دەرنەخراوە هاوكاری بكات، بۆیە دەڵیٚ من خۆم هاوكاری خۆم ناكەم، ئەو كارانەی كە لەسەرمە بیانكەم فریایان ناكەوم. ئەم پەندەش

برێك مەبەستی ژیاندۆستی تیایە لەوەی كە كۆششی تیایە بۆ ئەم ژیانە. نامەوێ بمرم یان نامرم چونكە كارم زۆرە دەبێ جارێ كارەكانم بكەم، بەلاّم ئەمە تاچەند لەگەڵ مردندا تەبایە كە مردن دێت‌و خۆی دەسەپێنێت‌و چاوەڕێی ئەوە ناكات تۆ كارت زۆرە یان نا؟

هەروەك لەم دەربڕاوەدا واتای ڕووكەش ئەمە دەڵێت كە مردن بەدەست خۆمەو خۆم دەمرم، هەركاتێ كەخۆم بمەوێت. هاوكات ئەوەشمان پێدەڵێت كە مردن بە شتێ خودی دانراوە(خۆشم بمرم). جگەلەوەی پەیوەندی كات‌و مردن زۆر بە توندی بەیەكەوە بەستراون، واتە دەبێت كاتێك هەبێت من تێیدا بمرم، دەبێ كاتێ لە ژیانم دانێم بۆ ئەوەی بمرم، چونكە مردن لە ناوكاتدا ڕوئەدات.

لێكچوونێك لەنێوان ئەم دەربڕاوە كوردییەو ئەو دەربڕاوە فەلسەفییەی كە برنارد شۆ، دەڵێت (من كارم زۆرەو كاتی ئەوەم نییە بیر لە مردن بكەمەوە).[١٠٠] بەلاّم جیاوازیشیان زۆرە ئایا بیركردنەوە لە شتێك كە بتكوژێت‌و ناچالاكت بكات شیاوە؟ لەبەرئەوە دەشێ ئەو فەیلەسووفە مەبەستی بیرنەكردنەوە لەمردن ئومێدو ویست‌و ئامانجێكی زۆر بێت، گەر بێت‌و بیر لەمردن كاتەوە كاتێك دەزانێت ژیانی دەڕوات‌و هیچی بەهیچ نەكردووە، دەشێ مەبەستی بێت بیركردنەوە لەمردن بێمانایە، یان ژیان گرنگترە كاری بۆ بكەیت نەك مردن. هاوكات بیرەكەی برنارد شۆ بێبڕوای تیا بەیانكراوە(بە جۆرێك) بەلاّم لای كوردەكە كەمتر ئەمە دەبینرێت جیاوازیان زۆرە.

لەلایەكی دییەوە ئەم پەندە گەر بە دیدی هایدیگەر وردی بكەینەوە، دەرخەری بوونێكی نارەسەنە، بوونێك، كە خۆی لە بیر كردووە، بوونێك تواوەتەوە لەنێو بابەتەكاندا، بوونێك ژیانی ڕۆژانە بوونی داگیركردووە، بە چەشنێ، كە بڕیاری چاوەروانكردنی بوون ڕووەو مردنی نەهێشتووە. ئەم

کەسە بێ کاتە، لە کاتێکدا بە پێی بۆچوونی هایدیگەر بێ کاتی نیشانەیەکی زەقی نارەسەنێتیە، چونکە کات هی منە، ناکرێ من کاتم نەبێ، من لەناو کاتدام، من لەناو کاتدا بڕیاردەدەم، واتە کاتم نییە بۆ بڕیاردانیش، من کاتم ئیدی چۆن کاتم نییە، ئەم پاساوەشەی لێرەدا هێنراوەتەوە، کە کاتی نییە، ناراستە و ئاماژەی نارەسەنێتی تێدایە. ئەم ڕاکردنە لە مردن نیشانەیەکی ڕوونی ونبوونە لەنێو بابەتەکانداو لە ژیانی ڕۆژانە لەگەڵ ئەواندا. ئەم کەسە، کە دەڵێ کاتم نییە بۆ مردن، واتە کاتم نییە بۆ بوونی خۆم، چونکە مردن هی منە بۆ منە، مردن یەکێکە لە شا ئەگەرەکان، کە گەڕانەوەی ڕووەو خۆی تێدایە، بەڵام ئەم کەسە نایەوێت، بە بیریدا نایە بگەڕێتەوە بۆ بوونی خۆی، خۆی تەواو بکات. ئەم کەسە خۆی ناناسێت بۆیە مردنیش ناناسێت، نازانێت، کە مردن پێشمەرجی بوونییەتی دەنا ناڵێت کاتم نییە بۆ مردن.

- نەزیندوو منەتی پێیەتی نە مردوو ئاگایی لێیە"(١٠١)

کاتێك چاکەیەك لەگەڵ کەسێك یان خێزانێك(خزم و ناسیاوێك) دەکەیت ئەویش بەکاریگەری ئەوکەسانەی چواردەورت کە پێت دەڵێن فلانی ئەو خێزانە مردووە لەبەر فلان تۆ ئەو چاکەیەیان لەگەڵ بکە. بەڵام تۆی چاکەکەر هەست بکەیت، ئەو چاکەیەت هیچ جێ ناگرێت(هیچ پێزانینێك)ی تیا دەرناکەوێت لەو کەسانەی کە چاکەکەت بەرانبەر ن. ئەمە ئازارت دەداتو تووڕەت دەکات، ئەم دەربڕاوە دەردەبڕیت، کە تانەدانە لە زیندوو مردوو، دەریدەخات زیندووەکان بێ وەفاو سپڵەن، مردووەکانیش مردوون، واتە ئەو مردووانە نین کە بەپێی ئایینی ئیسلام زیندووبن (ڕۆحێکی ئاگادارن) پاش مردن ئاگایان لە دنیای زیندووان بێت، بەواتایەکی تر ئەتوانین بڵێین ئەم کەسە گەر بڕواداریش بێت بەڵام دەربڕاوەکەی نیشانەی بێبڕوای کەسەکە دەردەخات، چونکە ئەم کەسە بڕوای بەوە نییە کە چاکە پاداشتی لای خوا هەیە (١٠٢) ، بەڵام ئەم پەندە زێدەتر لەکاتی هەڵچووندا دەگوترێت. دەبێ

ئەوەش بلێین ئەم دەربڕاوە چەند ڕەوشتێکی کەسەکە نیشاندەدات، لەوانە توورەبوون، چاکە ناکات بۆ ئەوەی بیدا بەدەم ئاوەوە، یان بەپێی ئایینی ئیسلام چاکە بکات ئەم دەستە بەدەستەکەی تر نەزانێت، بەڵکو لەبەرانبەر چاکە، پاداشتی دەوێت (ئیدی پاداشتی بەرجەستە بێت یان نا بەرجەستە)، ڕقی لە کەسی سپڵەیە. جگە لەوەی لەرووی ئایینەوە کەسێك یان بێ باوەڕە یان ئایین وای لێنەکردووە کە زمانی ببەستێت لە خراپە، بەڵام دکتۆر مەولود ئەم پەندە نزیکدەکاتەوە لەفەلسەفەی بوونگەرایی، بەڵام بەبۆچوونی من کەمتر ئەم بیرە دەچێتەوە ناو فەلسەفەی بوونخوازی، چونکە ئەو فەلسەفەیە لە بێبڕواو بڕوادار پێکهاتوون بیرە فەلسەفیەکەیان بۆ مردن جیاواز(بڕوانە بەشی یەکەم–مردن لەفەلسەفەدا).

- خوا من بکوژێ و نەجاتم بدا:

ئەم دەربڕاوە تایبەتە بە ڕەگەزی مێ بەتایبەت دایك. ئەو دەوروبەرەی کە ئەمەی تیادەگوترێت جیاوازە. بەڵام با سەرەتا لەواتای سیمانتیکی دەربڕاوەکەوە دەستپێبکەین. کەسێك داوا لە خوا دەکات بیکوژێت، چونکە مردنی بۆ باشترە لە ژیان. واتە دۆخی کەسەکە دۆخێکی نا ئاساییە، کەسەکە ژیانی ناخۆشە. هەرچەند ئەم دەربڕاوە بەهۆی زۆر وتنییەوە ئەو بارە ناهەموارەی کە لەدەربڕاوەکەدا هەیە لەواقیعدا دەشێ هێدە گران نەبێت، بەڵام ڕاهاتن لەسەر ئەم وتنەیە. واتای سیمانتیکی پێماندەڵێت داوا لە خواکراوە بیکوژێت، واتە خوا ببێتە بکوژ، ئەمە تەنیا واتا سیمانتیکیە. بکوژی من، بەویستی خۆم دەمەوێت، بەڵام ئایا خوا دەبێتە بکوژ؟ ئایا ئێمە کە میللەتێکی موسڵمانین دەشێت خوا بکەینە بکوژ؟ جگەلەوەی ئەو کەسە دەستی ناچێتە خۆی بۆیە داوا خوا دەکات بیکوژێت؟

بەڵام گرانە ئەم بیرکردنەوەیە دانانی خوا بەبکوژ، بۆیە واتای پراگماتیکی ئەم دەربڕاوە کە خۆشی بۆ هەمان واتا بەکاردێت، مەبەست لە

نزایەکـە کـە مـن دەمـەوێت لـەو دۆخـە دەرچـم، یـان دەردە دڵێکـە بەمـە دەریـدەبڕم. بەواتایـەکی تـر خوایـە ژیـانی مـن ناخۆشـە، خوایـە مـن لـەناو ناخۆشیدا دەژیم، یارمەتیم بدە لەم ژیانە نەجاتم بێت، واتە گەر مـردن باشـە خوایە من بمرم بۆ ئەوەی لەم ناخۆشیە دەرچم. خوا لەبەرئەوەی دەسـەڵاتی هەیە دەشێ وەك بکوژ وەك دەسەڵات دانرابێت، واتـا خـوا توانـای هەیـە مـن بکوژێـت(+ خـوا دەسـەڵاتی مردنـە). ئـەم دەربـڕاوە خـۆ بەدەسـتەوەدان‌و بێدەسەڵاتی بەرانبەر بە ژیانی تیا بەدیدەکرێت. دەشـێ ئـەوەش بڵـێین ئـەم کەسە بێدەسەڵاتە لەبەرانبەر خۆکوشتن(خۆڕزگارکردن) ئەمەش بەکاریگـەری ئایین کە خۆکوشتن حەرامکراوە.

- خوایە نەمانکوژی هەتا ئەو ڕۆژەی ئەمرین:

ئەم دەربڕاوەش کەلەناو گەنجانـدا زیـاتر دەگوترێـت، زیـاتر وتنێکـە بـۆ گاڵتەوگەپ، واتە وتنێکە بۆ هێنانە پێکەنینی بەرانبەر، وەك وتـنی قسـەیەکی خۆش. بەڵام گەر لەرووی واتـای سـیمانتیکیەوە لـە دەربڕاوەکـە وردبینـەوە، دوو جۆر مردنی تیایە. کە هەردووکیان داواکردنـە، واتـە لـە پشـت وتنەکـەوە داوا دەکرێت کەسێك نەمانکوژێت (ئـەو کەسـە لـەویادا خوایـە) واتـە کوشـتن کەسـێکە دەتکوژێـت. بـەڵام مـردن خۆمـان دەمـرین، واتـە ئـەو دەسـەڵاتە بێتوانایە لە مردنمان. مردن خۆمان دەمرین بـەڵام کوشـتن (کـە هـەر مردنـە) کەسێك دەمانکوژێت، هێزێك ئەو کارەدەکات. کوشتن کردارێکە ئەنجامـدەری هەیە، بەس مردن لێرەدا خۆ ویستێکە سـەپێنراوە، واتـە هـەر دەبـێ بمـرین، بەڵام نا بە کوشتن، بەڵکو بە مردن، نا بەوەی کەسێك بتکوژێت بەڵکو بەوەی کە مردن لەڕێی هەموو کەسێکدایە. لێرەشدا بکوژ بە خوا دانراوە، واتە خۆایە تۆ نەمانکوژیت هەتا بۆ خۆمان بە سروشتی خۆمان دەمرین، هەتا ئەوکاتـەی سەرەی مردنمـان دێـت. بەواتایـەکی تـر کوشـتن پێشخسـتنی وادەی مردنـە، بەڵام مردن کاتی خـۆی هەیـە، لـەکاتی خۆیدایـە. کوشـتن سـەپاندنی مەرگـە بەسەر کەسەکەدا (بەتایبەتی) بەڵام مـردن لەلایـەن کەسـێکەوە نییـە بـەڵکو

بەشێوەیەکی سروشتی و گشتیە. لەپشت وتنەکەوە دەسەڵاتی خوا هەیە بۆ کوشـتنو لـەناوبردن، کـە نـەریی ئـەم دەسـەڵاتە کـراوە، وەك جۆرێـك لـە تکاکردن، کە دەزانین تۆ دەسەڵاتت هەیە بمانکوژیت بەڵام ئێمە نامانەوێت تۆ بمانکوژیت دەمانەوێت خۆمان بمرین، هێزێك نەبێت لە کوشتنمان.

## سەرچاوەكانی بەشی سێیەم:


١/ فرهنگ بزرگ سخن، به سرپرستی دكتر حسن انوری، چاپ چهارم، ١٣٨٦، جلد هفتم.

٢/ قاموس المعانی، عەرەبی بە عەرەبی، لە سایتی www.almaany.com

٣/ p ٩٩٣

Oxford Advanced Learner's Dictionary: Edited by, Sally Wehmeier, Oxford University Press, Seven Edition, New York & London ٢٠٠٨.

٤/ د.عبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی، چەند لێكۆڵینەوەیەكی سمانتیكیو پراگماتیكییە، دەزگای موكریان-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٩، ل. ١٠٧.

٥/ د. محەمەد مەحویی، زانستی هێما، هێما، واتاو واتا لێكدانەوە، بەرگی یەكەم- چاپخانەی پەیوەند-سلێمانی، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٩. ل. ١١٠.

٦/ د.عبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی، چەند لێكۆڵینەوەیەكی سمانتیكیو پراگماتیكییە، دەزگای موكریان-هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٩، ل. ١٠٨.

٧/ ناوی چەند كتێبێكە بە كوردی نوسراون، یان وەرگێراون.

٨/ انا لله وانا الیه راجیعون، لەقورئانەوە وەرگیراوە. شادرەوان. لە دیدارێكی د.حەمید عەزیز وەرگیراوە كە باسی ئەو هاورێیانەی دەكات كە ئێستا مردون دەڵێت شادرەوان. دیدارەكە لە رەخنەی چاودێر بڵاوبۆتەوە لە ژمارە. ٢٤٤- ٢٥٠. ژ.ل. ٥. ئا.هەرێم عوسمان. وتنی شادرەوان بۆ خۆ جیاكردنەوەیە بەتایبەت لەو وشانەی كە بۆنی ئایینیان لێدێت یان ئایین زاڵە بەسەریدا یان خەڵكی گشتی بەكاریاندێنێت.

٩/ پیتەر سلۆتەردایك، و. بەكر عەلی. دیریدای میسری، سەبارەت بەگرفتی قووچەكە جووڵەكەییەكان، بڵاوكراوەكانی رێكخراوی كۆنسێپت- سلێمانی، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٢، ل.٧٧

١٠/ فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییەسیمانتیكییەكان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی كوردیدا، نامەی ماستەر بڵاونەكراوە. ل٢١٧

١١/ فاروق عومەر سدیق، لەدایكبوونی وشە، چاپخانەی شڤان- سلێمانی.چاپی یەكەم- ساڵی ٢٠١١. ل. ٦٧.

١٢/سەرچاوەی پێشوو.ل .٧١-٧٢

١٣/ سەرچاوەی پێشوو.ل. ٧٨.

١٤/ سەرچاوەی پێشوو.ل ٨٠

١٥/رينيه دێكارت، و. حەمید عەزیز، خانەی وەرگێران– سلێمانی. ساڵی ٢٠٠٥. كۆچیتۆیەكەی بریتییە لەوەی(من بیردەكەمەوە كەواتە من هەم). لەكتێبی. فەلسەفەی سارتەرو خوێندنەوەیەكی نوێ،د.محەمەد كەمال كەتایبەتە فەلسەفەی سارتەر. سارتەر دەڵێت(من هەم كەواتە من بیردەكەمەوە).
١٦/ فرهنك عاميانه، نجفى، ١٣٧٦، ص٣٤–٨٩–٧٦. نشر نكاه.
١٧. هەژار، هەنبانە بۆرینە. فەرهەنگی كوردی/فارسی، لەئێران چاپكراوە(كتابخانه ملی ایران)چاپی شەشەم، ساڵی ١٣٨٨. لا. ٨٠٢.
١٨/ سەرچاوەی پێشوو.لا. ٨٠٣
١٩/ سەرچاوەی پێشوو.لا. ٨٠٣
٢٠/ سەرچاوەی پێشوو.لا. ٨٠٤
٢١/ سەرچاوەی پێشوو.لا. ٨٠٤
٢٢/ سەرچاوەی پێشوو.لا. ٨٠٤
٢٣/ سەرچاوەی پێشوو.لا. ٨٠٤
٢٤/ سەرچاوەی پێشوو.لا ٨٠٤
٢٥/ سەرچاوەی پێشوو.لا. ٨٠٤
٢٦/ شیلان عومەر حسەین، ئیدیۆم چەشنو پێكهاتنی لەزمانی كوردیدا، مەڵبەندی كوردۆلۆجی–سلێمانی، چاپی یەكەم.٢٠٠٩، لا.٦٠.
٢٧/ هەژار، هەنبانە بۆرینە. فەرهەنگی كوردی/فارسی، لەئێران چاپكراوە(كتابخانه ملی ایران)چاپی شەشەم، ساڵی ١٣٨٨. لا ٨٠٥.
٢٨/ سەرچاوەی پێشوو.لا ٨٠٤.
٢٩/ سەرچاوەی پێشوو.لا ٨٢٦. ٨٢٧–
٣٠/عەبدولوەهاب شێخانی، فەرهەنگی شێخانی. كوردی/كوردی، دەزگای موكریان–هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٩، ٥٠٣
٣١/ سەرچاوەی پێشوو. لا. ٥٠٣.
٣٢/ سەرچاوەی پێشوو. ٥١٥.
٣٣/ سەرچاوەی پێشوو. ٥١٥.
٣٤/ سەرچاوەی پێشوو. ٥٠٢.
٣٥/ سەرچاوەی پێشوو. ٥٠٣.

٣٦/عـەلی نانـەوازادە، فەرهـەنگی هـەرمان. کوردی/کـوردی، بـەرگی دووهـم پ–ت، دەزگـای موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٥، ل.٢٢٩

٣٧/د. کەمال میراودەلی، فەلسەفەی ئازادی، بەشی شەشەم، سایتی دەنگەکان

٣٨/ سەردار عەزیز، پایزو مەرگ، ڕۆژنامەی ئاوێنە، ستون بەناوی"ئێرەو ئەوێ"

٣٩/ئەمین گەردیلانی، فەرهەنگی ڕێژنە(ئەو وشانەی لە لەهەنبانەبۆرینەدا نـەهاتوون) کـوردی–کوردی–فارسی، دەزگای موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠٠٩،ل ١٧١

٤٠/سەرچاوەی پێشوو.ل٢٤٨

٤١/ سەرچاوەی پێشوو ل. ١٣٤

٤٢/ سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٣

٤٣/ سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٧

٤٤/ سەرچاوەی پێشوو ل٢٥٣

٤٥/فرهنگ دانشگاه کردستان فارسی–کردی(جیبی) به سرپرستی ماجد مردوخ ڕوحـانی، چـاپ اول، بهار ١٣٩٠. ل.٧٠٧

٤٦/ سەرچاوەی پێشوو ل ٧٣٧

٤٧/ سەرچاوەی پێشوو ل٧٣٩

٤٨/ ئازاد حەمە، فەلسـەفەی فینۆمینۆلـۆژی یـان پاتۆچـکە، چـاپخانەی چوارچرا–سـلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی، ٢٠١٠.

٤٩/ فرهنگ دانشگاه کردستان فارسی–کردی(جیبی) به سرپرستی ماجد مردوخ ڕوحانی، چاپ اول، بهار ١٣٩٠. ل ٧٣٩

٥٠/ سەرچاوەی پێشوو ل٧٣٩

٥١/ سەرچاوەی پێشوو ل٧٣٩

٥٢/ بەختیار عەلی، چێژی مەرگدۆستی، چـاپی یەکـەم، بـەرگی یەکـەم، کتێبخانـەی ئەندێشـە چاپیکردووە–سلێمانی، ساڵی ٢٠١١.

٥٣/ موحسـین ڕازی، وشـە گوڵێنـەکانی ئاویـەر–گـل واژەهـای أبیدر،چـاپی یەکـەم، دەزگـای ئاراس–هەولێر، ساڵی٢٠٠٩. ل٣٨٢

٥٤/سەرچاوەی پێشوو ل ٣٨٦

٥٥/ سەرچاوەی پێشوو ل. ٣٨٨

٥٦/ سەرچاوەی پێشوو ل.٣٨٧

٥٧/ئەبوبەکر کاروانی، فەرهەنگی کاروانی هاوچەرخ فارسی-کوردی، چاپی چوارەم، چاپخانەی چوارچرا، ساڵی ٢٠٠٧. لا ٣٢٢

٥٨/ ویل دورانت.و.عەبدوڵلا ڕەسووڵی، مێژووی شارستانیەت-بەرگی دووەم.خانەی چاپوبڵاوکردنەوەی چوارچرا-سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی.٢٠١١.لا.٢٢٥

٥٩/ ئەبوبەکر کاروانی، فەرهەنگی کاروانی هاوچەرخ فارسی-کوردی، چاپی چوارەم، چاپخانەی چوارچرا، ساڵی ٢٠٠٧. لا ٣٢٣

٦٠/ سەرچاوەی پێشوو. لا٣٢٣

٦١/ سەرچاوەی پێشوو. لا٣٢٣

٦٢/ئەلبێر کامۆ، و.سامان عەلی حامید. گیلۆتین، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی چاپو بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ساڵی ٢٠١١ لا. ٢٢.

٦٣/ ئەبوبەکر کاروانی، فەرهەنگی کاروانی هاوچەرخ فارسی-کوردی، چاپی چوارەم، چاپخانەی چوارچرا، ساڵی ٢٠٠٧. لا ٣٢٣

٦٤/ سەرچاوەی پێشوو لا.٣٢٣

٦٥/ سەرچاوەی پێشوو لا.٣٢٣

٦٦/چیرۆکی هەڵبژاردە لە کتێبی پیرۆز، ن. ئان دی غراف، جمعیە الکتاب المقدس، ساڵی ٢٠٠٩. لا. ٥

٦٧/ڕێبوار سیوەیلی، سۆفستاییەکان، چاپی دووەم، دەزگای موکریان-هەولێر، ساڵی ٢٠١١.

٦٨/مەریوان وریا قانع، قانعو وەسیەت، گۆڤاری سەردەمی ڕەخنە ژ.

٦٩/د.نەسرین فەخری، یاری لەکوردەواریدا، پێکهاتنی لەڕووی زمانەوەو کاری بۆ سەر کۆمەڵ، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، دەزگای سەردەم-سلێمانی، لا.٢٩

٧٠/ عەبدولوەهاب شێخانی، فەرهەنگی شێخانی. کوردی/کوردی، دەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩،لا. ٣٢١

٧١/جەلال مەحموود عەلی، ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم،دەزگای سەردەم-سلێمانی، ساڵی ٢٠٠١. لا.١٧

٧٢/سەرچاوەی پێشوو.لا. ١٧

٧٣/ سەرچاوەی پێشوولا.٤٣

٧٤/ سەرچاوەی پێشوو. لا ٥٣

٧٥/ سەرچاوەی پێشوو لا. ٥٦

٧٦/ بهاگاڤاد گیتا، سرووده‌كانی خوا هاوبیر كامه‌ران. ده‌زگای سه‌رده‌م–سلێمانی، ساڵی ٢٠١٢. ل. ٦٠

٧٧/كاروانی فۆلكلۆر(پاشكۆی گۆڤاری كاروانه) سه‌رقه‌ڵه‌مانه‌ی مه‌رگو مردن له كورده‌واریدا، تارق جمباز، ژ. ١. ساڵی ١٩٩٠ ل. ١٥٦–١٦٠. ئه‌م گۆڤاره ئه‌میندارێتی گشتی رۆشنبیری‌و لاوانی ناوچه‌ی كوردستان به‌زمانی كوردی‌و عه‌ره‌بی له‌هه‌ولێر ده‌ریده‌كرد.

٧٨/ سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل. ١٦٠

٧٩/ جه‌لال مه‌حموود عه‌لی، ئیدیۆم له‌زمانی كوردیدا، به‌رگی دووه‌م، چاپی یه‌كه‌م،ده‌زگای سه‌رده‌م–سلێمانی، ساڵی ٢٠٠١. ل١٣٣

٨٠/ سه‌رچاوه‌ی پێشوو. ل. ١٤١

٨١/ مه‌ولوود ئیبراهیم حه‌سه‌ن، گه‌ڕان به‌دوای ئه‌مرییدا، ده‌زگای ئاراس–هه‌ولێر، چاپی یه‌كه‌م،ساڵی ٢٠٠٢

٨٢/ جه‌لال مه‌حموود عه‌لی، ئیدیۆم له‌زمانی كوردیدا، به‌رگی دووه‌م، چاپی یه‌كه‌م،ده‌زگای سه‌رده‌م–سلێمانی، ساڵی ٢٠٠١. ل. ١٤٧

٨٣/كریشیانا مۆرتی، و. یاسین عومه‌ر، مرۆڤ ئازادی خۆی فرۆشتووه، ده‌زگای سه‌رده‌م–سلێمانی ساڵی ٢٠٠٤.

٨٤/ بورهان محه‌مه‌د ئه‌مین. ته‌فسیری ئاسان بۆ تێگه‌یشتنی قورئان. بڵاوكراوه‌كانی كتێبخانه‌ی رۆشنبیر–سلێمانی–هه‌ولێر. چاپی یه‌كه‌م، ساڵی ٢٠٠٤. سوره‌تی البقره، ئایه‌تی ١٥٤. ل.٢٤.

٨٥/ د.محه‌مه‌د كه‌مال، هایدیگه‌ر و شۆڕشێكی فه‌لسه‌فی، ده‌زگای سه‌رده‌م–سلێمانی، چاپی یه‌كه‌م، ساڵی ٢٠٠٧. ل.١٣٩.

٨٦/عه‌تا محه‌مه‌د، زاره‌كانی خه‌ون، چاپخانه‌ی ره‌نج–سلێمانی– ساڵی ٢٠٠٢،ل.٥٠–٥٢)،

٨٧/ د.عه‌بدولواحید موشیر دزه‌یی ، زانستی پراگماتیك، چاپخانه‌ی پاك–هه‌ولێر، چاپی یه‌كه‌م، ساڵی، ٢٠١٠. ل ٤٢.

٨٨/ هه‌ژار، هه‌نبانه بۆرینه. فه‌رهه‌نگی كوردی/فارسی، له‌ئێران چاپكراوه(كتابخانه ملی ایران)چاپی شه‌شه‌م، ساڵی ١٣٨٨. ل.٢٠

٨٩/ سید عبدالحمید حیرت سجادی، پندپیشینیان در كردی، جلد اول، چاپ اول، ١٣٦٩، مركز مشر فرهنگ ادبیات كردی، ل. ١٣٤

٩٠/بێریوان نه‌وزاد سه‌عید، مردن له ره‌نگدانی شێركۆ بێكه‌سدا، گۆڤاری خامه، وه‌رزه گۆڤارێكی ئه‌كادیمی زانستی قوتابیانه‌یه، ژ. ٥ ساڵی ٢٠٠٧، ل. ١٨٩

٩١/ سيد عبدالحميد حيرت سجادى، پندپيشينيان در كردى، جلد دوم، چاپ اول، ١٣٧٨، مركز مشر فرهنگ ادبيات كردى، لا ٤٨٤

٩٢/سەرچاوەی پێشوو لا. ٤٨٤

٩٣/ ئازاد حەمە، فەلسەفەی فینۆمینۆلۆژی یان پاتۆچکە، چاپخانەی چوارچرا-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی، ٢٠١٠. لا.١٣٤

٩٤/ سەردار عەزیز، پاییزو مەرگ، ڕۆژنامەی ئاوێنە، ستون بەناوی"ئێرەو ئەوێ"، ژ، ،-١٢-٠٦ ٢٠١١،

٩٥/ جەلال مەحموود عەلی، ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم،دەزگای سەردەم-سلێمانی، ساڵی ٢٠٠١. لا١٤٠

*سەرەتا ویستم توێژینەوە لەم بارەیەوە بکەم، ناونیشانەکەشم دانا "بەرزکردنەوەی نیشتیمان بۆ ئاستی میتافیزیك" بەڵام نەکرا بەهیوام دەرفەتێکی تر بکرێت.

٩٦/ عەبدولواحید موشیر دزەیی، زانستی پراگماتیك، چاپخانەی پاك-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی، ٢٠١٠. لا. ٢٩

٩٧/ دکتۆر مەولوود ئیبراهیم حەسەن، پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج-سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٧، لا. ٣٤٥

٩٨/سەرچاوەی پێشوو. لا. ٣٤٦-٣٤٧.

٩٩/ سەرچاوەی پێشوو. لا ٢٩٥

١٠٠/ سەرچاوەی پێشوو. لا ٢٩٤

١٠١/ سەرچاوەی پێشوو. لا٢٩٥

١٠٢/ سەرچاوەی پێشوو. لا٢٩٦

## بەشی چوارەم:

لـەم بەشـەدا لەسـەر چـەند چـەمكێك دەوەسـتم، كـە پەیوەنـدیان بـە دیاردەكـانی مردنـەوە هەیـە، وەك مردنـی خۆویسـتانەی بـەئاگاو مردنـی خۆویستانەی بێ ئاگا، مردنی خۆنەویستانەی بێ ئاگاو مردنی خۆنەویستانەی بـێ ئاگـا. پاشـان هـەر لـەم بەشـەدا لەسـەر نـەمری‌و مـردن تـەنیا لـەپێناو ئەزموونی مەرگدا بەكورتی وەستاوم.

١.مردنی خۆویستانەی بەئاگا:

مـردن بـۆ مـرۆڤ ناچـارییە، واتـە هـەر دەبێـت بمـرین. نـاكرێ مـردن ڕەدبدرێتەوە، بەڵام شێوەكانی فرەن، ئێمە لێرە لەسەر هەندێ لە شێوەكانی دەدوێین، بەدیاریكراویش مردنی خۆویستانەی بـەئاگا. مەبەست لـەم جۆرە مردن ئەوەیە. من خۆم مردن هەڵدەبژێرم. مـن ناچـارم بمرم، بـەڵام شـێوەی مردنەكەم هەڵدەبژێرم. بەواتا مردنێك، كە خـۆم بەهۆشـیاریەوە شـێوازەكەی هەڵدەبژێرم، ئەم جۆرە مردنە مەبەستدارە، بەچەشنێك بێ جیهانبینی نییـە، جیهانبینی لەگەڵدایە، چونكە ئاگاییانەیـە. ئـەم جـۆرەی مـردن لـە زۆر بـاردا خۆكوشتنە. مردن بۆ منە، ناشێ من نەمرم، بەڵام جۆرە هەڵبـژاردنێك هەیـە، كـە كەسـەكە خـۆی كۆتـایی بـەخۆی دێـنێ، واتـە خـۆی كۆتـایی بـەجۆری مردنەكەی دێنێ. یان بەكاتی مردنەكـەی. لـەم ئێسـتەو ئێرەیـەدا. نووسـەرێ فەیلەسـووفێك... هەستدەكات ژیـان لـەوە بـێ مانـاترە تـا تیـا بـژی. واتـە زانینەكە لۆكاڵی نییە، من هەڵنەهاتووم لە شتێ بەڵكو لە گشـت هەڵدێم. لـە جیهـان و لەوانیـدی و ژیـان...ئـەم مردنـە یـان خۆكوشـتنە دەشـێ دنیـا ڕاچڵەكێنێت، چونكە پەیامدارە، خۆكوشتنێكی لە خۆوەو بـێ مەبەسـتو بـێ پەیامو جیهانبینی نییە. خۆكوشـتنێكە لێكۆڵـەران‌و پسـپۆران ناچـار دەكـات

لەسەری بووەستن، لێکۆڵینەوە لەسەر کۆی ڕووداوەکەو بەرهەمەکانی کەسی خۆکوژ بکەن، تا لە پەیامو جیهانبینی کەسەکە بگەن. کاتێ سادقی هیدایەت، یان سیلان، غەزالەی عەلیزادە، چیزارە پاڤیزا، یاسەنینی شاعیری ڕووسی...خۆیان دەکوژن ناچارمان دەکەن ئاوڕبدەینەوە، ورد بینەوە، بۆ خۆدەکوژن؟

خۆکوژییەکی دی دەشێ تووڕەبوونێ بێت. تیرۆریستێك بۆ کردەی خۆکوژی ئەنجام دەدات، دەیەوێ دنیا بەوجۆرە بێ، کە خۆی یان ئەو ئایدۆلۆژیا یان دینەی لە پشتیەوەیەتی، لە ئەنجامی گوێنەگرتن لێی و ڕازینەبوون خۆی دەتەقێنێتەوە، ئەم کەسە کردەیەکی خۆویستانەی بە ئاگا ئەنجام دەدات، هاوکات خۆنەویستو نائاگاشە، لەو شوێنەی کە جیهانبینییەکە هی خۆی نییە، بەڵکو هی ئەو ئایدۆلۆژیا یان ئایدیایەیە، کە ئەوانیتر ڕەنگیان ڕشتووە، واتە وەك فەیلەسووفێك نییە، کە خۆی جیهانبینییەکی هەبێ بەرانبەر بە ژیانو جیهان. واتە کردەی تیرۆریستەکە هەم خۆویستی ئاگاییە هەم خۆنەویستی نائاگاییە. بەڵام خۆکوشتنی شاعیرانو هونەرمەنداو بیرمەنداو ئەم شێوەیە لەخۆ دەگرێ، کە خۆویستی ئاگامەندانەیە. بۆ نموونە لە "ئەفسانەی سیزیف"یدا ئەلبێر کامۆ پێیوایە خۆکوشتن گرفتی فەلسەفەیە نەك بواری دی[1]. هەروەها ڕایوایە ئەو بەهانانەی بۆ ژیان هەیە، بەهەمان شێوە دەتوانین بەهانە بدۆزینەوە بۆ خۆکوشتن. یان پرسیاری لە شێوەی ئایا ژیان شایستەی ئەوەیە تیا بژین؟. زۆرێك لە بیرمەندان بەها نابیننەوە لە ژیانکردنیان، لەم جیهانەدا بۆیە خۆیان دەکوژن، چونکە ژیانێك، کە بەهای تیا نەبوو ئیدی خۆکوشتن تاکە چارەسەرە. واتە بوونی واتاو بەها یاریدەدەرە بۆ ژیانکردن. بڕیاردان هەیە لەوەی، کە من نامەوێ بژیم و خۆم بکوژم.

با بیر بکەینەوە لە کوشتن، کوشتن کارێکی نەشیاوە، بێزراوە، کاتێ کەسێك، کەسێك دەکوژێ هۆکارو مەبەستی هەیە، بۆیە دەکوژێت، یان ئەوەتا تۆڵە دەکاتەوە(چونکە زوڵمی لێکراوە)، یان ڕقی لە کەسەکەیە، یان نایەوێت لەگەڵ ئەو بژی، یان مەبەستی داگیرکاریە... لە کردەی کوشتنەوە ڕەنگە باشتر لە خۆکوشتن تێبگەین، لەوەی کە خۆکوشتن بە کارێکی نەشیاوو کاری گەوج و شێتەکان دانراوە. ئایا خۆکوشتن ڕق لەخۆ بوونەوەیە؟ خۆکوشتن زوڵمکردنە لەخۆ؟ خۆکوشتن ویستی نەژیانە لەگەڵ ئەوانیتر؟ ئایا خۆکوشتن تۆڵەسەندنەوەی خۆیە لە ئەوان و جیهان و ژیان؟

ئایا خۆکوشتن لە خۆشویستنی خۆوە نییە بۆ ئەوەی بوونی گەندەڵ نەبێ لەم دنیایە، ژیان نرخی ئەوەی نییە، کە بۆی بژیت و تیا بژیت، مرۆڤەکان شایستەی ئەوەنین لەگەڵیان بژیت. بەشایستەی خۆتی دانانێیت... کەسی خۆکوژ خۆی هەڕەشە لەخۆی دەکات، دیارە هەڕەشەکردنەکەی پاڵنەری هەیە، پاڵنەرەکەی ڕەنگە دەستنیشانکردنی کارێکی گەلێ گران بێت چونکە بەپێی جیهانبینی کەسی خۆکوژ دەگۆڕێت، هەر خۆکوژێك چەندین پاڵنەری هەیە. بەڵام کەسی خۆکوژ لێرەدا بوێری و ڕەسەنی دەردەکەوێت، کە بڕیاری خۆی دەدات هەڕەشە دەرەکییەکان بکات بە هەڕەشەیەك لەخۆیەوە دەربچێت بۆ خۆی. واتە هێزەکانی دی دەوەستێنێت تا هێزی خۆی کارا بکات، لە کۆتایی هێنان بە خۆی. ئەوان هەڕەشە لە بوونی دەکەن، دڵنیایە دەدۆڕێت لەگەڵ ئەوان، لە ژیانکردنی لەگەڵ ئەوان و لە نێو جیهانـدا لەبەرئەوە دەیەوێ، بەدەستی ئەوان نەدۆڕێت، دەیەوێت خۆی کۆتایی بەم گەمەیە بهێنێت. ئەو دەیەوێ خۆی خۆی بدۆڕێنێ نەك ئەوان بیدۆڕێنن.

ئەم کەسە خۆی ناکوژێ بۆ ئەوەی خەڵکانی تر ڕازیبکات، ئەم خۆی دەکوژێ بۆ ئەوەی خۆی ڕازیبکات (خۆت کوشتووە بۆ خەڵکی تر). ئەم کە

خۆی دەکوژێ پێویستی بە دەرەوەی خۆی نییە بە ئاگایی بێننەوە لەوەی کە ئەمە نەکات. ئەم بەم کردەیەی دەیسەلمێنێ، کە بوونی خۆی لە بیر نەکردووەو ڕێگەی لە خۆی گرتووە، کە "بوونی لەگەڵ ئەوان"و "بوونی لەنێو"[٢] بوونی خۆی لێنەسێننەوە، واتە ڕێگەی لەوە گرتووە بتوێتەوە لەنێو و لەگەڵیان.

ئایا خۆکوشتن بە چەشنێ خۆبواردن نییە لە ژیان بۆ ئەوەی، کە نەبیت بە بار بەسەر شانی ئەوانیترەوە، کاتێ خودهۆشیارانە دڵنیایت لەوەی، کاتێ دەکەویتە ئەوەی کە خۆت نەتوانی خۆت هەڵسوڕێنیو خۆت بژێنی، ببیت بە بار بەسەر ئەوانیترەوە، ئیدی ڕێگە لەمە بگریتو خۆت کۆتایی بەخۆت بهێنیت؟ ئایا خۆکوشتن تاوانێکە من بەرانبەر بەخۆم ئەنجامی دەدەم؟ ئایا کەس سزا دەدرێت؟ سزاکە تەنیا خۆم نایچێژم، کە ئیدی منیش خۆم کوشتوە؟.

خۆکوشتن مەبەستەکییە، ڕەنگە خۆکوشتنی بیرمەندانو شاعیران بۆ نادڵنیاییو جۆرێك لە ڕاکردن بێت لە سنووردارێتی، کە داوای گشت بکەنو لە بەش ڕزگاربن "تازە کە وای لێهات یان هەمووم ئەوێ یان هیچ"[٣].

هەندێ خۆکوشتن هەیە، کە جۆرە تەنگە نەفەسبوونێکی تێدایە، کە شتێ دەزانم زۆر قورسە ناتوانم چۆن بە ئەزیزترین کەسی خۆمی بڵێم، عاشقان لەزۆر باردا بەمجۆرە کۆتایی بەخۆیان دەهێنن، چونکە عاشقی ڕاستەقینە دۆستو هاوسێی مەرگە، هەروەك ڕۆلان بارت دەڵێت "لە پانتایی عەشقدا، شەوق و ئارەزووی خۆکوشتن زۆرجار ئامادەیە و بە کەمترین بیانوو هەڵدەگیرسێت"[٤].

(هۆشیاری بەمەرگی خۆو بوونی جیهانبینی ئەوەیە، کە هەستبکەیت هیچ شتێ ناتوانێ باشترو جوانترو چاکتربێ لەم ژیانەدا جگە لەهەڵبژاردنی مەرگێگ بۆ خۆت، ئایا مرۆڤ تاکە بوونەوەرە، کە دەسەڵاتی خۆکوشتنی هەیە[٥]؟

ئایا مرۆڤ توانای دەستەمۆکردنی مردنی هەیە؟ بەوەی، کە (خۆکوشتن دەستەمۆکردنی مردنە، چونکە خۆکوشتنیش مردنە، بەلام بکەرەکەی دەیەوێت مردن دەستەمۆ بکات.[٦]

ژیان بۆ کەسی خۆکوژی خاوەن جیهانبینی لێوانلێوە لە ئازار، ئایا مردن ئازاراویە یان خۆکوشتن؟ بە بۆچوونی هیوم، "ئازار و بێبەهایی ژیان لە مردن و خۆکوشتن سەختترن"[٧].

خۆکوشتن دژی چاوەڕوانییە، خۆکوشتن ڕوودانەوەی قەرزی ژیانە(هەموومان مردنێ قەرزارین)، خۆکوشتن ڕێزگرتنی مەرگە، بەوەی کە بەپیرەوە چونی مەرگە، نەك چاوەڕوانی هاتنی بکەین، ئێمە دەچین بۆ لای نەك ئەوبێ بۆ لامان، خۆکوشتن بۆ ئەوان هەم جێگەی بەزەییەو هەم جێگەی تووڕەبوونە، بەلام بۆ" خۆ" هەلبژاردنە، ئازادییە، زوو گەیشتنە بەکاملێ، چونکە (گەر ژیان دوور لەئازارو ئارامی بووایە ئێمە پەنامان بۆ خۆکوشتن دەبرد؟ مردنێك، کە بە وتەی (ڤاندەر زیندەن) ناتوانین بیری لێ بکەینەوە چونکە بە هەموو ژیانمان لێی هەلدێین. واتە ژیان تا تنۆکێك ئارامی تیابێت، مرۆڤ پەنا بۆ ئارامییەکی موتلەقی وەك خۆکوشتن نابات. خۆکوشتن یۆتۆپیایەکی ئەبستراکتە و خۆکوژەکان (لەوێ!) دەگەنە سیستمێکی پێرفێکت و بێ ئازار. خۆکوشتن بەر لەوەش ئەزموون بکرێت و وەك یۆتۆپیا سەیر بکرێت، هەر کوێرە ئومێدێك بووە. نیچە لە کتێبی (لەو دیوی چاکە و خراپە)دا دەلێت: بیرۆکەی خۆکوشتن ئارامیبەخشێکی گەورەیە، دەتوانرێت بە هۆیەوە چەندین شەوی ناخۆش، بە خۆشی بگوزەرێنیت.[٨]

ئایا خۆکوشتن ساتەکیە، واتە من لەساتێکدا بڕیار دەدەم؟ بەبڕوای من خۆکوشتن بەدەرە لەمە، دیارە ئەو خۆکوشتنەی، کە جیهانبینی لەگەلدایە، وەك چۆن سادقی هیدایەت دەلێ ژیان لە پاش پەنجا سالی خلەفاندنێکی گەورەیە. کەسانی هەلهاتوو لە کێشەیەکی کۆمەلایەتی، خۆکوشتن بۆیان

ساتەکیە، بەڵام کەسی ئازادو خۆ بڕیاردەر خۆکوشتن بەجۆرێ وەك پرۆژەیە، واتە ئەم کەسە بە دڵنیاییەوە بڕیار دەدات، کە بوونی خۆی بداتە مردن، ئەم بوونی خۆی ڕووەو مردن ئاراستە دەکات، ئەم تەواویی بوونی خۆی دەردەخات لە بڕیارەکەیدا، ئەم بڕیارە تایبەتە بە بوونی، بڕیارێکی لاوەکی نییە، ئەم بڕیارە هەڵوێستە لە ئاست بوونیدا، ئەم کەسە خۆی لەنێو ڕاستیدا دەبینێتەوە، چونکە بڕیارەکە لە خۆیەوە دەردەچێت نەك لە کەسێکی دییەوە، ئەم کەسە بە تەواویی ئەو دەنگە دەبیستێت، کە لە وجودیەوە دێتە دەرێ، ئەو دەنگەیە بڕیاری خۆکوشتنی پێدەدات، چونکە ئەو دەنگە ڕایدەچڵەکێنێ بەوەی کە خۆی بێتو ڕاستگۆ بێ، ڕەسەنانە بڕیار بدات. ئەو کەسە دەزانێ بۆ خۆی دەکوژێ، هەڵهاتنی نییە، لەکولتووری جیهانێکی تایبەت، بەڵکو هەڵهاتنییەتی لەتەواوی ژیانو جیهان، ئەو بۆ ئەوە مەرگی خۆویستی هەڵنابژێرێ لەبەرئەوەی لە کولتوورێ هەڵبێ، ئەو دژی تەواوی ژیانە. بێ مانایی ژیان دەبینێ بەکامڵی(دیارە لەبۆچوونی کەسی خۆکوژەوە). ئەو پێیوایە" ئەگەر ماوەیەکی دیاریکراوت هەبێت بۆ ژیان چ واتایەکی هەیە بژیت یان بمریت، هەر هەمووی عەبەسێکەو ئێمەیەك بۆ بەدبەختیمان لەڕێی هۆشەوە درکی پێدەکەین و تامەرگ گیرۆدەی ئەو ڕاڤەکاریانە دەبین کە هەوڵی بەخشینی مانایەك بەژیان دەدەن، بەڵام وەك ڕاستییەك ژیان زۆر لەوە بێماناترە، کە ئێمە تەسەوری دەکەین و خۆمان پێوە سەرقاڵکردووە"[٩].

کەسی خودهۆشیارو خاوەن جیهانبینی، کە خۆی دەکوژێ لەبەرئەوە نییە، کە هەژاربێ، یان لەکەسێ توورە بێ، یان لەخوێندنگە کەوتبێ، یان هەڕەشەی لەسەر بێ، کەسی خۆکوژ لە هەژاری ژیاندا خۆی دەکوژێ، دەزانێ کە ژیان زۆر هەژارە لەمانادان بە ژیانی، ئەو لە تەواوی ژیان تورەیە، ژیانکردن بەهەڕەشە دەبینێ، ئەو نایەوێ لەتاقیکردنەوەی ژیاندا بکەوێ، یان

دلنیایە، کە لەتاقیکردنەوەی ژیان دەرناچێت، بۆیە خۆی دەکوژێ تا بە ژیان بڵێ، تاقیکردنەوەی مەرگ ئاسانترە لـە تاقیکردنـەوەی تـۆ. کەسـی خۆکـوژ دەسەڵاتی خۆی بەکاردێنێت بۆ ڕاگرتنی ژیان، خۆی لـەوە بـەتواناتر دەزانـێ کـە ژیـانێکی کـاتی سـنوورداری بکـات. کەسـی خۆکـوژ لـەجیاتی مـردن بەحەق(مردن حەقە) بزانێ، خۆکوشتن بەحەق دەزانێ.

کەسی خۆکوژ هەراو هوریا نانێتەوە، بەبێدەنگی خۆی دەکوژێت، بـەڵام بێدەنگیەك کە تەواوی دنیا بیبیستێت، بێدەنگیەکی پڕ دەنـگ، بێدەنگیـەك، کە تەواوی دەنگی دنیا دەوەسـتێنێت. ئـەم نایـەوێ مـردن بێـدەنگی بکـات، بەڵکو دەیەوێ مردن بێدەنگ بکات، تا گوێ لە پەیامی ئەم بگرێت.

کەسی خۆکوژ گوێڕایەڵ نییە، کەسێکی یاخییە لە ژیان و دنیاو تـەواوی کولتوورو ئایینەکان، ئەم پەشیمان نابێتەوە لە خۆکوشتن لەبەرئەوەی خەڵك یـان ئـایین دژی خۆکوشـتنە، ئـەم خـۆی دەکـوژێ لەبەرئـەوەی بـڕوای بـە خۆکوشتنە.

کەسی خۆکوژ لە ئازارێکی بچووك هەڵنایەت، کە زۆرینەی خەڵك لەمەرگ دەترسن، ئەم لێی ناترسێ، بوێرانـە و هۆشـیارانە ئـەزموونی مـەرگ دەکـات، ئەم مرۆڤە خۆیـەتی بـە تـەنیا ئـەم کردەیـە هەڵدەبـژێرێ، کردەیـەکی تـەواو خودی ئەنجامدەدات، گەر مردن بەرەو خودیمان ببات ئەوا ئەم جۆرەی مردن ناچارانە خودیە، پێویستە خودی بێ، چونکە گەر خودی نەبێ ئەوا بێگومـان لـەدەرەوەی مردنـی خۆویسـتانەی ئاگایانەیـە. لەلایـەکی تـرەوە ئـەم کەسـە بەئارامی و بەجوانییەوە خۆی دەکوژێ(خۆکوشتنی سـادقی هیدایـەت). ئـەم لە خۆکوشتنی کەس تاوانبار ناکات. ئەم نایەوێ ڕامبکرێـت، ئـەم ڕامدەکات، مـردن ڕامـدەکات، ئـەم دەیـەوێ خێرایـی مـردن بووەسـتێنێت، تـا خـۆی بەخێراییەوە بچێت بۆ لای (چـەند خێـرا بیـت پێشـی مـردن نادەیتـەوە) ئـەم پەلەترە لە مەرگ.

کەسی خۆکوژ چیدی بڕوای بەژیان نەماوە، متمانە بە مردن دەکات تا بە ژیان، ئەو باوەڕی بەپاداشت نییە، ئەو دژی بەڵێنەکانی دینە، ئەو بڕوای بەم هاوکێشەیە نییە (لەگەنجییەوە بۆ پیری لە پیرییەوە بۆ مردن). ئەو بڕوای بەوەیە بێ مانایی ژیان لە کوێدا دەرکەوێ، پێویست ناکات پاساو بدرێتەوە، ئەو ناترسێ، ئەو کەسێکە دوودڵ نییە لەوەی دەیکات، کەسێك نییە لای هەمووان بڵێ خۆم دەکوژم، بەڵکو بەبێدەنگی، خۆ دەکوژێت. ئەو بڕوای بەوە نییە، کە بە خۆکوشتنی دەستی سور دەبێ، ئەو کەس ناکوژێ بۆ ئەوەی بژی، ئەو دەمرێ بۆ ئەوەی کەس نەیکوژێ (ژیان نەیکوژێ)، ئەو نایەوێ نارەسەنانە بژی، بەڵکو ڕەسەنانە دەژی، وە ڕەسەنانە دەمرێ.

هاوکات دەشێت خۆکوشتن بۆ گەیشتنە کاملی بێت. واتە کاتێك لە ژیاندا کەسی گەڕۆك بە دوایی کاملبووندا وێڵەو نایگاتێ، بە خۆکوشتن پڕی بکاتەوە یان بە خۆکوشتن کاملی بەدەسبێنێت. هەروەك دەشێت دژ بەمە بڵێین ئەوەی خۆکوشتن دەردەکات هەوڵە بۆ گەیشتن بە کاملبوون، وەك ئەوەی فۆکنەر پێیوایە هەرکات نووسەر توانی بگاتە ئەوەی خەونی پێوە دەبینێت ئیدی هیچی بۆ نامێنێتەوە خۆکوشتن نەبێت[10]. واتە لە شکستەوە خۆکوشتن دێت، یان خۆکوشتن هیوای کاملبوونە یان بە گەیشتنە کاملبوونە لەم جیهانەدا ئیدی هیچ بۆ کەسی نووسەر نامێنێتەوە خۆکوشتن نەبێت!

مردنی یان خۆکوشتنی کەسی خاوەن جیهانبینی، بێ هۆ نییە، بەلام دەستنیشانکردنی هۆکە ڕەنگە تەواوی ژیان بخاتە ژێر پرسیارەوە، کاتی صادقی هیدایەت خۆی دەکوژێ، زۆر ئاگامەندانە ئەو کردەیە دەکات، ئەو خوکوشتنەکەی "نواندنی هەڵوێستە لە دژی ئەو دنیایەی، کە هیدایەت هەرچەندی کرد، نەیتوانی لەگەڵیدا بگونجێت، هەر بۆیە هەمیشە دەیگوت: ئەوە تەنیا مەرگە، کە هەرگیز درۆ ناکات و هەموو ڕێگاکان دەچنەوە سەر مردن"[11]. هیدایەتو ئەوانەی لەچەشنی هیدایەتن لەگەڵ ژیان ناگونجێن،

هەربۆیە بەس نییە مردنێك هەیەو فریادیان دەكات لەژیان، هەروەك جەمال غەمبار دەڵێت "بەس نییە مردنێك هەیەو تەنیایم لێدەسێنێتەوە"[١٢]. كەسی خوكوژ دڵی بەهیچ خۆشنابێ، بۆیە خۆی فریو نادات، ئەو ناتوانێ بژی، ژیانەكەی بریتییە لە بەڕێكردنی ڕۆژەكان، ئەمیش كێشەی ئەوەیە هۆشیاری هەیە، كە هەمیشە ئەم هۆشیاریە پاڵی پێوەدەنێت بۆ بوون، بۆ ڕەسەنێتی، ناتوانێ خۆی فریوبدا، مرۆڤە نارەسەنەكان دەتوانن خۆ فریوبدەن، بەدرۆكانی ژیان باوەردەكەن، بەڵام ئەم مرۆڤە خودهۆشیارە ناتوانێ باوەڕبكات، صادقی هیدایەت لەنامەیەكیدا بۆ هاوڕێیەكی جوان باسی دۆخی خۆی دەكات "ماندووم و دەزانم مێشكم تێك دەشكێت، وەك بە مەرگ حوكمدراوێك، شەو بە ڕۆژ دەگەیەنم، دەستم لە هەموو شتێك هەڵگرتووە، دڵم بە هیچ شتێكەوە نییە، نە دەتوانم خۆم فریوم بدەم، نە هێندە بوێریی شك دەبەم، خۆم بكوژم"[١٣]. بەڵام دواجار بوێربوو، وە ڕاستگۆیی نواندو خۆی كوشت.

بەڵگە نەویستە لەنێو دینەكاندا خۆكوشتن كارێكی نەشیاوە، واتە نەرێنییە. كەسی خۆكوژ بە كردەكەی خۆی لە بەهەشت دوور دەخاتەوە، واتە بە گشتی لە نێو ئایینە ئاسمانییەكاندا نا كردن هەیە بۆ خۆ كوشتن، وەك بۆچوونێك دەڵێین ڕەنگە مەبەست ئەمەبێ، كە كەسی خۆكوژ بەم كردەیەی جۆرە لاوازكردنێكی دەسەڵاتی خوا بەیاندەكات، كە تەنیا تۆ نیت دەكوژیت (لە زۆر دەربڕوادا خوا بە بكوژ دانراوە _ خوا من بكوژێ‌و نەجاتمبا). كەسی خۆكوژ، كە خۆی بڕیار دەدات بە جۆرێ ڕەتدانەوەیەكی دەسەڵاتی خوایە، كە من خۆم كۆتایی بە خۆم ئەهێنم نەك تۆ، لە ڕووە دینییەكەشەوە وەك خوێندنەوەیە دەڵێین نەرێكردنی خوكوژی، كە چەندین پاساویی هەیە لە دیندا دەڵێین ڕەنگە ئەمەش پاساوێك بێت، كە نە گوتراوە. چونكە ئەوانەی خۆیان دەكوژن دژی قەدەر دەوەستنەوە، خۆیان

قەدەری خۆیان ڕەنگرێژ دەکەن، دژی قەدەرن، خۆیان بۆ خۆیان، خۆیان دەکەنە قەدەر، ئەوان لەنێو ڕێکەوتدا ئارام ناگرن، بەڵکو ڕێکەتبوون ڕامدەکەن، بۆئەوەی مەرگ بهێننە نزیك خۆیان بە ڕێکەوت بڵێن، کە تۆ بێدەسەڵاتیت. ئەم کەسانە خۆیان هەم جەلادن هەم قوربانی، ئەمان خۆیان جەلادن بۆ خۆیان، بەڵام جەلادێکی مەترسیدار نا، بەڵکو جەلادێك پەشیمان نییە لەوەی دەیکات، جەلادێکی جوانە، بە ئاگایە، بێ زیانە بۆ کەس تەنیا بۆ خۆی مەترسیدارە، ئەویش لە دیدی ئێمەوە دەنا لەلای خۆی بە پێچەوانەوە کارێکی دروستو پێویستە بۆیە دەیکات.

ڕەشبینی ئەم مرۆڤە خۆکوژانە، لەخۆراو بێ بنەما نییە، بەڵکو هەڵگری واتای فراوانو وجودیە، لەبەرئەوەیە ڕێگە گرتن لەخۆکوشتنی ئەم مرۆڤانە ئاسان نییە. چونکە ئەمان پێیان وایە "مەرگ، هەموو وەهمەکان تێك دەشکێنێت، ئاخر هەموومان منداڵی مەرگین و هەر مەرگیشە لە دەست فێڵەکانی ژیان ڕزگارمان دەکات"(١٤). هەروەك، شۆپنهاوەر پێی وابوو، "خۆکوشتن هیچ زیان و کاریگەرییەك لەسەر ئیرادەی ژیان دروست ناکات و بەرانبەر هەر خۆکوشتنێکی ئەنقەست، هەزاران لەدایکبوونی نا ئەنقەست ڕوودەدات"(١٥).

ئەم مرۆڤە هۆشمەندانە نایانەوێت بە مەرگیان خۆیان نەمر بکەن، بەڵام لێکۆڵەرانو خوێنەرە باشەکانی پاشیان ئەم کارە دەکەن.

لێرەدا گرنگە لەسەر کوشتن یان خۆکوشتنی سوکراتو حەلاج کەمێ قسە بکەم. لەمێژوودا زۆرکات باسی ئەمان کراوە وەك شەهیدی ڕێگای حەقیقەت، یان ئەوان مردنەکەشیان لەپێناو ڕاستیدا بووە. ئایا کوشتنیان یان بەجۆرێ خۆکوشتنیان(بۆیە دەڵێم خۆکوشتنیان چونکە هەریەکێکیان ئەیانتوانی لەو دەمەدا لە مەرگ هەڵبێن). لەبەریەك خاڵی سادە خۆکوشتنی ئەمان جیاوازە، چونکە بڕوایان بەنەمری هەبووە، واتە وەك خۆکوژەکانی دی

نەبوون، کە دڵنیابن لەوەی لەپاش ئەم ژیانە ژیانێکی دی نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوان دڵنیا بوون کە ژیانێکی دی هەیە باشتر لەم ژیانە، یان حەلاج دڵنیابووە دۆستێك و مەعشوقێك هەیە، کە هەرگیز لێرە نییە، دڵنیابووە ئەوێی لێرە باشترە لەبەرئەوە بێ دوودڵیو بەخۆشحاڵییەوە پێشوازی مەرگ دەکەن. هاوکات ئەوان دژی ئەو سنوورەن، واتە ژیان بە سنوور دەزانن.

ئەوەی ماوەتەوە لەسەر ئەمجۆرە مردنی خۆویستانەی بە ئاگا، یان خۆکوشتنی خۆویستانەی بە ئاگا بیڵێم ئەوەیە، لەم نووسینەدا دەکرێ خوێنەر سەرنجی ئەوە بدات، کە من خۆکوشتنم گەلێ جوان کردووە، بە چەشنێ ئەوەی بیخوێنێتەوە حەز بکات خۆ بکوژێ! واتە لێرەدا من کارەکەم پێچەوانەی کارێکی ئیتیکیو نا مرۆیی دەبێت. بەڵام دەبێ لەم کۆتاییەدا بە چەشنێ ڕەخنەش لەمجۆرە مردنە بگرین، نەك لەبەرئەوەی بترسم تۆمەتبار بکرێم، چونکە ئەوە نیشانەی تێنەگەیشتنە، گەر کەسێ بەو جۆرە ئەم نووسینەم بخوێنێتەوەو لێی تێبگات. ڕەخنەکەشمان یان پرسیارەکەشمان بۆ ئەم مرۆڤانە، یان ئەوە کەسانەی کە خودهۆشیارن و بیر لە کردەیەکی بەم چەشنە دەکەنەوە ئەوەیە. دەبێ بپرسین ئایا بەم کردەیە خۆناخەنە ژێر باری بەرپرسیاریەت، بەوەی کە بەرگەی ئەم ژیانەتان نەگرت، بۆیە خۆتان کوشت؟ بە جۆرێ تر ئێوە مرۆڤی لاوازن، دەنا ئازایەتی ئەوەیە بەرگەی ئەم ژیانە بگری نەك لێی هەڵێیت؟ ئەم مرۆڤانە بە خۆکوشتنیان دەرگا لەسەر ئەگەرەکانی خۆیان دادەخەن، واتە چیدی توانای هەڵبژاردنیان نامێنێ، واتە ئەم کەسانە لە بوونی دازاینەوە(بە زمانی هایدیگەر) خۆیان دەکەن، بە هەبوویەکی دەرەکی، چونکە دەبنە کەرەسەی لێکۆڵینەوەکانی ئەوانیتر. لەلایەکی ترەوە ئەم مرۆڤانە بۆچی ناتوانن ژیانی خۆیان بگۆڕن، هەروەك دکتۆر محەمەد کەمال دەڵێت "باوەڕناکەم مرۆڤێ بتوانێ خۆی بکوژێت،

نەتوانێ ژیانی بگۆڕێت، چونکە خۆکوشتن، بڕیارێکی بنەڕەتی و مردنیش دواگۆڕانە...بە خۆکوشتن کۆتایی بە سەربەستییەکەی دەهێنێت، چونکە سەربەستی لە بووندایە نەك مردن"[١٦]. لەبەرئەوە ئەم کەسە ئازادی خۆی ڕەتدەداتەوەو بێ دەسەڵاتە لەوەی خۆبگورێت؟ چونکە بە مردن چیدی بە هیچی دی نابێن، چونکە بە پێی بۆچوونی هایدیگەر کەسی خۆکوژ کۆتا ئەگەرو هەڵبژاردنی خۆکوشتنەکەیەتی، چونکە هەموو ئەگەرێ ڕوو لە کۆتاییە، کەسی خۆکوژ خۆی دوا ئەگەر هەڵدەبژێرێ، کە چیدی لێرە نەبێ(دازاین بوون – لێرە)، ئەم دازاینە لێرە بێزارە و دەیەوێ بگاتە سەرجەمی بوونیو چیدی ڕوو لە ئەگەرێکی دی نەکات[١٧]، ئەو کەسە عاشقی کۆتا ئەگەرە، عاشقی دابڕانە بۆیە خۆی دەکوژێ. بەڵام ئایا دوا ئەگەر جۆرە شکستێ نییە لەم ژیانەدا، کە چیدی من توانای دامەزراندنی ئەگەری دیم نەماوە، چیدی من ناتوانم خەونم هەبێ، کۆشش بکەم بۆ بەدیهێنانی؟ وەك وتمان دازاین (یان مرۆڤ) تا لە ژیاندا بێ بە پێی بۆچوونی هایدیگەر "هێشتا نەبووە"یە، مانای وایە ژیانکردنی دەزاین، بەردەوام ئامادەیە بۆ بوون بەرەو پێشەوە یان خۆ ڕەتکەرە، چونکە مرۆڤ بە قەولی هایدیگەر بێ جەوهەرە جەوهەری لە بوونیدایە، ئەوەی تا لێرە بێ، "هێشتا نەبووە"یە، بەڵام کە لێرە نەماو خۆی کوشت چیدی نا توانین بڵێین خۆ ڕەتکەرە...بەڵام ئایا کەسی خۆکوژ دڵنیا نییە لەوەی کە بۆیە خۆ دەکوژێ چونکە دڵنیایە، کە ناتوانێ چیدیکە خۆ تێپەڕبکاو، بە واتایەکی دی نووسەرێ یان بیرمەندێ، چەند پرۆژەیەکی هەبووە تا ئەو دەمەی بوون – لێرە بووە، وە سەرکەوتنی بە دەستهێناوە، ئیستا ئەم بیرمەندە چیدی ناتوانێ کاری داهێنەرانەی دی بنووسێ، لەبەرئەوە کۆتا ئەگەر هەڵدەبژێرێ، چونکە دڵنیایە ناتوانێ کارە پێشترەکانی تێپەربکات، بە واتایەکی دی جۆرە بێ ئومێد بوونێکە لە توانای خۆ بۆ تێنەپەڕاندن، خۆ دەشبێ لە هەمبانەیدا

پرۆژەی بەرزترو بە نرخترو گرنگتر هەبێ، بتوانێ کاری گرنگترو بە نرختر بکات، بەڵام دڵنیایە، کە ئەوەی دەیکات بێ بەهایە، بێ واتایە، ژیان نا گۆڕێ هەروەك خۆیەتی، لەبەرئەوەیە، کە بڕیاری خۆکوشتن دەدات، بەڵام ئایا ئەوە پاساوە؟ لەلایەکی دییەوە کەسێ دەستی بچێتە گیانی خۆی ترسی ئەوە نییە دەستی بچێتە گیانی مرۆڤەکانی دی؟

ئایا ئەم خۆکوشتنە جۆرێ لە خۆپەرستی نییە، کە من نامەوێ بژیم لە ژیانێ کە مرۆڤی تری تیا بژی، یان من بە نەزان زانینی گشت مرۆڤەکان، یان بە کەم تەماشاکردنیان بەوەی کە من نامەوێ لەگەڵ ئێوە بژیم، ئێوە شایستەی ئەوە نین من لەگەڵ ئێوە بژیم؟

۲. مردنی خۆویستانە بێ ئاگا:

ئەم جۆرە مردن بەشێوەیەکی فراوان بڵاوەو بەردەوام لە گەشەدایە، لەلایەن دەزگاو لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە بودجەی بۆ تەرخان دەکرێت ڕێژەکەی کەمبکرێتەوە، لەبەرئەوەی لە ساڵی ۲۰۰۰دا یەك ملیۆن کەس لە تەواوی جیهاندا خۆی کوشتووە، واتە لە هەر ۲ چرکەیەکدا کەسێك هەوڵی خۆکوشتنی داوە، بە واتا لە هەر ٤٠ چرکەیەکدا کەسێك خۆی دەکوژێت. ئەم خۆکوشتنەش زیاتر گەنجان خۆیان دەکوژن، لە ئاکامی دۆخی دەروونیو کۆمەڵایەتیو ئابووری...ەوە سەرچاوە دەگرێت.(١٨)

ئەم جۆرەی مردن، وەك لە ناونیشانەکەیەوە دیارە، مردنێکە خۆویستە، بەڵام دوور لەهۆشمەندی خۆییە، واتە مردنێکە، جیاواز لە مردنی خۆویستانەی بە ئاگا، ئەم مردنە ئاگایانەیە، بەڵام ئاگاییانەیەکی تەسكو کەمبینو نا فراوان، بێ جیهانبینییە، ئاگاییەکی لۆکاڵییە، ئاگاییەکە پێویستییە، ئەم مردنە یان خۆکوشتن هەر کوشتنە، بەڵام ئەوەی دەکوژێت یان دەمرێنێت(گەر دەمرێنێت ڕاستبێت) منە. واتە ئەوەی ئەم کردەیە

ئەنجام دەدات منی خۆم، ئەو کردەیە ئەنجام دەدات، بەڵام دەشێ ئەو منە، منی ئاگایی نەبێت، یان منێك نەبێت کە بڕیارێکی ئاگامەندانەو هەڵبژاردنێکی دوور لە پاڵەپەستۆی دەرەکی بووبێت، بەڵکو دەشێت هەر منی ئەوان بووبێت ئەو کارەی کردبێت، واتە دەسەڵاتی دەرەکی و کولتوور و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان منی ئەوانی ناچار بەو کردە سەختە کردبێت، بۆیە ئەم کردەی خۆکوشتنە کردەیەکی لۆکاڵیەو جیهانبینی لەگەڵدا نییە، بەڵام ئاگایی تێدایە بەرانبەر بە کولتوور، یان کەسەکە کۆزانیاری کولتووری هەیە. بەڵام دنیابینی لەگەڵدا نییە، ئەم خۆکوشتنە جۆرێکە لە هەڵهاتن، چونکە گەر ئەمە نەکرێت ڕۆژانە ئەوانیدی هەموو دەقەیە دەمکوژن بەقسەو کردارەکانیان، بۆیە خۆکوشتن باشترە لەوەی ئەوان بمکوژن، وە کوشتنێك باشترە وەك لە دووبارە بوونەوەی هەموو ڕۆژێكو هەموو دەقەیەك(هەموو دەقەیەکی هەر مردنە).

ئەم خۆکوشتنە هۆکارەکانی گەلێکن، کە ڕەنگە پێویستی بە نووسینی کتێبێکی سەربەخۆ بێت، چونکە پاساوەکانی ئەم مردنە (یان خۆکوشتنە) لاوازن، مەبەست ئەوەیە، گەر کەسێکی وریا هەبێ لە نزیك ئەو کەسەی دەیەوێ وەها کرداری ئەنجام بدات، ئەوا ڕەنگە ئاسان بێت پەشیمان کردنەوەی، چونکە ئەم کەسە زیاتر هەڵچوون و خۆ خواردنەوەیەك ناچاری دەکات، یان پەراوێزخستن یان ترس تا چاری وەها کردەیەکی دەکات. ئەم کەسە، کە بڕیاری خۆکوشتنیش دەدات بەڵام هەر دوودڵە لە کردارەکەی ناوێرێت، لەبەرئەوەیە زۆرکات ئەم کەسانە بەجۆرێ هەوڵی خۆکوژی دەدەن، کە ڕەنگە مەبەستیان (بە مەبەست) ئەوەبێ کەسێ ڕزگاریان بکات(خۆ سووتاندن زۆرکات بە نەمردن کۆتایی دێت). یان لە زۆر باردا هۆکاری خۆکوشتنەکەی زۆر ئاشکرایە، ڕەنگە لێکۆڵەران زۆر ماندوو نەکات. تەنانەت ئەم کەسانە جۆرە باسکردنێکیشیان هەیە بۆ خۆکوژییەکەیان تا پێشتر وەك

ئاگادارکردنەوەیەك بێ بۆ کەسانی پەیوەندیدار(خزم و کەسوکاری یان هەر لایەنێکی تر)، واتە ڕەنگە مەبەست ئەوەبێ، کە ئەم ئاگادارکردنەوەیە وەك هێزێك یان چەکێك بە کاربهێنن.

ئەم مردنە خۆویستیە لە زۆر باردا خۆ نەویستیە، چونکە نا چارانەیە لەلایەن ئەوانیترەوە، یان کەسی خۆکوژ نەیتوانیوە خۆی ئەو بڕیارە بدات، شتێك ناچاری کردووە، مردنی ئەم کەسانە ساتەکیە، واتە لەو ساتەدا گەر کەسێ ئاگاداربێ دەتوانێ بەری پێ بگرێ. هەڵبژاردنی ئەم کەسە، بە دنیابینییەکی قووڵەوە نییە بۆ ژیان، بەڵکو زۆر کات لە گرێیەکی دەروونی یان دڵشکاندنێك یان شکاندنەوە، یان بایەخ پێنەدان، یان ترسێ لە کەسێ(مامۆستا- باوك- براگەورە- دایك...). ئەم کەسە کە خۆشی دەکوژێ هەست بە لاوازی و کەم ئیرادەیی دەکەیت (واتە جۆری خۆکوشتنەکەی پێت دەڵێت ئیرادەی خۆکوشتن لاواز بووە)، تەنانەت خۆکوشتنی ئەم کەسانە لە کاریگەری ڕوانین لە میدیاو فیلم...ەکان بەدەر نییە، بە واتایەکی تر زۆرترین شت کاریگەریان لەسەر دادەنێت، چونکە لاوازن، نەك ئەوەی جەنگی مەرگ بکەن، بەڵکو زوو دەشکێن و بێ بەرگرین لە ئاستیدا. ئەم کەسانە ژیان بە پڕی نابینن، وەك ئەوەی ژیان توانای لەخۆگرتنو مانای نەمابێ، ئەوان مانا لەشتی کەم بەها دەبیننەوە، بەهای ژیان لەشتە وردەکاندا دەبیننەوە، (دەرچوون لەخوێندنگە). ژیان بە تەواوی نابینن، لەبەرئەوە ڕەنگە گرفتە سادەکەیان چارە بکرێ خۆیان نەکوژن. ئەوان زۆرکات گرێی هەست بە کەمی کردن هانیاندەدات خۆبکوژن.

ئەم کەسانە، زۆرکات بە دەم دەڵێن "خۆمان دەکوژین با نەجاتمان بێت" (کەم دایك هەیە لە کورددا ئەمەی نەگوتبێ) بەڵام لە ڕاستیدا ناوێرن، بێگومان نەبوونی ئیرادە لای ئەم کەسانە، هۆکاری زۆرە دەشێ ئاین زەقترینیان بێ، چونکە بێ بڕوا دەبن، بەو کردەیە. هاوکات ئەو کەسانە لە

زۆر باردا خۆکوشتنەکەیان ڕەسەنانە نییە، جگە لەوەی هۆکارگەلێ لە پشتیەوەیە هاوکات بڕوایەك بەو دنیا "نەمری" هەیە، هەربۆیە زۆرکات لە ترسی بێ بڕوایی خۆناکوژن.

بۆ باشتر ڕوونکردنەوەی ئەم جۆرەی خۆکوشتن، کورتە ڕۆمانێکی(نۆڤلێت) گابرێل گارسیا مارکیز بە نموونە دەهێنینەوە، بەناوی "دەریاوانە خنکاوەکە"[١٩]، لە ڕۆمانەکەدا، دۆخێکی نامۆو ئاشنا بەسەر کەسێتییەکەدا دێت. ئەم کەسێتییە لەنێو دەریادا گیر دەخوات، واتە دەریاوانەکە پێویستە بێتەوە سەر وشکانی، بەڵام ناتوانێ بەهۆی گرفتێکەوە کە بەسەر بەلەمەکەیدا هاتووە. ئەم دەریاوانە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی ڕزگارکەرێکە، وەلێ کەس نییە، ئەم بەتەنیا چاوەروانە، چاوەڕوانی، کە دۆخێکی سەختە، کاتێ ئەم چاوەڕوانییە دوور لەکەسی دی بێ‌و کەس نەبێ دەردەدڵی خۆتی بۆ باسبکەبت، واتە چاوەڕوانییەکی بێ پشت‌و پەنایە، چاوەڕوانی بێزراوە، چاوەڕوانییەکە گرانترە لەمەرگ؟ ئەم کەسێتییە هێدی هێدی بێ ئومێد دەبێ، لەبەرئەوەی چاوەڕوانییەکەی بێ وەڵام دەبێ، چاری نامێنێ ئەم کەسێتییە، جگە لە چەند هەڵبژاردنێکی ناچارانە، بەوەی، کە لە چاوەڕوانی مەرگدا بێت، واتە خواردنی تەواو دەبێ و بێ هێز دەبێ، ورەی نامێنێ، ئومێدی دەداتە کزی‌و چراکەی کزدەبێ تا نزیك کوژانەوە، واتە چاوەڕوانی مەرگ دەکات، کە لەبرسێتیدا بمرێ... یان ئەوەیە خۆی بیر لەوە بکاتەوە خۆی بەجۆرێ کۆتایی بەخۆی بهێنێ! واتە هەڵبژاردنەکانی گەلێ سنووردارە، یان چاوەڕوانی مەرگ لەو دۆخەی کە تێیدایە یان کۆتایی بەخۆ هێنان(بیرکردنەوە لەوەی چۆن خۆی کۆتایی بەخۆی بهێنێ). ئەم کەسێتییە بڕیار دەدات مادام هەر دەمرێ چاری نەماوە، هیچ ڕێگە نەماوە تا پەنای بۆ بباتو ڕزگاری بێت، ئەوا باشترە بیر لەوە بکاتەوە خۆی کۆتایی بەخۆی بهێنێ، هاوکاتی بیرکردنەوە لەوەی، کە چۆن خۆی کۆتایی بەژیانی خۆی

بهێنێ، درندەیەکی دەریایی خۆی هەڵدەدات ئەم کەسێتییەمان بخوات، بەڵام کەسێتییەکە لەو دەمەی بیر لەخۆکوژی دەکاتەوە ڕادەچڵەکێت، واتە لەدەمی بیرکردنەوە لە کۆتایی بەخۆهێنان، لەنێو دەریاوە وەك بڵێی ئەم خۆی بانگیکردبێ، گوێی لەبیرکردنەوەی ئەم کەسێتییە بووبێت، دێت بۆ ئەوەی لەو دۆخە ڕزگاری بکات، بەڵام کەسێتییەکەمان ڕادەچڵەکێتو خۆی دوور دەخاتەوە. بەواتایەکی دی وەك بڵێی ئەم کەسێتییە داوای هاوکاری دەکات، بەڵام کاتێ هاوکارییەکە دێت ڕەدی دەکاتەوە.

واتە لێرەدا گومانی ناوێ، کە ئەم کەسێتییە ناڕاستگۆیە لەگەڵ خۆ، لەژێر ناچاریدا پەنا بۆ خۆکوژی دەبات، خۆی نایەوێت ژیانی کۆتایی پێ بێت. بەواتایەکی دی خۆکوژییەکی خۆویستانەی بێ ئاگایە، واتە بە ئاگاییەکی چڕەوە بڕیاری خۆکوژی نادات، بەڵکو بە ناچاری بڕیار دەدات. گەر بەوەهمیش لە ئومێدی ڕزگاربوون لەو دۆخەی هەبێ بیر لەوەناکاتەوە خۆی بکوژێت. ڕاستە خۆی بڕیار دەدات خۆی بکوژێ، بەڵام ئاگاییەکی قووڵ نییە، جیهانبینی لەگەڵ نییە، بەڵکو هێشتا ژیان خۆشەویستترە لەمەرگ(هەربۆیە ڕادەچڵەکێت). ئەم درۆ لەگەڵ خۆیا دەکات، کە بیر لەمەرگ دەکاتەوە، بەڵام ناچارە. بە واتا بیرکردنەوەی دەریاوانەکە لە خۆکوشتن، لەوەوە نەهاتووە کە ژیان مانای نەماوە، یان ژیان شایستەی ئەوە نییە تیا بژی، ئەو لە ژێر فشارێکی دەرەکیدا بیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە. ئەم نایەوێت بە ڕەزیلی بمرێت. ئەم دۆخێك وایلێدەکات بیر لە خۆکوشتن بکاتەوە، نەك ژیان هاندەری بێت.

ئەم جۆرەی خۆکوشتن هێندەی ئەویدی من کوشتنە هێندە خۆکوشتن نییە. ئەوانیتر بەتانەکانیان، بە ترسان لێیان من ناچاردەکەن خۆ بکوژم. هەر لەمجۆرەدا سەرنجی ئەوە دەدەین مرۆڤگەلێ هەن خۆ دەکوژن بۆ ناودەرکردن، واتە ئاگاییەکی لاوازو ووڕێنەریان هەیە، بەوەی من چیم لە

دەست دێت ناو دەربکەم، واتە گرێی هەست بە کەمی کردنیان هەیە، هەوڵدەدەن بە جۆرێ خۆ بکوژن، کە ببنە ناو، نەك بە جیهانبینییەکی قووڵەوە کردەی خۆکوشتن ئەنجامبدەن.

کەسێ کۆزانیاری لۆکاڵی کۆمەڵایەتی هەیە. ژنێك هەڵدێ لەئازاری تانەکان لەوەی کردەیەکی نەشیاوی (نەشیاو بۆ ئەو کۆمەڵگەیە). کردووە بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژێ بەتانەکانی ئەوان نەمرێ خۆی دەکوژێ. یان خۆکوشتن لەوەی لەچوارچێوەی دەروونی کە هەڵچوونێکە، خۆشەویستەکەت لێت زویر دەبێت. یان خۆکوشتن وەك جۆرێ لەهەڕەشەکردن (وەك چەکێك بۆ بەرامبەر)... یان خۆشیرینکردن... لەدۆخە جیاوازەکاندا بەرجەستە دەبێت. لەحزەی خۆکوشتنی خۆویستانە جۆرێ لەخۆنەویستییە، واتە جۆرە ناچارەکیەکە. ئەوانیدی ناچارت دەکەن."دەریاوانە خنکاوەکە" بڕیاردانێکی ناچارەکی، هەندێکات بێهۆشییە. واتە گەر ئەو دەمە کەسێ قسەی بۆ بکات"ورەی بداتێ" ڕەنگە خۆی نەکوژێ. بەڵام لەخۆکوشتنی خۆویستانەی بە ئاگادا بەمجۆرە نییە، نموونەی سادقی هیدایەت."ژیان لەپاش پەنجا ساڵی خڵەفانێکی گەورەیە".

### ٣. مردنی خۆنەویستانە بە ئاگا:

من دەزانم، کە مردن ئەگەرێکی منە، من کە دێمە جیهانەوە لەگەڵ خۆم مردن هەڵدەگرم، واتە بوونی من پەیوەستە بە مردنەوە. بەڵام لایەنی جوانی خۆشی ژیان وام لێدەکات مردنم نەوێت. من نامەوێت بمرم، چونکە ژیان زۆر لەوە جوانترەو چاکترە، کە بەمردن کۆتایی بێت. سەرەڕای ئەوەی دڵنیام، کە مردن یەکێکە لەئەگەرکانی من بەڵام هەر نامەوێ بمرم. لەبەرئەوەی من دڵنیام بە مردن گشت ئەگەرەکانی بوونم بە کۆتا دەگەن. جوانی ژیان لەهەڵبژاردنەکاندایە. ئازادی من لەژیانکردنمدایە نەك لە مردن. ئەم جۆرەی

مـردن ناچـارییە دەنـا خواسـتی مـردن نییـە. ئـەو کەسـانەی بـەمجۆرە بیردەکەنەوە مردن بە ڕاستی خۆیان دەزانن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێیانوایـە هەمیشە ژیان جوانترە تا مردن. ئەوان گەر دەسەڵاتیان هەبوایە هـەرگیز نـە دەمردن. ئەوان عاشقی ژیانن، بەها لە ژیاندا دەبیننەوە نـەك لـە مـردن. ئـەم بیرمەنـدو شـاعیرانە زیـاتر دژی بەرانبـەرەکانیان دەوەسـتنەوە لـەوەی خۆبکوژن، ئەوانـە بـە زەوقـەوە ژیاندەکـەن، پێیانوایـە مـادەم ژیـان کاتییـە دەبێـت ڕێـز لـەو کاتـە بگـرن‌و وەکخـۆیی تیـا بـژین. ئەوانـەی بـەمجۆرە بیردەکەنەوە بە کارەکانیان بەجۆرێ دژی مردن دەوەستنەوە، یان مـردن لـە یاد خۆیان دەبەنەوە، کاردەکەن تا زیـاتر خۆیـان بدۆزنـەوە، زیـاتر بـەها بـە ژیانیان بدەن. ئەم مرۆڤانە خودهۆشیارن و خۆ لـە گێلـی نـادەن بـۆ ئـەوەی مردن لە یاد خۆیان ببنەوە، ئەمانە ستەم ناکـەن وەك بڵێـی هـەرگیز نـامرن، ڕاستە خواستی هەرگیز نەمریان هەیە، بەڵام نەك چاوچنۆکانە بەهایی مـادیی فریوی دابن.

هاوکات هەندێك لەم مرۆڤانە لـە خۆپەرستیانەوە، گەیشـتونەتە ئـەوەی مردن ڕەتبدەنەوە. واتە بە ئاگاییەوە و لە خۆویستییەوە دەیانـەوێت مـردن ڕەتبکـەن، هــەتا ئەمــە دەتــوانین بڵــێین لــە زۆرێــك قارەمانانــەی نــاو ئەفسانەکانیشـدا ببینینـەوە، جگەلـەوەی ئـەم خۆویسـتییە ئاگاییـە کـارێکی کردووە، لە نێو بێ ئاگاییدا کەسەکە نوقم بێت.

بە واتایەکی دی ئەم کەسـە لـە دووڕیانێکدا گـیری کـردووە، بـە ئاگایـە لـەوەی مـردن هەیـە، بـەڵام ناشـیەوێت بـاوەڕی پـێ بکـات. واتـە لـە نێـوان خۆئاگایی‌و ئاگایی لە مردن‌و ناکردنی مردندایە. لەبەرئەوە ئاساییە گـەر ئـەم کەسە بەردەوام لەنێو ترس‌و قەلەقییەکی زۆردا بژی. هاوکات دژایـەتی مـردن دەکات، بەڵام مردن هەمیشە براوەیە !

لەلایـەکی دییـەوە دەشـتوانین ئەمـە لـە نێـو هەنـدێك لـە ئایینەکانـدا ببینینەوە، بەڵام بەشێوی جیاواز. ئەو ئایینانەی بڕوایان بە کراسگۆڕین یان نەمری هەیە(لە بەشی یەکەمدا ئەمەمان باسکردووە) دەکرێت تێرکەری ئەم ویستە بێت.

٤. مردنی خۆنەویستانە بیٚ ئاگا:

سەرەڕای ئەوەی کە من ئاگاییەکی قووڵم بەرانبەر بەمردن نییـە، بـەڵام ناشمـەویٚ بمـرم، نـازانم بـۆ نامـەویٚ بمـرم، نەزانینەکـە مەبەسـت لایەنـە ئینسـانییەکەی ژیانـە. بەدەسـتخۆی بێـت هـەرگیز نـەمرێت. ئـەم مرۆڤانـە بەشـێوەیەکی تـەواو تووشـی سەرلێشـێواوی بـوون، لەبەرئـەوەی ئـەوەی هەردەبیٚ ئەزموونی بکەن لێی هەڵدێن، بەڵام هەر دەدۆڕێن. ئەوەی بـەمجۆرە بیردەکاتەوە گوێی خۆی گرتووە بۆ ئەوەی گوێی لەدەرەوەی خـۆی نـەبێت. ئەم کەسانە بەها بیٚ بەهاکان فریویانداوە. زۆرکات کەسـی هـەژار بـە کەسـی دەوڵەمەند دەڵێت بۆ کێـی کـۆ دەکەیتـەوە هـەر دەمریـت! ئـەو کەسـانە بـە ئاگابوون لەو شتانەی فریویان داوە ئاگایی لە مردنی نەماوە. هەر لە ڕاستیدا ئەو مرۆڤانە خاوەنی خۆ نین (کە من بە خۆش دامنـاون) لەبەرئـەوەی ئـەوان خۆیان دۆڕاندووە بە شتە کەم بەهاکان.

ئەم کەسانە وا دەزانن نامرن. واتـە هێنـدەی ژیـانی بەڕێـدەکات هێنـدە نازیٚ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە جۆرە هەڵهاتنێکی لەمردن هەیەو دەڵێی مردن هەرگیز بۆ ئەو نییە. جۆرە خووگرتنیو ئولفەتێکە لەگەڵ ئەم جیهانـەو ماڵەکەیو کەسەکانو پارەکانی... هەیە، کـە بـەردەوام لەهـەوڵی ڕاکردندایـە لەمردن بیری لێناکاتـەوە. لێـی دەترسێت نـەك نیگـەران بـیٚ. ئـەم لـەجیاتی نیگەرانی بوونی خـۆی بێـت نیگـەرانی شـتەکانییەتی. ئـەو لـە مردنـی خـۆی ناترسـیٚ، لەبەرئـەوەی لـەبیر خـۆی بردۆتـەوە، بـەڵکو لـە مردنـی شـتەکانی

دەترسێت. ئەم مرۆڤانە نرخی مرۆڤ نازانن، لەبەرئەوەی مردنیان لە بیرخۆیان بردۆتەوە، مردن بەها بەخشە بە مرۆڤ، بەڵام ئەم کەسانە لەبەرئەوەی مردنیان لە بیرخۆبردۆتەوەو بیری لێ ناکەنەوە، بەهای مرۆڤیش لایان سڕاوەتەوە. لە بنەڕەتدا بەهای خۆیان لەیادکردووە ئەوکات مرۆڤەکانی دی. ئەم مرۆڤانە لەبەر دیدەی مرۆڤەکانی دی خۆشەویست نین، بەردەوام تانەیان لێدەدرێت، چاوچنۆکن و گوێ بە ژیانو بەها مرۆییەکان نادەن. چاوچنۆکی ئەم مرۆڤانە گەیشتۆتە ئاستی چاوچنۆکی لەبەرانبەر مردنیشدا! بەڵام مردن لا لەم مرۆڤانە ناکاتەوە، کە دەیانەوێت مردن خۆی لە ئەرکی خۆ لادات، ئەو چەند بێئاگاو خۆلادات، بەڵام مردن زیاتر بە ئاگاو خۆنزیککەرەوە دەبێت لێی. مردن بۆ ئەم کەسانەی خۆ بە خاوەن دەسەڵاتی ڕەها دەزانن، دێتو لە دەسەڵاتیان دەخات. جارێکی دی مردن دێتو دەڵێت من دەسەڵاتی ڕەهام هەیە نەك تۆ!

٥. نەمری:

کێ هەیە بتوانێ نەمرێت؟ ئایا نەمری نا کردنی مردنە؟ گەر مرۆڤ "هەر ئەبێ بمرێ" بێ ئیدی نەمری بۆ؟ ئەم لووتبەرزیو خۆباڵاکردنە لەکوێدا بەدی دێت! ئایا مردن فریو دەدرێت؟ بیرکردنەوە لەوەی نەمربی خۆفریودان نییە؟ نەمریش بۆخۆی جۆرێ لە مردن نییە، یان ئەوەی خۆ دڵخۆشکردنێ بێت لەم دنیایەدا، گەر دنیایەکی دی هەبێو هەموو مرۆڤەکان بمرین! ئایا نەمری فێڵکردن نییە لە زەمەن؟.

ئایا مرۆڤ، کە نەتوانێ خۆی نەمر بکات دەتوانێ کارێك بکات نەمربێ؟ ئایا ئایدیای نەمری تەنیا تایبەتە بە مرۆڤ؟ ئایا نەمری = ژیان؟ ئایا نەمری بڕینی سنوورەکانی کاتە؟ ئایا تەنیا خودا نەمرە؟ ئەی مرۆڤ، کە بەشتێ دەڵێ نەمرە مەبەستی ئەوەیە، بڵێ منیش توانای نەمرکردنم هەیە؟

داهێنەرێك، كە كارێكی داهێنەرانە دەكات، دەڵێین نەمرە، مەبەست ئەوەیە ئەویش وەك خودا نەمرە، چونكە وەك چۆن خودا داهێنەرە ئەویش داهێنەرە؟ یان مەبەستمان ئەوەیە تا مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییە بمێنێ ئەو كارەی ئەو لە یاد ناكات، واتە جۆرە وەفایەكە؟ ئایا ئێمە، كە دەڵێین ئەم دەقە نەمرە مەبەستمان ئەوەیە لە رێگەی دەقەكەوە نووسەرەكەشی نەمر بكەین؟ چونكە دەقەكە لە بوونی نووسەرەكەیەوە دەرچووە؟ ئایا كێیە بڕیار لەسەر نەمری دەقێك یان نووسەرێ دەدات؟ ئایا خودی خۆیەتی یان مرۆڤە زیندووەكانن یان كارەكانییەتی؟ ئایا نەمرەكان ئەوانەن، كە هەڵدێن لە مردن یان مردن دەرەقەتی ئەوانە نایەتو ناتوانێ لە ناویان ببات؟ ئایا ئەو نەمرییەی دەیدەینە نووسەرێكو كارەكەی ژیانی مانادار كردووە؟ ئایا بۆ خۆی نەمری تەنیا لە پشت ئەم ژیانەوە نییە؟ ئەم نەمرییەی ئێرە تاچەند دژ وەستانەوەی نەمری پشت ژیانە؟ ئایا ئەو نەمرییە بێ بەهاكردنی ژیان نییە؟ بەڵام ئەم نەمرییە بۆیە نەمرییە، چونكە واتایەكی بەژیانداوە، بەردێكی خستۆتە سەر باڵای ژیان؟ ئایا مەرگ لە هەندێ باردا هەڵخەڵتێنەر نییە، بەوەی ژیانی تاكەكان بەكاردەهێنن لە پێناو بەرژەوەندییەكی سیاسی یان ئایدۆلۆژی؟

ئەم پرسیارانە هەریەكەو دەرگای خۆی هەیە بۆ وەڵامدانەوە، بەڵام خۆدەشبێت خوێنەر بەشداری بكات، لەبەرئەوە زۆرێك لەم پرسیارانە لەبەردەم خوێنەردا بە كراوەیی جێدەهێڵین. هاوكات زۆرێك لەم پرسیارانە وەڵامدانەوەی پێویستە خودی بێت، لەبەرئەوەی بڕوایەكی پێویستە، واتە گەر من وەڵام بدەمەوە بە لۆژیك ناتوانم وەڵام بدەمەوە پێویستم بە بڕوایەك هەیە، تا لەوێوە وەڵام بدەمەوە، یان ئەوەتا خۆم بۆ خۆم بڕوای خۆم دەربڕم بێئەوەی پشت بە بڕوایەكی تایبەت بكەم.

تێبینی ئەوە دەكەین لە مێژوودا هەندێك هەن بە بەخشینی ژیانیان لەم دنیا نەمری بۆ خۆیان دابین دەكەن، ئیدی بەخشینەكە لە پێناو ڕاستی بێ

یان عەشق...(سوکرات–حەلاج...). نەمری ئەوەیە، کە خۆت لێرەنیت‌و بەڵام باسدەکرێیت یادتدەکرێتەوە، ناوت لەسەر زوبان‌و لە نێو کتێبەکان دەمێنێتەوە، یادکردنەوە بەجۆرێ کۆششە بۆ نەمرکردن. "ون بیت بەبێنەوەی بمریت، یاخود بمریت بەبێنەوەی ون بیت"[٢٠] دێریدا لە یادی مۆریس بلانشۆدا ئەمەی وتووە، مەبەستی ئەو نەمرییەیە، کە ڕاستە ئەو مردووە، بەڵام ون نەبووە، چونکە باسی دەکەین، یادی دەکەین، بەرهەمەکانی دەخوێنینەوە. مرۆڤگەلێ هەن ئەمرن و بیردەچنەوە، چونکە هیچیان بە جێنەهێشتووە بۆ مرۆڤایەتی تا یادی بکرێتەوە. بەڵام ئەم نەمرییەش پرسیار هەڵگرە لەو شوێنەی ئەو مرۆڤانەی بڕوایان بەم دنیایە هەیە وەك کاتی، واتە ئەم دنیایە کاتییە، لە دیدی ئەم مرۆڤانە نەمری ئەوە نییە، بەڵکو نەمری ئەوەیە بتوانیت بۆ ئەو دنیا کار بکەیت بە جۆرێ کارەکانت ژیانێکی بەهەشتیت پێببەخشن، واتە کاری ئەم دنیا هۆکاربێت بۆ نەمری ئەو دنیا نەك ئەم دنیا.

پێموایە، مرۆڤ بەراستی توانای هەیە نەك دەقەکەی بەڵکو کەسێتییەك لە نێو دەقەکەشی نەمر بکات. ئێمە لەم نووسینەدا ناتوانین بڕیار بدەین، ئایا نەمری دەکرێ تەنیا مەبەست نەمری بێ لەم ژیانە؟ بەواتا لە دیدی ئەو مرۆڤانەی، کە بڕوایان بەژیانێکی دی هەیە نەمری واتایەکی دی هەیە. لەبەرئەوە نەمری ناتوانرێت یەك لا کەرەوە بێت، بەڵام ئێمەی مرۆڤ فێربووین، ئەو نووسین‌و کەسێتی و دەق و کارانە بە نەمر بزانین، کە بۆ ماوەیەکی زۆر (زۆرتر لە تەمەنی مرۆڤ) ماونەتەوە، باسدەکرێن.

بە واتایەکی دی ئەمجۆرە نەمرییە دەشێ ڕەمزێك بێت. چونکە ئەوە مرۆڤە، کە نەمری دەبەخشێت، هاوکات بە دیوە دینییەکەدا خواش نەمری بەمرۆڤداوە لەوەی، کە لە ڕۆحی خۆی مرۆڤی خولقاندووە، پەیوەست بەمە وەك پێشتر باسمان کرد ئایا مرۆڤیش بە بەخشینی ڕۆحی خۆی‌و بوونی خۆی

لەنێو دەق‌و بەرهەمەکان‌و ئایدیاکانیدا نەمری بەم کارانە نابەخشێ؟ واتە هەماهەنگییەك لە نێوان بەخشینی ڕۆحی خوا بۆ نەمری مرۆڤ و بەخشینی ڕۆحی مرۆڤ بە دەقەکان‌و نەمری بۆ دەقەکان پێکنایەت؟، واتە لێرەدا مرۆڤیش کۆششی خوابوون دەکات، کە توانای کارێکی هەیە، کە نەمری بکات، کارێکی داهێنەرانە نەمری دەبەخشێ، مرۆڤ نەمری لەم دنیا بۆ خۆی مسۆگەر دەکات، بەدیوە ئایینییەکەش خوا نەمری ئەودیو ژیان مسۆگەر دەکات. واتە مرۆڤ نەمریی خۆی لە ژیانێکی دیدا لە دەرەوەی دەسەڵاتی خۆیدایە، بەڵام لەم دنیایەدا خۆی و تواناکانی و ئەگەرەکانی خۆی دەتوانن نەمری خۆیان بەدەست بهێنن. لێرەدا دەشێ بیر لەوە بکەینەوە، کە خەونە لە مێژینەکەی مرۆڤ بە وەهم بێ یان بە ڕاستی (واتە ئەمانە وەهم بن یان ڕاستی) کۆششی هاتنە دی بۆ دەکرێت. نەمری ئاسان نییە، لەبەرئەوە نەمری بەهایە، کەمن ئەوانەی نەمرن، بەڵام زۆرن ئەوانەی دەمرن، لەبەرئەوە وەك چۆن لە ئەفسانەی کۆنیشدا نەمری مەرجدارو ئاسان نەبووە، ئێستاش بەهەمانشێوە نەمری بڕست‌و توانای زۆری گەرەکە.

مردن ڕوودەدات، بەڵام ئەی نەمری ڕوونادات؟ ئەمە گرفتە هەم لە ڕووی زەمانییەوە هەم لە ڕووی کەتوارییەوە، چونکە بۆ نموونە کاتێك باسی کارێکی نەمر دەکرێت، مەبەست ئەوەیە ڕەخنە لەو کارە بگیرێت، بە ڕەخنەگرتنی جارێکی دی زیندوو دەبێتەوە. واتە کارەکانی ئەفلاتوون، کە داهێنەرانەیە، گەر فەیلەسووفێکی ئەم دەمە ڕەخنە لە دەقەکانی بگرێت، جارێکی دی باسی ئەفلاتوون‌و دەقەکانی دەکاتەوە، ئەمەش جۆرێکە لە زیندوو ڕاگرتن، نەك ئەو کارە، کە نەمربووە بەدرێژایی مێژوو بەرەخنەکانی بمرێنێ.

لە ڕوویەکی دییەوە نەمری دەکرێ بەشێوەیەك دەستنیشان بکەین، چۆن لە تێڕوانینی دینیدا، گیان‌و ڕۆح نەمرە، ئەواش دەکرێ، ڕۆحی کار، لە دەقدا دەستنیشانکرێت، کە نەمری دەدات بەدەقێك یان تابلۆیەك...من

پێموایە ئەو دەقانەی، کە چەند ڕەگەزێ لە خۆدەگرن، کە زیاتر بوونی مرۆڤو ڕۆحی بەرجەستە دەکەن‌و پەیوەستن بەخودی مرۆڤـەوەو هەمـەکین، دەشـێ لـە زۆر بـاردا نـەمری بەدەسـتبێنن، ئـەم نەمرییـەش دەشـێ پەیوەسـتی بکەینـەوە بـە ڕۆحـی مـرۆڤ خۆیـەوە، چـونکە ئـەوە لـە بـوونی مرۆڤـەوە دەردەچێت[٢١]، ئـەو تابلۆیـە یـان ئـەو دەقـە بەشـێکی دانـەبڕاوە لـە بـوونی داهێنەرەکـەی. دەشـێ تـا ڕادەیـە بـەزمانێکی میتـافیزیکی ئـەم بۆچـوونە دەربکـەوێت، بـەلاّم زیـاتر سـوود لـەو دیـدە ئایینییـە وەردەگـرم، مـرۆڤ لـە جەستەو ڕۆحە، ڕۆح نەمرە. گەر دەقەکەی ڕۆحی خۆی تیـا ڕوونکردبێتـەوەو بەرجەستەی کردبێ نەمر دەبێ، هاوکـات گـەر مـرۆڤ خـۆی ئـەوەی مامەڵـەی وجودیانە دەکات، دەتوانێـت نـەمری بدات بەکارەکـەی، چـونکە لـە وجـوددا هەموو مرۆڤەکان یەکدەگرنەوە، بەلاّم هەریەکەو بەجۆرو بەرێگایەکی جیاواز. وەك چۆن لە ئاییندا ملیۆنان مرۆڤ لـەنێو مزگـەوت بەدرێـژیو پـانی ڕیزبـوون نوێژ دەکەن، هەریەکەو بەجۆرو شێوەو ڕەگـەزی جیـاواز... پـڕ لـە جیـاوازی بەلاّم گەر سـەیری منـارەی مزگـەوت بکـەیت یـەك خاڵە(ئـەو خاڵـە وجـودە)، هـەموو بەجیاوازیەکانـەوە لەوێـدا یەکدەگرنـەوە، سـەبارەت بـە مامەڵـەی وجودیش هەمان بۆچـوونم هەیـە، ئیـدی مـرۆڤ مـەرج نییـە تـەنیا بڕواداریکـی ئایینی بێت، بـەلاّم گـەر ئۆنتۆلۆژیانـە بڕوانینـە کارەکـان، ئـەو کارانـەی، کـە وجودی خۆمانمان تیا ڕەنگرێژکردووە، هەماهەنگ دێنەوە، واتـە هەماهـەنگی من لەگەڵ کارەکەم، بەلاّم گەر مامەڵەکەم بەو جۆرە نەبوو، ئەوا بێگومان ئەو هەماهەنگییە نابینرێت، خۆم لە ئاوێنـە وجودیەکـەدا نابینمـەوە. گـەر دەقـێ حەقیقەتێکی وجودی تیا بەیانکرێ دەبێ نەمر بێ، دەبێ کەشـفی حەقیقـەت بکـات[٢٢] ئـەوکات دەقەکـە نـەمر دەبـێ. ئـەو دەقانـە حەقیقـەتن لـە ڕۆحو وجودەوە دەردەچن نـەمرن، چـونکە بـەمانا دینییەکـە ڕۆح نـەمرە، هاوکـات

دەرە دینییەکانیش بوون نەمرە. هەر داهێنەرێ بەجۆرێ نەخشەی وجود دەبینێ‌و ڕەنگی دەرێژێ.

هەر سەبارەت بەنەمریش دەتوانین ئەوە بڵێین، کە ئەمجۆرەی نەمری دەشێ تەنیا لەناو زماندا بێت، واتە ئامادەییەکە زمانییە، بەڵام خۆ دەششێ بڵێین ئەوەی نەیەتە ناو زمانەوە واتە مردووە، یان نییە؟. بەڵام باسکردنی بەردەوامی کارو دەقە نەمرەکان زۆرکاتیش دەشێ ڕاهێنراوێکی زمانی بێت‌و توانای بینینی لایەنە نەمرییەکە نەبێت، واتە بەجۆرێ ڕاهاتنێکی زمانییەو بووەتە باو، کە ئەم کارە نەمرە، ئەمەش لە دوو حاڵەتدا زیانمەندە، بەوە زیان بەکارە نەمرەکە دەگەیەنێت، بەوەش کە جۆرە درۆکردنێ لەگەڵ خۆت‌و دەرەوەی خۆتە، کە توانای دیتنی نەمرییەکەت نییەو سامی ئەوە نەکەی ئەوە بێژی. واتە دەشێ نەمرییەکی نارەسەن‌و ساختە بێ و دەشێ بەپێچەوانەوە، بەڵام چۆن دەبێ گەر ڕەسەن بێ یان نارەسەن خۆی دەرنەخات؟ بەبڕوای من پەیوەستە بە توانای دیتن‌و ڕۆح‌و مامەڵەی وجودیانەی ئێمە لەگەڵ دەقەکە، زۆرکات شێواندنێ لە ڕوانینی ئێمەدا دروستدەبێ، بەهۆی زۆر دیتن‌و ڕوانینی کارە نا ڕۆحییەکانەوە. دەنا ناکرێ خۆی بشارێتەوە، دەقی نەمر بۆ مرۆڤی ڕاستبین(ڕوانینی دروست) ڕاستەوخۆ دەردەکەوێت. نەمری‌و قوربانی دوانەیەکی لێکدانەبڕاون لە نێو ئایینەکاندا. بەڵام ئێمە لەم نووسینەدا کەمتر لەسەر ئەم لایەنە وەستاوین، چونکە مەستدەکەم دەکرێ خوێنەر لە کتێبەگەلی زۆر لەم بارەیەوە بخوێنێتەوە.

میکانیزمەکانی گەیشتن بە پلەی نەمری جۆراوجۆرن، دەکرێت مرۆڤ لە ڕێگەی (فیداکاری و شەهادەت، هونەر، نووسین، داهێنان، بنیاتنان، پرۆژەی خزمەتگوزاری و کاری خۆبەخشی و ...تاد) بگاتە پلەی نەمری، چونکە هەموو ئەمانە خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکەن، ئەمەش گەوهەری نەمرییە[٢٣].

ئەگەر لە مردندا جەستە فەنا بێت و لە ناوبچێت، ئەوا بەرهەمی فیکر و داهێنان و پرۆژە مرۆییەکان شوێن پێی جەستە هەڵناگرن و وەك

ئەلتەرناتیڤێك بۆ ڕۆح و جەستە و هزری خاوەنەکانیان دەمێننەوە، بەدیوێکی تردا شوناسی مەعنەوی ئینسانەکان نەمر دەبێت.

ئەوەش بڵێم ئەو مرۆڤانەی لە ڕۆحی خۆیان دەبەخشن بە کارەکانیان، واتە مرۆڤە داهێنەرەکان چاوەڕوانیان لەوە نییە وەك نەمر دەربکەون، چارلی چاپلن لە نامەیەکی بۆ کچەکەیدا جوان وەسفی ئەمە دەکاتو دەڵێت "جوان نییە مرۆڤ پێش مردنی هیچی لەسەر بگوترێت".ئەم قسەیە زۆر هەڵدەگرێت، مەبەستی زۆر لەپشتییەوەیە، مرۆڤ بە زیندوویەتی باسبکرێت یان باسنەکرێت! زۆرکات گلەیی ئەوە دەکرێت مرۆڤە داهێنەرەکان لە ژیاندا نرخی کارەکانی خۆیان نابیننەوە، تا نەمرن نرخیان نازانرێت، بەڵام لە کەسێکی وەك چارلی داهێنەرەوە ئەم قسەیە دەبیستین، وەك بڵێیت بیەوێت بڵێت ئەم باسکردنەیان گرفتارە بە وەستان، هاوکات ئەم مرۆڤانە جۆرە ئیحراجبوونێکە. ڕەنگە مرۆڤەکان خۆیان ئەوەندە هۆشیاربن کە مرۆڤ بە مردنی زیاتر نرخی هەیە تا لە ژیاندا بێت، گەر وردبینەوە ئەمە باش سەرنج دەدەین(بە تایبەت لە ڕۆژهەلات). ئەوەی مرۆڤ لە ژیاندا بەهای نەزانریێو بە مردنی نرخی بزانرێت هەم گرفتی هەیە هەم سوودی هەیە.

٦: کێ هەیە، لەبەر خۆشەویستی مردن، خۆی بمرێ:

ئەم جۆرەی مردن گەلێك تایبەتو دەگمەنە، ناشتوانرێت بە وردی دەستنیشانی نموونەیەك بکرێت لەم جۆرە. لەبەرئەوەی مردنی لەم جۆرە بێ مەبەستە یان باشترە بڵێم ئەو مەبەستەیە، کە مەبەستەکەی لەخۆدایە.

واتە لەبەر هیچ پاڵنەرێك نا تەنیا پاڵنەری مەرگ خۆی، واتە بۆ ئەوەی بزانم مردن خۆی چییە بمرم. بە واتایەکی دی وەك پەبوولەی چوارەم ویستی بزانێت حەقیقەتی ئاگر بزانێت، ئەو کەسەش تەنیا لەبەر حەقیقەتی مردن دەمرێت نەك لەبەر مەبەستێکی تر، گەر مەبەستێکی دی هەبێت ئەوا

حەقیقەتی مردن نادۆزێتەوە، لەبەرئەوەی ئەم مردنە خودییە وە زمانێکیش نییە پاشان بێت و گێڕەرەوەی حەقیقەتەکە بێت.

لێرەشەوە واتای حەقیقەتمان بەواتای مەرگ داناوە لەوەی، کە تەنیا مردن دەتوانێ حەقیقەتمان بۆ کەشف بکات. چونکە گەر کەسێ لەبەر مردن "خودی مردن" خۆی مرد ئەوا وەك ئەوەیە لەبەر حەقیقەت بمرێ، بەلأم ئایا ئەمە مەرگدۆستی نییە، بەوەی کە لەپشت ئەم ژیانەوە حەقیقەت هەیە؟ ئایا دەکرێ خۆکوشتن وەك ئەزموونێ بۆ وەرگرتنی وەلأمێ بێت بەوەی کەبزانین مەرگ چۆنەو چییە؟ گەر خۆکوشتن مەبەستی جگە لە مردنی هەبوو ئەوا لە دەرەوەی ئەم جۆرەی مردنە، گەر خۆکوشتن ڕاکردن و بێزاربوون بێت لەم ژیانە ئەوا لەدەرەوەی ئەم جۆرەی مردنە.

ڕەنگە ئەمجۆرەی مردن بەوەی کە دەگمەنە ڕاستییەکمان بۆ دەربخات، کە زۆرێك لە نووسەران (شاعیرو بیرمەندو ڕۆماننووس...) کە بە بالأی مردندا هەڵدەڵێن، هەمووی مەبەستەکییە، لەبەر خودی مردن نییە، کە مردن جواندەکرێت و خۆشەویستدەکرێت، گەر ژیان نەبووایە مردن جوان نەدەبوو، واتە بەردەوام پاساوی هەیە، کە مردن جوانە یان باشە، لەبەرخودی مردن نییە. ئەو مرۆڤانەی نیگای مردن دەکەن وەك دۆستێك دۆستەکانی دیبان لێ زویر بووە بۆیە دێنە لای مردن، گەر دۆستێکی دی هەبوایە بێگومان لە دۆستایەتی مردن نەدەگەڕان.

**سەرچاوەکانی بەشی چوارەم:**


١. نەهێشتنو ڕێگری لە خۆکوشتن، ڕێکخراوی WHO ، وەرگێڕانی د.عارف حیتۆ. بەرگی چاپخانەی ماردین- هەولێر، ٢٠١٢.

٢. مارتن هایدیگەر، بوون و کات، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەزگای سەردەم-سلێمانی، ساڵی ٢٠١٣.

٣. رامیار مەحمود، دڵ لەناو سنگی ئەم جیهانەدا لێ نادات، لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی کۆنسێپت- سلێمانی، ساڵی چاپ ٢٠١٢.

٤. مجله خورشید روانشناسی، شمارەهای ٤،١، ١٣٧٢، شیراز .

٥. شۆپنهاوەر، لەبارەی خۆکوشتنەوە - لەئینگلیزییەوە شۆرش حەمە ساڵح. لە سایتی دەنگەکان.

٦. وەلید عومەر، خۆکوشتن، ڕۆژنامەی چاودێر. ٢٠١٣.

٧. سەرچاوەی پێشوو.

٨. سەرچاوەی پێشوو.

٩. وەهمو شوناس، تەوەری نووسەرو خۆکوشتن، گفتوگۆ لەگەڵ یووسف عیزەدین. چاپخانەی یاد، ساڵی ٢٠١٢. لا ٢٥٦.

١٠. یووسف عیزەدین، وەهمو شوناس(گفتوگۆو وتار)، چاپخانەی یاد، ساڵی ٢٠١٢. لا ٣١٥.

١١. حەمەسەعید حەسەن، مەرگ بانگمان دەکات لە سایتی دەنگەکان وەرگیراوە.

١٢. جەمال غەمبار سەرجەمی بەرهەمەکانی، لە کتێبخانەی غەزەلنووس بڵاوکراوەتەوە. ٢١٠٢.

١٣. حەمەسەعید حەسەن.

١٤. حەمەسەعید حەسەن.

١٥. مجله خورشید روانشناسی، شمارەهای ٤،١، ١٣٧٢، شیراز .

١٦. دیدار لەگەل دکتۆر محەمەد کەمال، هەرێم عوسمان، مەلەفیکی تایبەت لەبارەی محەمەد کەمال، لە ڕۆژنامەی چاودێر.

١٧. هایدیگەر، بوونو کات. لا ٣٣١-٣٣٢ .

١٨. نەهێشتنو ڕێگری لە خۆکوشتن، ڕێکخراوی WHO ، وەرگێڕانی د.عارف حیتۆ.چاپخانەی ماردین- هەولێر، ٢٠١٢. لا ٧.

١٩. گابریل گارسیا مارکیز، دەریاوانە خنکاوەکە، وەرگێڕانی، نامیلکەی دەزگای سەردەم.

٢٠. ئیسماعیل حەمە ئەمین، لەنێوان مردن و ونبووندا، لە یادی مەرگی عوسمان شەیدای شاعیردا. لە سایتی دەنگەکان.
٢١. پێشرەو عەبدوڵڵا، گوتارەکانی ڕێگا، دەزگای ئاراس- هەولێر،ساڵی ٢٠١٢.
٢٢. مارتن هایدیگەر، میتافیزیک چییە، وەرگێڕانی، د. حەمید عەزیز، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاویەر، ساڵی ٢٠١٢.
٢٣. سامان سیوەیلی، درەختی ڕۆشنبیری، لە سایتی دەنگەکان وەرگیراوە.

# ئەنجام

لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەماندا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە، کە دەشێ چەندین ئەنجامی تری لێدەربهێنرێت، چونکە لێکۆڵینەوەیەکی شیکارییبووە پێشتر لێکۆڵینەوەی لەمجۆرە لەزمانی کوردیدا نەکراوە. بەلام جەوهەری ئەنجامەکان ئەمانەن.

١/ واتای مردن خۆی لە خۆیدا جیاوازە، لە واتای مردن بۆ مرۆڤ.

٢/ مرۆڤ ناتوانێت بەڕەهایی مردن بناسێت، بەڵکو هەندێك خەسڵەتی دەناسێت. بەواتا مرۆڤ (مردن چییە؟) ناناسێت کەمدەسەلاتە لەمبارەیەوە، بەلام دەتوانێت لەڕێگەی مردنی خۆیەوە پەی بەمردن بەرێت، واتە جیاوازی هەیە لەنێوان مردن خۆی چییە لەگەڵ مردن بۆ مرۆڤ چییە.

٣/ بیرکردنەوەی مرۆڤی کورد سەبارەت بەمردن، تەنیا لەلایەنی ئایینییەوە(ئاییینی ئیسلام) سەرچاوەی نەگرتووە، هەندێ دەربڕاومان هەیە کە گوزارشت لە بێباوەڕی(بەمانا ئایینییەکەی–ئاییینی ئیسلام)دەکات.

٤/لەنێوان "مردن/ مەرگ"دا لەزمانی کوردیدا مردن بەکارهێنانی زیاترەو ڕۆژانەییترە، بەواتا لای کورد بەگشتی مردن بەکاردەهێنرێت تا مەرگ. جگەلەوەی مردن ناوەو بەبرشترە بۆ سازکردنی وشە، بەبەراورد بەمەرگ، کە مەرگ زیاتر وەك زاراوە بەکاردێت.

٥/لەزۆر دەربڕاودا جیاوازی نێوان مردنو کوشتن پشتگوێخراوە، لەزۆرینەی نزاکاندا کوشتن بەکاردێت(خوا بتکوژێت). هاوکات سوودێکی زۆر وەرگیراوە لە وشەی کوشتن تا بۆ کوژانەوەی شتەکان(ئەمێرەکان) بەکاریبێنێت (رادیۆ کوژانەوە–سەلاجە کوژانەوە–لاستیکی خەت کوژانەوە...).

٦/ بایەخدانێکی زۆر هەیە بەوەی (مردن لەپێناو چیدا)، واتە چۆنییەتی مردن بۆ مرۆڤی کورد گرنگە، دەیەوێت مردنەکەشی بەهای هەبێت، یان مانادار بێت. یاخود دەیەوێت سەربەرزانە بمرێت.

٧/ مرۆڤی کورد بەکاریگەری ئایین، یاخود خۆ پیرۆزکردنو خۆ جوداکردنەوە لەبوونەوەرەکانی تر "مردن"ی بۆ خۆی داناوە، بۆ بوونەوەرەکانی تر وشەی تر هەن.

٨/ وشەی مردن بەکارهێنانێکی زۆری هەیە، تەنانەت بۆ بەدەر لەمرۆڤیش بەکاردێت (پاتریەکە مردووە- چەسپەکە مردووە- سەیارە مراندن). جگەلەوەی بۆ ناوی شوێنیش بەکارهاتووە(مەرگە). هەروەك وەك ناوی پیشە(مردووشۆر). هاوکات لەرووی زمانەوانیشەوە وەك بەکارهێنانێکی زۆری هەیە لەشێوە جیاوازەکان، جگەلە وشەو فرێزو ڕستەکاندا، وەك ئیدیەمو میتافۆڕ... بەکاردەهێنرێت.

٩/ مرۆڤی کورد هەوڵیداوە لەڕێگەی شتەکانی ترەوە ئەزموونی مردن بکات. یاخود هەندێ ئاکار هەیە کردنی سزاکەی لەمردن گرانترە(هەموو دەقەیەکی مردنە).

١٠/ مرۆڤی کورد پێش مردنی باس لەمردنی خۆی دەکات، ئەمەش زیاتر لەڕێگەی خەسڵەتەکانی مردنەوە.

١١/لەو نموونەگەلەی کە هێناومانەتەوە کەمتر مردن وەك دیاردەیەکی خودی بەمانا فەلسەفییەکەی بەکارهاتووە، واتە بیرکردنەوەمان بۆ مردن کەمتر فەلسەفییە بەمانا هایدیگەریەکەی.

١٢/مرۆڤی کورد مردن بەکاردەهێنێت بۆ زۆر مەبەست، وەك ئامۆژگاری، هەڕەشە، تانەدان، نازکردن، گاڵتەپێکردنو گاڵتەوگەپ... واتە مردن بۆ هەندێك بووەتە چەکێك.

١٣/ مردن بووەتە ژمارە، بەهۆی ئەم بوون بەژمارەییەوە هەستی مرۆڤەکان بەرانبەر بەمردووەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە. هاوکات مردن وەك زانیاری بەکاردێت کاتێك لە کتێبەکاندا بەکاردێن. یاخود دەشێ مردن وەك ڕەمز بەکاربێت ببێتە هۆی فرە لێکدانەوەی (پاشخۆی کتێبەکەی بڵاوکرایەوە).

١٤/ مردن خۆی نهێنی ئامێزە هاوکات نهێنی پارێزیشە.

١٥/ ئەوەی پێی دەوترێت مردووپەرستی، مێژوویەکی هەیە، تا ئێستا بەردەوامە بەڵام بەشێوەی جیاواز مردووپەرستی هەیە(گەر لەسەردەمی کۆندا بەهۆی ترس لەمردووەکە هۆکار بووبێت). ئەوا ئێستا زۆر هۆکاری تری هەیە و تەنیا لەسەر ئاستی سیاسی نییە بەڵکو لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیو ئایینی، دەروونی...، ئەم دیاردەی مردووپەرستییە وەك ڕەخنەیەك لەزۆر کاتدا وەك ڕەخنە لەلایەن چینی خوێندەوارانەوە ئاراستەی دەسەڵات دەکرێت.

١٦/ مرۆڤی کورد چەندین خەسڵەتی بۆ مردنو مردنی خۆی داناوە، دیارە ئەمەش دنیابینی ئەم مرۆڤە نیشاندەدات. بۆ نموونە.(خێرایی مردن- جیاوازینەکردنی مردن- بێدەنگی- ترس...) هاوکات پەیوەندییەکی گیانی بەگیانی لەنێوان مردنو کاتدا هەیە. لەزۆرێك لە دەربڕاوەکاندا مردنو کات پێکەوەهاتوون(جوانە مەرگ- ڕۆژی تەواوبوو...).

١٧/ هاووبەشییەکی زۆر هەیە لەواتای مردن لەنێوان فەرهەنگە جیاوازەکاندا.

١٨/ بەکاریگەری ئایین یان وەك ویستێکی مرۆڤ، وەسیەتکردن پێش مردن دەکرێتو زیندووەکانیش پابەندی دەبن واتە، هاوکات جۆری وەسیەتەکانیش جیاوازن. لەلایەکی ترەوە مرۆڤی کوردیش بەگشتی لەم ژیانەدا جگە لەلایەنی ئایین، لەم ژیانە کار بۆ پاش مردنی دەکات.

١٩/ مردن دەسەڵاتدارە لەبەرانبەر مرۆڤدا، لەبەرەئەوەی ئەو دەسەڵاتی زانینی هەیە، کە پاش مردن چیدەبێت؟ هاوکات مردن بێدەنگیشەو زانین دەشارێتەوە، بەمەش جارێکی دی دەسەڵاتەکەی دووپاتدەکاتەوە، جگەلەوەی مرۆڤ بێتوانایە لە ڕەدکردنی مەرگدا(واتە مەرگ لە نێوان گەمەی زانینو دەسەڵاتدایە- کە ئەمەش دەکرێت خوێندنەوەی فۆکۆیانەی بۆ بکرێت).

٢٠/ خۆکوشتنی ئاگاییانە(مردنی خۆویستانەی بە ئاگا) ڕووبەڕوو وەستانەوەیەکی ئاراستەوخۆی گشت ئاینو دابەکۆمەڵایەتییەکانە، مردنێکی

تایبەتـــەو کەســـانی هۆشمەنـــد ئـــەنجامی دەدەن (هەمیشـــەش زیـــاد لـــە پاساوێکیان هەیە).

٢١/ مرۆڤگەلی زۆر هەن لە مردن ڕادەکەن‌و ناشیانەوێت هەر بە بیریاندا بێت، تواونەتـەوە لـە نێـو ژیـانێکی ماددییـدا، کـە ئـەم مرۆڤانـە مردنیـان لـە یادکردووە بە جۆرێ ژیانیشیان بە شێوە لەبارو دروستەکەی لـە یـادکردووە. لەبەرئەوە ئەم مرۆڤانە بەخۆویستی‌و بـە ئاگاییـەکی بێئاگاییـەوەو لـە مـردن ڕادەکەن، بەڵام ناتوانن، ئەوەش پاشان جۆرە ڕسوابوونێکە لە دیـدی مرۆڤـە زیندووەکانەوە.

٢٢/ خۆکوشـتنی خۆنەویسـتانە جـۆرێکی دییـە، کـە بـێ جیهـانبینی کەسەکە کۆتایی بە خـۆی دێنێـت، لەبەرئـەوەی بەرگـەی ژیـانی پـڕ لـە تانـە ناگرێـت، یـەك مردنـی پـێ باشـترە لـە زۆر مـردن، ئاگـایی ئـەم مرۆڤانـە لـە کۆزانیـــاری کولتـــووری ناترازێـــت، خۆکوشتنەکەشـــیان ڕاکردنـــە لـــە بەرپرسیاریەت، خودی نییە خۆدزینەوەیە.

٢٣/ مردنی لەبەر مردن، گەلێ تایبەتەو ئەو مرۆڤانە دەگمەنن بێ پاساو تەنیا لەبەر مردن خۆی بمرن! ئەمەش ئەوە دەردەخـات مـردن خۆشەویسـت نییە، ئەوەشی مردن خۆشەویست دەکات لەبەر خودی مـردن نییـە، شـتێکی دی زویری کردووە بۆیە مردن دەلاوێنێتەوە.

## سەرچاوەکان

**کتێبە کوردییەکان:**


١/ ئـازاد حەمـە، فەلسـەفەی فینۆمینۆلـۆژی یـان پاتۆچـکە، چـاپی یەکـەم، چـاپخانەی چوارچرا-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٠.

٢/ ئاڤێستا کەمال مەحموود، پراگماتیکی ڕستەی پرسـیارو فـەرمان لـەزمانی کوردیـدا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٣/ ئان دی غراف، چیرۆکی هەڵبژاردە لە کتێبی پـیرۆز. جمعیـە الکتـاب المقدس، سـاڵی ٢٠٠٩.

٤/ ئەرخەوان محەمەد عوبەید، ڕەمز و نووسینی سەر گۆڕەکان- چاپی یەکەم، دەزگـای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریان-هەولێر، ساڵی ٢٠٠٨.

٥/ ئەنسـتاس مـاری کەرمـەلی.و، د.نـەجات عەبـدوڵلا. کتـێبی پـیرۆزی ئیزیدییـەکان (جیلوەومەسحەفا ڕەش) دەزگای ئاراس-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٢.

٦/ ئـەفلاتوون، و.عیمـران هـاواری، سـەرجەم بەرهەمـەکانی ئەفلاتوون،چـاپی یەکـەم، بەرگی یەکەم، چاپوپەخشی ڕێنما-سلێمانی،ساڵی٢٠١١.

٧/ ئـەفلاتوون، و.عیمـران هـاواری، سـەرجەم بەرهەمـەکانی ئەفلاتوون،چـاپی یەکـەم، بەرگی دووەم،چاپوپەخشی ڕێنما-سلێمانی،ساڵی٢٠١١.

٨/ ئەبوبەکر کاروانی، فەرهەنگی کـاروانی هاوچـەرخ فارسـی-کـوردی، چـاپی چـوارەم، چاپخانەی چوارچرا، ساڵی ٢٠٠٧.

٩/ ئەلبێر کامۆ، و.سامان عەلی حامید. گیلۆتین، چاپی یەکـەم، بەڕێوەبەرایـەتی چاپو بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ساڵی ٢٠١١.

١٠/بورهان محەمـەد ئـەمین. تەفسـیری ئاسـان بـۆ تێگەیشـتنی قورئـان. بڵاوکراوەکـانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر-سلێمانی-هەولێر. چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٤.

١١/ بـەختیار عـەلی، چـێژی مەرگدۆسـتی، چـاپی یەکـەم، بـەرگی یەکـەم، کتێبخانـەی ئەندێشە بۆ چاپوبڵاوکردنەوە-سلێمانی، ساڵی ٢٠١١.

١٢/بهاگاڤاد گیتا، سرروودەکانی خوا هاوبیر کامەران. دەزگای سەردەم-سلێمانی، سـاڵی ٢٠١٢.

١٣/ پەروین عوسمان مستەفا عـەللاف، واتـاو وەرگێـران، لێکۆڵینەوەیـەکی واتاسـازییە، دەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.

١٤/پیتەر سلۆتەردایك، و. بەكر عەلی. دیریدای میسری، سەبارە بەگرفتی قووچەكە جولەكەییەكان، بڵاوكراوەكانی ڕێكخراوی كۆنسێپت– سلێمانی، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٢.
١٥/تەها وەهاب، بەراوردێك لەنێوان قوئانو زانستدا، چاپخانەی ئاوێنە–سلێمانی چاپی یەكەم، ٢٠٠٩.
١٦/دانیاڵ ل.پالس، و.ئاوات ئەحمەد، لەبڵاوكراوەكانی گۆڤاری ڕۆشنگەری بۆ لێكۆڵینەوەی فكریوسیاسی–سلێمانی.چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٧.
١٧/ دانیال هیرڤیۆ لیژێ/ ژان پۆل ویلیەم/ ئیروان دیانتەل/ میشێل لووی، وەرگێرانو لێكدانەوەی عادل باخەوان، ئایین چییە؟ دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەكەم.ساڵی٢٠٠٨.
١٨/د.محەمەد كەمال.نیهلیزمو ڕەهەندەكانی بیركردنەوە، دەزگای سەردەم–سلێمانی. چاپی یەكەم، ساڵی،٢٠٠٥.
١٩/د.نەبیل عەبدوالحەمید عەبدولجەبار، و.هاوار محەمەد ڕەشید، فەلسەفە بۆ ئەو كەسەی دەیەوێت، دەزگای چاپوبڵاوكردنەوەی ڕۆژهەلات–هەولێر، چاپی یەكەم،ساڵی٢٠١٠
٢٠/ د.محەمەد كەمال، بوون و داهێنان،دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٤.
٢١/ د.محەمەد كەمال، فەلسەفەی ئەفلاتوون، دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەكەم،ساڵی ٢٠١٠.
٢٢/ د.حەمید عەزیز، فەلسەفەی سەردەمی ڕۆمانتیكی، پرۆژەی هاوبەشی بەشی فەلسەفەی زانكۆی سەلاحەدینودەزگای موكریان–هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٠
٢٣/ د.محەمەد كەمال، هایدیگەرو شۆڕشێكی فەلسەفی، دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٧
٢٤/ د.نوری جەعفەر،و. سابیر بۆكانی، سروشتی پەرەسەندنی هزر، خانەی وەرگێڕان–سلێمانی، چاپی یەكەم.(ساڵی چاپی تیا نیە).
٢٥/ د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی وشەو ڕستە، چاپخانەی ڕۆژهەلات–هەولێر، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٠

٢٦/ د.عەبدولواحید موشیر دزەیی، کاریگەری دەروونی لەبواری ڕاگەیاندندا- لێکۆڵینەوەیەکی سیمانتیکی و پراگماتیکییە، دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم- هەولێر،ساڵی ٢٠٠٩.
٢٧/ د.عبدولواحید موشیر دزەیی، واتاسازی، چەند لێکۆڵینەوەیەکی سمانتیکیو پراگماتیکییە، دەزگای موکریان-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩
٢٨/ د. محەمەدی مەحوی، زانستی هێما، هێما، واتاو واتا لێکدانەوە، بەرگی یەکەم- چاپخانەی پەیوەند-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.
٢٩/ د.محەمەد مەحوی، ئاوەزداریىو ڕێزمانی ناوەڕۆك-وابەستە، وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی-زانکۆی سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٦.
٣٠/د.عەبدولواحید موشیر دزەیی ، زانستی پراگماتیك، چاپخانەی پاك-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی، ٢٠١٠.
٣١/د.فاروق عومەر سدیق، لەدایکبوونی وشە ، چاپخانەی شڤان- سلێمانی.چاپی یەکەم- ساڵی ٢٠١١.
٣٢/ د.نەسرین فەخری، یاری لەکوردەواریدا، پێکهاتنی لەرووی زمانەوەو کاری بۆ سەر کۆمەڵ، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، دەزگای سەردەم-سلێمانی ٢٠٠٩.
٣٣/ سلێمان مەزهەر،و.لوقمان حاجی قادر، چیرۆکی ئایینەکان، دەزگای سەردەم- سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٨.
٣٤/ سیروان ئەحمەد سەعید، دەروازەیەك بۆ فەلسەفە(کلاسیك)،بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان-سلێمانی،چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.
٣٥/ سەعید سلێمانی، دەرکەوتەی دڵخوازی مەرگ، بەڕێوەبەرێتی چاپو بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠١١
٣٦/ سەلام ناوخۆش، نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، زمانەوانی-بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، چاپخانەی منارە-هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.
٣٧/ شیلان عومەر حسەین، ئیدیۆم چەشنو پێکهاتنی لەزمانی کوردیدا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی-سلێمانی، چاپی یەکەم.٢٠٠٩.
٣٨/فاروق ڕەفیق، فەلسەفەو ژیان، لەبڵاوکراوەکانی خانەی حیکمەت بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.
٣٩/فاروق ڕەفیق، وێستگەیەك لەگەشتێکی فەلسەفی،ئەندێشە بۆ چاپوبڵاوکردنەوەی کتێب-سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠١١.

٤٠/عەلی باپیر، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنای قورئان و سونەتدا، چاپی یەکەم، نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەوراگەیاندن–هەولێر، ساڵی ٢٠٠٦.
٤١/ عەبدولخالق سەرسام، گۆڕ دەخمەکانی میدیاو زەردەشتییانو ڕێورەسمی مردوو سپاردن بە شاخ.دەزگای ئاراس–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.
٤٢/عبدالکریم سروش، و. موسعەب ئەدهەم زەڵمی، چیەتی مەرگ!؟، خانەی چاپوپەخشی سایە–سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠٠٩.
٤٣/ عەبدولرەحمان حەمە چاوش، بۆماوەزانی مرۆڤ، چاپخانەی ڕەنج –سلێمانی،چاپی یەکەم. ساڵی ١٩٩٨.
٤٤/ عەتا محمەد، زارەکانی خەون، چاپخانەی ڕەنج–سلێمانی– ساڵی ٢٠٠٢.
٤٥/ حەمید عەزیز، سەرەتایەك لەفەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، چاپخانەی شڤان–سلێمانی چاپی دووەم، ساڵی٢٠٠٥.
٤٦/حەمید زەنان، و.کامیل محەمەد قەرەداغی، مانەوتوورەیی، خانەی وەرگێران–سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی،٢٠١٠.
٤٧/ هاوبیر کامەران، زانستو فەلسەفە ڤیداییەکان،دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەکەم،ساڵی٢٠٠٩.
٤٨/ کلۆدجیرمان، ریمۆن لۆبلان، و.د. یووسف شەریف سەعید، واتاسازی، دەزگای موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی٢٠٠٦
٤٩/کریشیانا مۆرتی، و. یاسین عومەر، مرۆڤ ئازادی خۆی فرۆشتووە، دەزگای سەردەم–سلێمانی ساڵی ٢٠٠٤.
٥٠/جەلال مەحموود عەلی، ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم،دەزگای سەردەم–سلێمانی، ساڵی ٢٠٠١.
٥١/ یوری کراسنی–و،غەریب پشدەری– ئەفسانەکانی خۆرهەڵات، دەزگای ئاراس–هەولێر،چاپی یەکەم ساڵی.٢٠٠١.
٥٢/ مەولوود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمرییدا، دەزگای ئاراس–هەولێر، چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠٠٢.
٥٣/ مەولوود ئیبراهیم حەسەن، پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی،چاپخانەی ڕەنج–سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی ٢٠٠٧.
٥٤/میهرادمیهرین، و.هونەر عەبدوڵڵا، جیهانبینی شۆپنهاوەر،دەزگای سەردەم–سلێمانی، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٥٥/ ڕەحیم سابیر، ڤاتا (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی–فەلسەفی–ئایینیە، لەبارەی ڕۆح، نەفس، بەدەن)، لەسلێمانی چاپکراوە، ساڵی ٢٠١٢.
٥٦/ ڕێبین ڕەسووڵ ئیسماعیل–دیار عەزیز شەریف. ئەنترۆپۆلۆژیا، دەزگای چاپوپەخشی ڕێبین.چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٤.
٥٧/ڕێبوار سیوەیلی، سۆفستاییەکان، چاپی دووەم، دەزگای موکریان–هەولێر، ساڵی ٢٠١١.
٥٨/ ڕینیە دێکارت، و. د.حەمید عەزیز، چەند وردبوونەوەیەك لەبارەی میتافیزیکاوە. چاپی یەکەم، خانەی وەرگێران– سلێمانی. ساڵی ٢٠٠٥.
٥٩/ ویل دورانت.و.عەبدوڵلا ڕەسوولی، مێژووی شارستانیەت–بەرگی یەکەم.خانەی چاپوبلاوکردنەوەی چوارچرا–سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی.٢٠١١.
٦٠/ ویل دورانت.و.عەبدوڵلا ڕەسوولی، مێژووی شارستانیەت–بەرگی دووەم.خانەی چاپوبلاوکردنەوەی چوارچرا–سلێمانی، چاپی یەکەم.ساڵی.٢٠١١.
٦١/ ویڵ دیورانت، و.تاریق کارێزی، سەربردەی فەلسەفە، بەرگی یەکەم، دەزگای موکریان–هەولێر،چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٧.
٦٢. نەهێشتن و ڕێگری لە خۆکوشتن، ڕێکخراوی WHO ،وەرگێڕانی د.عارف حیتۆ. بەرگی چاپخانەی ماردین– هەولێر، ٢٠١٢.
٦٣. مارتن هایدیگەر، بوون و کات، وەرگێڕانی د. محەمەد کەمال، دەزگای سەردەم–سلێمانی، ساڵی ٢٠١٣.
٦٤. رامیار مەحموود، دڵ لەناو سنگی ئەم جیهانەدا لێ نادات، لە بلاوکراوەکانی ڕێکخراوی کۆنسێپت– سلێمانی، ساڵی چاپ ٢٠١٢.
٦٥. وەهمو شوناس، تەوەری نووسەرو خۆکوشتن، گفتوگۆ لەگەڵ، یووسف عیزەدین. چاپخانەی یاد، ساڵی ٢٠١٢. لا ٢٥٦.
٦٦. جەمال غەمبار سەرجەمی بەرهەمەکانی، لە کتێبخانەی غەزەلنووس بلاوکراوەتەوە. ٢١٠٢.
٦٧. گابریل گارسیا مارکیز، دەریاوانە خنکاوەکە، وەرگێڕانی، ناملیکەی دەزگای سەردەم.
٦٨. پێشڕەو عەبدوڵلا، گوتارەکانی ڕێگا، دەزگای ئاراس– هەولێر، ساڵی ٢٠١٢.
٦٩. مارتن هایدیگەر، میتافیزیك چییە، وەرگێڕانی، د. حەمید عەزیز، لە بلاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاویەر، ساڵی ٢٠١٢.
٧٠. ژان پۆل سارتەر، بوون و نەبوون. و.د.محەمەد کەمال. دەزگای سەردەم– ٢٠١١.

**نامەی ئاکادیمی:**

١/ فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییەسیمانتیکییەکان و هەندێك دیاردەی واتایی لەزمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر/سلێمانی ٢٠١٠.

**فەرهەنگەکان:**

١/ ئەمین گەردیلانی، فەرهەنگی ڕێژنە(ئەو وشانەی لە لەهەنبانەبۆرینەدا نەهاتوون) کوردی–کوردی–فارسی، دەزگای موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٢/ ئەبوبەکر کاروانی، فەرهەنگی کاروانی هاوچەرخ فارسی–کوردی، چاپی چوارەم، چاپخانەی چوارچرا، ساڵی ٢٠٠٧.

٣/عەبدولوەهاب شێخانی، فەرهەنگی شێخانی. کوردی/کوردی، دەزگای موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٤/عەلی نانەوازادە، فەرهەنگی هەرمان. کوردی/کوردی، بەرگی دووەم پ–ت، دەزگای موکریان–هەولێر، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٥.

٥/ هەژار، هەنبانە بۆرینە. فەرهەنگی کوردی/فارسی، لەئێران چاپکراوە(کتابخانە ملی ایران)چاپی شەشەم، ساڵی ١٣٨٨.

٦/ موحسین ڕازی، وشە گوڵینەکانی ئاویەر–گل واژەهای أبیدر،چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس–هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩.

٧/فرهنگ دانشگاه کردستان فارسی–کردی(جیبی) به سرپرستی ماجد مردوخ روحانی، چاپ اول، بهار ١٣٩٠.

٨/فرهنگ بزرگ سخن، به سرپرستی دکتر حسن انوری، چاپ چهارم، ١٣٨٦، جلد هفتم.

٩/قاموس المعانی، عەرەبی بە عەرەبی، لە سایتی www.almaany.com

١٠/ p ٩٩٣

Oxford Advanced Learner's Dictionary: Edited by, Sally Wehmeier, Oxford University Press, Seven Edition, New York & London ٢٠٠٨.

**ڕۆژنامەو گۆڤارەکان:**

١/ بێریوان نەوزاد سەعید، مردن لە ڕەنگدانی شێرکۆ بێکەسدا، گۆڤاری خامە، وەرزە گۆڤارێکی ئەکادیمی زانستی قوتابیانەیە، ژ. ٥ ساڵی ٢٠٠٧.

٢/ تارق جمباز، سەرقەڵەمانەی مەرگو مردن لە کوردەواریدا، ژ. ١. ساڵی ١٩٩٠، ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان بەزمانی کوردیو عەرەبی لەهەولێر دەریدەکات،کەتایبەتە بە کاروانی فۆلکلۆر(پاشکۆی گۆڤاری کاروانە).
٣/مێرسیا ئەلیاد، و. محەمەد حوسێن، گۆڤاری سەردەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم–سلێمانی، ژ.(٤٧–٤٨)ساڵی ٢٠٠٦.
٤/ مەریوان وریا قانع، قانعو وەسیەت، گۆڤاری سەردەمی ڕەخنە–دەزگای سەردەم–سلێمانی، ژ.٢، ساڵی ٢٠٠٥.
٥/د.حەمید عەزیز، باسی ئەو هاوڕێیانەی دەکات کە ئێستا مردون دەڵێت شادرەوان. لە دیدارێکدا لە ڕەخنەی چاودێر بڵاوبووەتەوە لە ژمارە. ٢٤٤– ٢٥٠. ژ.لا. ٥.
٦/مەریوان وریا قانع، ڕۆژنامەی ئاوێنە، ستون بەناوی"ئەودیو شتەکان"، ژ.٧٤، لاپەرە ٢. ٤/٨/ ٢٠١٠.
٧/حەسەن هەمزە، بنەچەی جۆرەکان،وەڵامێك بۆ ئومێد قەرەداخی، ڕۆژنامەی چاودێر. روانگەو ڕەخنە ژ، ١٠٤.
٨/حەسەن هەمزە، ئا.هەرێم عوسمان، کاکێشان، پاشکۆیەکە لەگەڵ کوردستانی نوێدا دەردەچێت، هەموو چوارشەمەیەك.ژ.٥٧٦١، ساڵی ٢٠١٢
٩/ سەردار عەزیز، پایزو مەرگ، ڕۆژنامەی ئاوێنە، ستون بەناوی"ئێرەو ئەوێ"، ژ ،-٠٦-١٢-٢٠١١
١٠/ وەلید عومەر، خۆکوشتن، ڕۆژنامەی چاودێر. ٢٠١٣.
١١/ دیدار لەگەل دکتۆر محەمەد کەمال، هەرێم عوسمان، مەلەفیکی تایبەت لەبارەی محەمەد کەمال، لە ڕۆژنامەی چاودێر.

### پێگەی ئەلیکترۆنی (ماڵپەڕەکان):

١/. نەجات حامید ئەحمەد، سایتی ماڵێك لە ئاسمان.www.hemin.dk/mla
٢/ قاموس المعاني، عەرەبی بە عەرەبی، لە سایتی www.almaany.com
٣/ د. کەمال میراودەلی، فەلسەفەی ئازادی، بەشی شەشەم، سایتی دەنگەکان.www.dengakan.info
٤/ شۆپنهاوەر، لەبارەی خۆکوشتنەوە – لەئینگلیزییەوە شۆڕش حەمە ساڵح. لە سایتی دەنگەکان.

٥/ حەمەسەعید حەسەن، مەرگ بانگمان دەکات لە سایتی دەنگەکان وەرگیراوە.
٦/ سامان سیوەیلی، درەختی ڕۆشنبیری، لە سایتی دەنگەکان وەرگیراوە.

**سەرچاوە عەربیو فارسییەکان:**

**عەرەبی:**

١/ وليم رِ. كلارك، ترجمة، تيسير حسون، الجنس ومنابع الموت، دار الكلمة للنشر و التوزيع، سورية–دمشق، الطبع الأولي. سنة ٢٠٠٠.

**فارسی:**

١/ محمد صنعتى، مجلة ارغنون، مرگ در انديشة غرب، شمارة ١٧، چاپ سوم، ١٣٨٤
٢/ شوبنهاور، جهان به مثابه اراده و بازنمود، نشر نى، ١٣٨٢، عبدالكريم رشيديان.
٣/ فرهنط خردنامه (ماهنامەی فرەنگی همشهرى)، شمارەی ٤، تیر ١٣٨٥
٤/ سارتر كه مى نوشت، بابك احمدى، نشر مركز، چاپ سوم، ١٣٨٨
٥/عاميانه، نجفى، ١٣٧٦، ص٣٤–٨٩–٧٦. نشر نكاه.
٦/سيد عبدالحميد حيرت سجادي، پندپيشينيان در كردي، جلد اول، چاپ اول، ١٣٦٩، مركز مشر فرهنگ ادبيات كردي.
٧/سيد عبدالحميد حيرت سجادي، پندپيشينيان در كردي، جلد دوم، چاپ اول، ١٣٧٨، مركز مشر فرهنگ ادبيات كردي.
٨ . بەیان سلمان، ڕۆمانی (بوراق)، بە عەرەبی نووسراوە، لە ٢٠٠٨ دا لە خانەی الزمان لە سوریا بڵاوکراوەتەوە.

## ناومرۆك